ئاوارە عەلی



# ئاهی فەلسەفە و نەفرەتی ئایین


له بڵاوكراوەكانی
سەنتەری زەهاوی بۆ لێكۆڵینەوەی فیكریی (٥٨)


ئاهی فەلسەفە و نەفرەتی ئایین

ئاوارە عەلی



**ئەم كتێبە** ڕەخنەگرتن نییە لە پڕەنسیپ و شاكارەكانی ئایین و ئەدای زانا و بانگخوازە ڕاستەقینەكانی هزری ئیسلامی، هەروەک چۆن لەکەدارکردنی کارەکتەرە ڕەسەنەکانی ڕەوتی عەقڵانیەت و ڕۆشنگەری و جیهانی مۆدێرنێتەش نییە، بەڵکو ئاماژەدانە بە چەند دیاردەیەک کە لەنێو کۆمەڵگە ئیسلامییەکان بەگشتی و کۆمەڵگەی کوردی بەتایبەتی بڵاوبوونەتەوە، کە لەمیانەیاندا هەندێک لە کارەکتەرەکانی ئایین کە لە بنەڕەتدا هەڵگری پەیامی ڕاستەقینەی ئایین نین، بۆ بەرژەوەندیی خۆیان ئایینیان بەپێچەوانەی بنەماکانی خۆی بەکارهێناوە و بوونەتە پەڵەیەکی ڕەش هەم بۆ خودی ئایین، هەم بۆ پێگەی زانا و بانگخوازە ڕاستەقینەکان.

به هەمان شێوە، بەشێک لە بانگەشەکارانی ڕەوتی عەقڵانیەت و ڕۆشنگەری، عەقڵ و فەلسەفەیان پێچەوانەی میتۆدی خۆی بەکارهێناوە، بەمەش بوونەتە فاکتەری سەرەکیی لەکەداربوونی عەقڵ و ڕووشانی کەسایەتی و پێگەی بیرمەندە ڕاستەقینەکان.



نرخی (٤٥٠٠) دینارە



ئاوارە عەلی مستەفا

- لەدایکبووی ساڵی ١٩٨٩ـ خەتێ ـ هەولێر.
- بەكالۆریۆس لە زانستە ئیسلامیەكان لە بەشی شەریعە ـ كۆلێژی زانستە ئیسلامییەكان لە زانكۆی سەلاحەددین.
- ماستەر لە فەلسەفەی ئیسلامی.
- خاوەنی چەندین توێژینەوەی زانستییە.
- ئێستا توێژەری یاریدەدەرە لە زانكۆی سەلاحەددین.

## سەنتەری زەهاوی بۆ لێكۆڵینەوەی فیكریی

سەنتەرێكی كوردستانی ناحكومی ناسیاسییە، گرنگیی دەدات بە توێژینەوە و تاوتوێكردنی پرسە هزرییە بنەڕەتییەكان بۆ دووبارە هێنانەگۆی دەق و تێكستە پیرۆزەكان و چۆنیەتی دابەزاندنی چەمكە مەعریفی و بەبایەخەكانی ئیسلام لە بوارە جیاوازەكانی سەردەمدا.

### ئامانجەكانی سەنتەر:

- بوژاندنەوەی بیرو هزر و بەكارخستنی مەعریفەی ئیسلامی لە ناوەندە زانكۆیی و پەروەردەییەكاندا، بە پشتبەستن بە بەهرە و توانا خودییەكانی ئەكادیمیانی كوردستان و جیهانی ئیسلامی و ئەزموونی بیرمەندانی مسوڵمان.
- پەرەپێدان و پەسەندكردنی ڕوانگەی زانستی مەنهەجی لە چارەسەركردنی كێشە و گرفتە هزرییەكاندا و بێلایەنبوون لە پرسە خیلافییەكاندا و خۆبەدوورگرتن لە بڕیاری پێشوەخت و شێوازی سۆزدارانە و هەوڵدان بۆ بابەتیبوون.
- كاراكردنی كەلەپووری دەوڵەمەندی ئیسلامی و سوودوەرگرتن لە سەرچاوە گرنگەكانی بیری ئیسلامی لە كۆن و نوێدا و سەرلەنوێ هێنانەگۆی چەمكە فیكرییە دوێنراوەكان لە مێژووی ئیسلامیدا، بە ڕەچاوكردنی گۆڕانەكانی سەردەم.
- پەرەپێدانی چەمكی ئیعتیدال لە كایە فیكری و مەعریفییە جیاوازەكاندا و خۆبەدوورگرتن لە تێپەڕاندن و بەزایەدان.
- سەنتەر كاردەكات بۆ سەرلەنوێ و بەردەوام خوێندنەوەی هەردوو پەڕاوی قورئان و بوونەوەر بەپێی مەنهەج و میتۆدی زانستی و بەبێ چاولێكەری، بەڵكو بە نەفەسێكی تازە و بە سوودوەرگرتن لە عەقڵی ڕاشكاو و نەقڵی سەلمێنراو.

# ناوەرۆك

## پێشکەشە بە:

* ئارەقەی دەستەکانی باوکم کە هەرچی من هەمە هەوێنی ماندووبوونی دەستەکانی ئەوە.

* تۆزی ژێر قاچی دایکم، کە زەویی بەهەشتە لە دونیادا.

**بەناوی خوای گەورەی میهرەبان**

# پێشەکی

الحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله ﷺ، وعلى آله وصحبه ومن والاه، وبعد:

ئاهی فەلسەفە و نەفرەتی ئایین: کۆمەڵێك بابەتی سادە و ساکارن لە شێوەی کتێبێکدا بەرجەستە بوون، نۆبەرەی شەونخوونیی زەمەنێکی دیاریکراون، بۆیە جەستەیەکی لاواز و سیمایەکی پێنەگەیشتوو و دەنگێکی تیژ و دڵشکێنیان هەیە. ئەگەر کۆژان و ناڕەحەتییەکانی نووسەر نەبووایە بەدەست بەشێك لە کارەکتەرانی دونیای مۆدێرنێتە و تەوژمی بەناو عەقڵانیەت و هزری ئایینی، ئەم کتێبە بە شێوەیەکی جوانتر و سیمایەکی تۆکمەتر و دەنگێکی قەشەنگتر لە وادەی سروشتی خۆیدا لەدایك دەبوو.

بێگومان ئەم بەرهەمە ڕەخنەگرتن نییە لە پرەنسیپ و شاکارەکانی ئایین و ئەدای زانا و بانگخوازە ڕاستەقینەکانی هزری ئیسلامی، هەروەك چۆن لەکەدارکردنی کارەکتەرە ڕەسەنەکانی ڕەوتی عەقڵانیەت و ڕۆشنگەری و جیهانی مۆدێرنێتەش نییە، بەڵکو ئاماژەدانە بە چەند دیاردەیەك کە لەنێو کۆمەڵگە ئیسلامییەکان بەگشتی و کۆمەڵگەی کوردی بەتایبەتی بڵاو بوونەتەوە، کە لەمیانەیاندا هەندێك لە کارەکتەرەکانی ئایین کە لە بنەڕەتدا هەڵگری پەیامی ڕاستەقینەی ئایین نین، بۆ بەرژەوەندیی خۆیان ئایینیان بەپێچەوانەی بنەماکانی خۆی بەکار هێناوە و بوونەتە پەڵەیەکی ڕەش هەم بۆ خودی ئایین، هەم بۆ پێگەی زانا و بانگخوازە ڕاستەقینەکان.

به هەمان شێوە، بەشێك لە بانگەشەكارانی ڕەوتی عەقڵانیەت و ڕۆشنگەری، عەقڵ و فەلسەفەیان پێچەوانەی میتۆدی خۆی بەكار هێناوە، بەمەش بوونەتە فاكتەری سەرەكیی لەكەداربوونی عەقڵ و ڕووشانی كەسایەتی و پێگەی بیرمەندە ڕاستەقینەكان. هەڵبەتە بەر لەوەی بچینە نێو كرۆكی بابەتەكان، چەند تێبینییەك دەخەینە ڕوو:

١- ئەم بەرهەمە بە هیچ شێوەیەك دژایەتیكردنی كەسێك یان ڕەوت و قوتابخانەیەكی دیاریكراوی ئایینی و هزری و فەلسەفی و ئایدۆلۆژی نییە.

٢- هەر كاتێك باس لە كارەكتەری ئایینی یان واعیز و زانا و بانگخوازی ئایینی كرا، مەبەست لێی هەڵگرانی پەیامی ڕاستەقینەی ئایین نییە، بەڵكو مەبەست لێی ئەو كەسانەیە كە لەژێر چەتری ئەم چەمكانە خۆیان حەشار داوە و بە شێوەیەكی خراپ بەكاریان دێنن.

٣- بە هەمان شێوە مەبەست لە كارەكتەری فەلسەفی و ڕۆشنگەریی كەسایەتییە ڕاستەقینەكانی ئەو بوارانە نین، بەڵكو مەبەست ئەو كەسانەیە كە لەژێر ئەو دروشمانەدا خەریكی خۆدەوڵەمەندكردن و نان پەیداكردنن.

٤- مەبەست لە چەمكەكانی فەلسەفە و لۆژیك، مانا تایبەت و دیاریكراوەكەی ئەم دووانە نییە، بەڵكو مەبەستمان لێی بەكارهێنانی عەقڵ و هزر و لۆژیكی مرۆڤایەتییە بۆ پرس و بابەتە جیاوازەكان بە شێوەیەكی گشتی.

٥- مەبەست لە چەمكی ئایین، هزری ئایینییە بە شێوەیەكی گشتی، بۆیە هەندێك نموونەمان هێناوەتەوە كە پەیوەندیی بە ئایینی مەسیحییەوە هەیە، بەڵام زۆرترین سەرنجمان خستووەتە سەر دەق و تێكستە ئیسلامییەكان، بەو پێیەی كە ئایینی پیرۆزی ئیسلام كۆكەرەوە و تەواوكەری تەواوی ئایینەكانی ترە.

٦- ئەگەرچی زمانی ئەم بەرهەمە زێتر ڕەخنەییە و كەم و زۆر پەیوەندیی بە خستنەڕووی مێژووی ئایین و فەلسەفەوە نییە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەشی

یەکەممان تایبەت کردووە بە پێناسەکردنێکی کورتی هەردوو چەمکی ئایین و فەلسەفە و خستنەڕووی خاڵە هاوبەش و ناکۆکەکانی نێوانیان، ئەمەش بە مەبەستی زیاتر ئاشناکردنی خوێنەر بەو دوو چەمکە.

٧- ئەم بەرهەمە هی مرۆڤە و بێ هەڵە نییە، بۆیە هەر هەڵەیەك تێیدا بۆ خاوەنەکەی دەگەڕێتەوە و ئایین و فەلسەفەی ڕاستەقینە لێی بەرین. لە حاڵەتی بەرچاوکەوتنی هەر هەڵە و کەموکووڕییەك، داوای چاوپۆشی لە خوێنەرانی بەڕێز دەکەین.

٨- سوپاسێکی بێپایانم بۆ بەڕێزان: (دکتۆر ئەحمەد وەرتی) کە تەواوی ئەم بەرهەمەی بۆ خوێندینەوە و بە ڕەخنە و پێشنیارە ناوازەکانی بەهرەمەندی کردین، (مامۆستا عیماد گوانی) کە بە ڕاوبۆچوونەکانی لێکۆڵینەوەکەی زیاتر دەوڵەمەند کردین، (مامۆستا هاوکار خانەقایی) کە ئەرکی زۆری کێشا و لە دیزاینکردنی ئەم بەرهەمە، خودای گەورە پاداشتیان بداتەوە.

هیوادارین توانیبێتمان خزمەتێکی کەم بە ئایین و ڕەوتی عەقڵانیەت بکەین و دەستمان خستبێتە سەر هەندێك لەو برینانەی کە ئەگەر سارێژ نەکرێن، بێگومان دەکەوینە بەر ئاهی فەلسەفە و نەفرەتی ئایین، ئەوکات نە ئایین، نە عەقڵ، نە فەلسەفە، ناتوانن فریامان بکەون و ژیار و شارستانیەت و ئایدۆلۆژیا و هزر و ئایینمان دەکەونە ژێر مەترسیی داڕووخان و لەناوچوون و تۆمەتباربوون.

**ئاوارە عەلی خەتی/ هەولێر**

**(٢٠١٧/٦/٦ زایینی)**

**(١١/ڕەمەزانی/ ١٤٣٨ کۆچی)**

# بەشی یەکەم
# چەمکی ئایین و فەلسەفە

بێگومان ڕوونکردنەوە و زانینی چەمك و دەستەواژەکان، کاریگەرییەکی بەهێزی دەبێت بۆ ئاشنابوون و پەیبردن بە ناواخن و کرۆکی هەر بابەتێك، لەو سۆنگەوە دەستپێکی ئەم بەرهەمە بە تیشك خستنەسەر چەمکی ئایین و فەلسەفە لە ڕووی زمانەوانی و زاراوەیی دەست پێ دەکەین و بۆچوونی ڕەوت و ڕێبازە فەلسەفی و فیکری و ئایینییە جیاوازەکان سەبارەت بە هەردوو چەمکەکە دەخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە، دواتر بەکورتی تیشك دەخەینە سەر خاڵە هاوبەش و خاڵە جیاوازەکانی نێوان ئایین و فەلسەفە، بەم شێوەیەی خوارەوە:

## یەکەم: پێناسەی چەمکی ئایین لە ڕووی زمانەوانییەوە

فەرهەنگە جیاوازەکانی زمانی عەرەبی، چەندین واتای جیاجیایان بۆ چەمکی ئایین خستووەتە ڕوو، لەوانە:

١. ئایین بە واتای بیروباوەڕ و دینداری (الاعتقاد والدّینونة[١])

٢. ئایین بە واتای دابونەریت (العادة والشّأن والدأب[٢])

٣. ئایین بە واتای گوێڕایەڵی و ملکەچبوون (الطّاعة والخضوع[٣])

٤. ئایین بە واتای لێپرسینەوە و پاداشت و سزا (الجزاء والحساب[٤])

٥. ئایین بە واتای سەرشۆڕی و بەندایەتیکردن (الذلّ والعبودیة[٥])

بێگومان ئەوەی ئێمە لەم بەرهەمەدا مەبەستمانە، بریتییە لە بەکارهێانی ئایین بە واتای یەکەم، کە مەبەست لێی ئەو ئایین و بیروباوەڕەیە کە مرۆڤ لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیدا پێوەی پابەند دەبێت و هەوڵ دەدات بنەما و بەها و پرەنسیپ و دەق و تێکستەکانی بەرجەستە بکات.

---

(١) بڕوانە: الصحاح تاج اللغة وصحاح العربية: الجوهري: (٢١١٩/٥). لسان العرب: ابن منظور: (٤٦٠/٤). المعجم الوسيط: مجموعة من المؤلفين: (٣٠٧/١).

(٢) بڕوانە: الكليات: أبو البقاء الكفوي: (٤٤٣). جمهرة اللغة: أبوبكر الأزدي: (٦٨٨/٢).

(٣) بڕوانە: لسان العرب: ابن المنظور: (٤٦٠/٤).

(٤) بڕوانە: مجمل اللغة: ابن فارس: (٣٤٢/١). أساس البلاغة: الزمخشري: (٣٠٦/١). القاموس المحيط: الفيروز آبادي: (١١٩٨).

(٥) بڕوانە: الصحاح تاج اللغة وصحاح العربية: الجوهري: (٢١١٨/٥).

## دووەم: پێناسەی چەمکی ئایین لە ڕووی زاراوەییەوە

ڕەوت و ڕێبازە ئایینی و هزری و فەلسەفییەکان، چەندین پێناسەی جیاجیایان بۆ چەمکی ئایین خستووەتە ڕوو، بێگومان ئەمەش بۆ دوو هۆکاری گرنگ دەگەڕێتەوە:

١- پەیوەندیی بە جیاوازیی دیدگا و بیروبۆچوونی ڕێباز و ڕەوتە هزری و ئایینییەکانەوە هەیە، کە هەریەکێکیان هەوڵی داوە بەو چەشنە ئایین بخاتە ڕوو کە خزمەت بە دیدگا و بۆچوونی ئەو ڕەوت و ڕێبازە بکات کە خۆی بڕوای پێیەتی.

٢- پەیوەندیی بە خودی ئایینەکان خۆیانەوە هەیە، چونکە ئایینەکان لە ڕووی سەرچاوە و شێواز و ئەرك و پیشەوە لێك جیاوازن، ئەمەش وای کردووە پێناسەی جیاواز بۆ ئەو چەمکە بخرێتە ڕوو. بۆیە ئێمە هەوڵ دەدەین لێرەدا بەکورتی چەمکی ئایین لە دیدی ڕەوت و ڕێبازە جیاوازەکانی ئایین و هزر و فەلسەفەوە بخەینە ڕوو، بەم شێوەیەی خوارەوە:

### پێناسەی زانایانی ئیسلام بۆ ئایین:

زانایانی ئایینی ئیسلام بەگشتی ئایین وا پێناسە دەکەن کە: یاسا و دەستوورێکی خواییە، مرۆڤە ژیرەکان بانگهێشت دەکات بۆ قبوڵکردنی ئەو پەیام و بنەمایانەی کە پێغەمبەر ﷺ هێناونی و بە هۆیانەوە لە دونیادا سەربەرز دەبن و لە دواڕۆژیشدا سەرفراز دەبن [(١)]. ئەگەر سەرنج بدەین، ئایین لە دیدی زانایانی ئیسلام بە پێغەمبەرەوە ﷺ پەیوەست کراوە و زێتر ڕووی لە کەسە عاقڵەکانە و پەیوەندیی بە دونیا و دواڕۆژەوە هەیە.

---

(١) بڕوانە: التعریفات: جورجانی: (١٠٥). موسوعة كشاف اصطلاحات الفنون: محمد التهانوي: (١/٨١٤).

**پێناسەی ئایین لە مەسیحیەتدا:**

چەمکی ئایین لە دیدی زانایان و پەیڕەوانی ئایینی مەسیحی، بە شێوەیەکی گشتی بە چەند مانایەك خراوەتە ڕوو، لەوانە:

"ئایین بریتییە لە پەیوەندییەکی پتەو لەنێوان دەروونی مرۆڤ و زاتی پاکی خودایی[(١)]."

یان بریتییە لە: "مامەڵەکردنی مرۆڤ لەگەڵ ڕەوش (واقع) و بارودۆخێکی پیرۆزدا[(٢)]."

ئەگەر سەرنج بدەین، ئایین لە دیدی مەسیحییەکاندا زێتر باس لە پەیوەندیی نێوان خودا و مرۆڤەکان دەکات و کەمتر مۆرکی پێغەمبەران (دروودی خودایان لەسەر بێت) و پەرستشەکانی تێدا بەرجەستە دەکرێت.

**پێناسەی ئایین لە دیدی فەلسەفەی کۆمەڵناسییەوە:**

زانایان و فەیلەسووفانی بواری کۆمەڵناسی کاتێك پێناسەی ئایین دەکەن، زیاتر تیشك دەخەنە سەر لایەنە کۆمەڵایەتییەکەی ئایین و وەك مەنزومەیەکی کۆمەڵایەتی نیشانی دەدەن و دەڵێن: "ئایین کۆمەڵێك بیروباوەڕ و پەرستشن، کە پەیوەستن بە شتە پیرۆز و موقەدەسەکانەوە، بە شێوەیەك ئەو کۆمەڵە بیروباوەڕ و پەرستشە، هەموو ئەو باوەڕدارانە لە یەکەیەکی ئایینیدا کۆ دەکاتەوە کە باوەڕیان پێیان هەیە[(٣)]."

---

(١) تاريخ الأديان: دكتۆر عبدالقادر بخوش: (١٨).

(٢) الدين في التصورات الإسلامية المسيحية: كۆمەڵێك نوسەر: (٢١).

(٣) نشأة الدين: دكتۆر عەلى سامى نشار: (٢٥).

ڕوونتر بلێین: ئایین لە دیدی کۆمەڵناسەکانەوە دەزگایەکی کۆمەڵایەتییە، کۆمەڵێك مرۆڤ لەخۆ دەگرێت، ئەو مرۆڤانە بە هۆی ئەنجامدانی چەند پەرستشێکی ڕێکخراو و هەندێك بەهای ئەخلاقییەوە وابەستەی یەکتر بوون، ئەو کۆمەڵە مرۆڤە ئەرکیانە ئەو بیروباوەڕە بپارێزن[1]. وەك دیارە کۆمەڵناسەکان جگە لە تیشك خستنەسەر لایەنە کۆمەڵایەتییەکانی ئایین، باس لە ڕەهەند و چوارچێوە و تایبەتمەندییەکانی تری ناکەن.

### پێناسەی ئایین لە دیدی فەلسەفەی ئەخلاقەوە:

هەرچی زانا و بیرمەندانی فەلسەفەی ئاکار (ئەخلاق)ن، هەوڵیان داوە ئایین وەك ڕەوشت و بەها و ئەخلاقێکی ڕەسەنی مرۆڤایەتی بخەنە ڕوو، بۆیە وتوویانە ئەو کاتە دەتوانین لە ئایین تێبگەین و جێبەجێی بکەین، کە وەك بەها و ئاکار و قیەمێك بخرێتە ڕوو، بە جۆرێك مرۆڤ لە کاتی جێبەجێکردنی ئەرکە ئایینییەکانیدا، وا هەست بکات کە ئەرکێکی ئەخلاقی ئەنجام دەدات.

بێگومان ئەم جۆرە لە پێناسەکردن و نیشاندانی ئایین، زیاتر فەیلەسووفی بەناوبانگی ئەڵمانی (ئیمانوێڵ کانت[2]) هەوڵی بەرجەستەکردنی داوە، هەر بۆیە کاتێك پێناسەی ئایین دەکات، دەڵێت: "بەدڵنیاییەوە ئایین هەر کاتێك لە ڕووی خودییەوە گوزارشتمان لێی کردەوە، بریتییە لە زانینی هەموو ئەرکەکانمان، وەك

---

(١) موسوعة لا لاند الفلسفية: ئەندریە لالاند: (١٢٠٤/٣).

(٢) ئیمانوێل کانت Immanuel Kant: فەیلەسووفێکی ئەڵمانییە، ساڵی (١٧٢٤ز.) لەدایك بووە، ساڵی (١٨٠٤ز.) کۆچی دوایی کردووە. یەکێکە لە گەورەترین فەیلەسووفەکانی فەلسەفەی نوێ، فەلسەفەکەی بە فەلسەفەی ئاکار و فەلسەفەی ڕەخنەیی ناوبانگی دەرکردووە, چونکە ئەم دوو ڕەگەزە لە پایە گرنگەکانی فەلسەفەی کانتن. گرنترین بەرهەماکانی بریتین لە: (تأسيس ميتافيزيقيا الأخلاق، نقد العقل المحض، نقد العقل العملي، نقد ملكة الحكم، الدين في حدود مجرد العقل)، بڕوانە: أعلام الفلاسفة: هنری تۆماس: (٢٧٧). معجم الفلاسفة: جۆرج طرابيشي: (٥١٣).

ئەوەی فەرمانی خودایی بن[1]." هەروەك دیارە، كانت هەموو ئەركە ئەخلاقییەكان وەك ئەركێكی خودایی هەژمار دەكات، بەو واتایەی كردارە ئایینییەكان بەر لەوەی كردار و بەهای ئایینی و خودایی بن، كردار و بەهای ئەخلاقین.

## پێناسەی ئایین لە دیدی فەلسەفەی دەروونزانییەوە:

هەرچی دەروونزانەكانن، هەوڵیان داوە ئایین وەك هەستوسۆزێكی مرۆڤەكان بخەنە ڕوو، بۆیە وتوویانە: "ئایین بریتییە لە هەستوسۆز و كردەوە و ئەزموونی مرۆڤەكان لە كاتی گۆشەگیریدا، كاتێك هەست بە پەیوەندی دەكەن لەگەڵ شتێكدا، كە بە خودا هەژماری دەكەن[2]."

هەروەك دیارە، دەروونزانەكان لە پێناسەی ئاییندا زیاتر تیشك دەخەنە سەر هەستوسۆز و ڕەهەندە دەرونییەكەی مرۆڤ و كەمتر باس لە ڕەهەندی سرووش و پەرستشەكان دەكەن.

## پێناسەی گشتیی ئایین:

بەگشتی ئایین بە هەموو ئەو بیروباوەڕ و پەرستشانە دەگوترێت، كە مرۆڤ باوەڕی پێیان هەیە و هەوڵ دەدات لە ژیانیدا بەرجەستەیان بكات و ژیانی خۆی لەژێر بنەما و یاساكانیدا بەڕێوە ببات، جا سەرچاوەی ئەو بیروباوەڕانە مرۆڤەكان خۆیان بن، یان خودای گەورە بێت. بێگومان مەبەستی ئێمەش لە بەكارهێنانی ئەم چەمكە، بریتییە لەو بیروباوەڕانەی كە لەلایەن فرستادە و نێردراوەكانی خودای گەورە بۆ مرۆڤایەتی هێنراون، وەك ئیسلام و مەسیحیەت و یەهودیەت بە شێوەیەكی گشتی و پەیامی ئیسلام بەتایبەتی.

---

(١) الدين في حدود مجرد العقل: كانت: (٢٤٣).

(٢) فلسفة الدين: جون هيك: (٤).

## سێیەم: پێناسەی چەمکی فەلسەفە لە ڕووی زمانەوانییەوە

چەمکی فەلسەفە لە ڕووی زمانەوانییەوە، ئەو مشتومڕەی لەسەر نییە کە لەسەر چەمکی ئایین هەبوو، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتە کە وشەی (فەلسەفە) لە بنەڕەتدا وشەیەکی عەرەبی نییە، بۆیە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبی ئاماژەیان پێ نەداوە.

وشەی فەلسەفە لە بنەڕەتدا یۆنانییە و لە دوو بڕگە پێك هاتووە، یەکەمیان: (فیلۆ Philo)، کە واتای خۆشەویست (محب) دەگەیەنێت، دووەمیان: (سۆفیا Sophia)، کە بە واتای دانایی (الحكمة) دێت، ئەم دوو بڕگەیە بە هەردووکیان چەمکی (فیلۆسۆفیا philosophy) پێك دەهێنن، کە بە واتای خۆشویستنی دانایی (حب الحكمة) دێت[١].

هەرچەندە چەمکی فەلسەفە بە واتای خوشویستنی حیکمەت و دانایی لێك دراوەتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا یۆنانییەکان هیچ سنوورێکیان بۆ واتای ئەم چەمکە دانەناوە، بەڵکو ئەوان ئەم دەستەواژەیان بۆ هەموو هەوڵ و کۆششێکی عەقڵی بەکار هێناوە، کە بووبێتە مایەی دەستخستنی زانیاریی نوێ بۆ خاوەنەکەی[٢]، بێگومان ئێمەش مەبەستمان لێی هەر ئەم مانایەیە.

لە ڕاستیدا بۆچوونی جیاواز هەن سەبارەت بە یەکەم کەس کە ئەم چەمکەی بەکار هێناوە[٣]، بەڵام زۆرینەی بۆچوونەکان پێیان وایە کە فەیلەسووفی یۆنانی فیساگۆرس[٤] یەکەم کەس بووە ئەم وشەیەی بەکار هێناوە، ئەمەش ئەو کاتە بووە

---

(١) بڕوانە: المعجم الفلسفي: دكتۆر جميل صليبيا: (٢/١٦٠). المعجم الفلسفي: دكتۆر إبراهيم مدكور: (١٣٨). المعجم الفلسفي: مراد وهبة: (٤٦٨). المعجم الفلسفي: دكتۆر مصطفى حسيبة: (٤٦٨).

(٢) بڕوانە: مشكلة الفلسفة: دكتۆر زكريا إبراهيم: (٢٨).

(٣) بڕوانە: مبادئ الفلسفة: رابوبرت: (١٨). في دلالة الفلسفة وسؤال النشأة: دكتۆر الطيب بوعزة: (٤٣).

(٤) فیساگۆڕس Pythagoras: فەیلەسووفێکی یۆنانییە، لەنێوان ساڵانی (٥٨٠-٥٧٠پ.ز.) لەدایك بووە. سەرکردە و دامەزرێنەری ڕەوت و قوتابخانەی فیساگۆرییەکانە، بڕوای وا بووە ڕۆح نەمرە و

که قوتابییەکانی سیفەتی دانا (الحكيم)یان داوەتە پاڵی، بەڵام ئەو ڕەتی کردووەتەوە کە ئەو سیفەتە بۆ خۆی بەکار بهێنێت، بەڵکو گوتوویەتی ئەم سیفەتە (الحكيم) تەنها بۆ خودا بەکار دێت، بۆیە من حەکیم نیم، بەڵکو (فەیلەسووف)م، واتە حیکمەت و دانایيم خۆش دەوێت[1].

هەرچی تایبەتە بەم چەمکە لە زمانی عەرەبیدا، زانایان وشەی دانایی (الحكمة)یان بە هەمان واتای فەلسەفە بەکار هێناوە، بۆیە لەبری فەلسەفە، وتوویانە (الحكمة)، لەبری فەیلەسووف، وتوویانە (الحكيم)، لەبری زانستە فەلسەفییەکان، وتوویانە (العلوم الحكمية)[2].

وا پێدەچێت بیرمەندە ئیسلامییەکان ئەم چەمکەیان لە قورئانی پیرۆز وەرگرتبێت، چونکە قورئانی پیرۆز ئەم چەمکەی بۆ پرسە هزرییەکان بەکار هێناوە، ئەوەتا دەفەرموێت: ﴿ يُؤْتِي الْحِكْمَةَ مَن يَشَاءُ ۚ وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا ۗ ﴾[3].

واتە: "ئەو زاتە بە هەر کەسێك بیەوێت و شایستە بێت، حیکمەت و دانایيی پێ دەبەخشێت و هەر کەس حیکمەتی پێ ببەخشرێت، ئەوا بێگومان خێرێکی زۆری پێ دراوە."

---

جیهان لە (ئاگر و خۆڵ و هەوا و ئاو) دروست بووە. بڕوانە: مشاهير الفلاسفة من طاليس إلى ديكارت: ديوجين لايرتيوس: (٧٤). معجم الفلاسفة: جۆرج طرابيشي: (٤٨٠).

(١) بڕوانە: موسوعة لالاند الفلسفية: ئەندریە لالاند: (٢/٩٧٧). مشكلة الفلسفة: دکتۆر زکريا إبراهيم: (٢٨).

(٢) بڕوانە: تمهيد لتاريخ الفلسفة الإسلامية: دکتۆر مصطفى عبدالرازق: (٧١).

(٣) سوورەتی (البقرة)، ئایەتی: (٢٦٩).

## چوارەم: پێناسەی چەمکی فەلسەفە لە ڕووی زاراوەییەوە

چەمکی فەلسەفەش هاوشانی چەمکی ئایین، لە ڕووی زاراوەییەوە چەندین پێناسەی جیاجیای بۆ کراوە، ئەمەش دوو هۆکاری گرنگی هەیە:

١- پەیوەندیی بە جیاوازیی بۆچوونی ڕەوت و ڕێباز و قوتابخانە فەلسەفییەکانەوە هەیە، بە جۆرێك کە هەر فەیلەسووف و بیرمەندێك هەوڵی داوە ئەم چەمکە بە شێوازێك بخاتە ڕوو، کە خزمەت بە ئایدیا و بۆچوونی خۆی بکات، ئەم هۆکارەش وای کردووە قوتابخانە و فەیلەسووفەکان پێناسەی بەرامبەرەکانی خۆیان قبوڵ نەکەن[١].

٢- پەیوەندیی بەو ئەرك و ڕۆڵە هەیە کە چەمکی فەلسەفە لە سەردەمە جیاوازەکانیدا بینیویەتی، بە جۆرێك کە فەلسەفە لە هەر سات و سەردەمێکدا ڕۆڵێکی جیاواز و تایبەتی بینیوە، ئەمەش وای کردووە پێناسە و بۆچوونی جیاجیای بۆ بخرێنە ڕوو، کە لەگەڵ سەردەمەکە و ئەو ڕۆڵەیدا بگونجێت کە گێڕاویەتی[٢].

سەرەڕای پێناسە و بۆچوونە جیاوازەکان سەبارەت بە چەمکی فەلسەفە، دەتوانین بڵێین زۆرینەی ڕاکان بە ئاقاری بەکارهێنانی عەقڵ دەڕۆن، بە مەبەستی گەیشتن بە حەقیقەت و ناوەڕۆکی شتەکان، بۆ نموونە:

فەیلەسووفی بەناوبانگی یۆنانی (ئەرستۆ[٣])، لە پێناسەی فەلسەفەدا دەڵێت: "فەلسەفە بریتییە لە زانستبوون بە شتە هەبووەکان (موجودات)، وەك ئەوەی کە هەن[١]."

---

(١) بڕوانە: الفلسفة لمن يريد: دکتۆر نبيل عبدالحميد عبدالجبار: (١١).

(٢) بڕوانە: المدخل إلى معاني الفلسفة: دکتۆر عرفان عبدالحميد: (١٨). الفلسفة لمن يريد: دکتۆر نبيل عبدالحميد عبدالجبار: (١١-١٢).

(٣) ئەرستۆ تالیس Aristo tales: فەیلەسووفێکی یۆنانییە، ساڵی (٣٨٤پ.ز.) لەدایك بووە و ساڵی (٣٢٢پ.ز.) کۆچی دوایی کردووە. قوتابی ئەفلاتوون بووە، ئەرستۆ و ئەفلاتوون و سوقرات, سێ

بێگومان مەبەستی ئەرستۆ، ئاشنابوونی مرۆڤە بە حەقیقەت و ناوەرۆکی شتەکان بەو جۆرەی کە هەن، بەدەر لە تیشك خستنەسەر هیچ تایبەتمەندی و لایەنێکی دیاریکراویان.

بە هەمان شێوە، فەیلەسووفی ناوداری ئیسلامیش (ئیبنو سینا[٢]) دەڵێت: "فەلسەفە بریتییە لە ڕاوەستان لەسەر کاکڵ و حەقیقەتی هەموو شتەکان، بەپێی ئەو توانایەی کە مرۆڤ هەیەتی بۆ هەڵوەستەکردن و لەسەروەستان[٣]."

بۆیە بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین، فەلسەفە بریتییە لە توێژینەوە و بەکارهێنانی عەقڵ بە مەبەستی گەیشتن بە ڕاستی و حەقیقەت و کرۆکی شتەکان.

---

گەورەترین فەیلەسووفی یۆنانییەکانن. بەشێك لە بەرهەمەکانی: (المقولات، ما بعد الطبيعة، السياسة)، بڕوانە: مشاهير الفلاسفة من طاليس إلى ديكارت: ديوجين لايرتيوس: (١٣٨). معجم الفلاسفة: جۆرج طرابيشي: (٥٢).

(١) الجمع بين رأيي الحكيمين: فارابي: (٢٨).

(٢) ئیبنو سینا: ناوی حوسەینی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی سینایە، لە زانستی پزیشکی و فەلسەفیدا دەستی باڵای هەبووە،ساڵی (٣٧٠ك.) لە گوندی (ئەفشنە) لەدایك بووە، ساڵی (٤٢٨ك.) لە هەمەدان کۆچی دوایی کردووە. بە (شەیخول ڕەئیس/الشيخ الرئيس) ناوبانگی دەرکردووە، ڕۆئاواییەکان پێی دەڵێن: (ئەمیری پزیشکەکان و باوکی پزیشکی نوێ). بەشێك لە بەرهەمەکانی: (الإشارات والتنبيهات، الشفاء، النجاة، القانون في الطب)، بڕوانە: سير أعلام النبلاء: الذهبي: (٥٣١/١٧). الأعلام: الزركلي: (٢٤١/٢). معجم الفلاسفة: جۆرج طرابيشي: (٢٦).

(٣) كتاب الشفاء: ئيبن سينا: (١٢).

## پێنجەم: خاڵە هاوبەشەکانی نێوان ئایین و فەلسەفە

چەمکی ئایین و فەلسەفە وێڕای بوونی جیاوازییەکی ئێجگار زۆر لەنێوانیاندا – کە لە خاڵی شەشەمدا تیشکیان دەخەینە سەر– بەڵام لە چەندین خاڵی گرنگ و سەرەکیدا هاوڕان، کە ئێمە بەکورتی تیشك دەخەینە سەر سێ خاڵ:

### ١– گرنگیدان بە خوای گەورە (الاهتمام بالمطلق اللامتناهي)

یەکەم کاری ئایین و فەلسەفە، بریتییە لە هەوڵدان و کۆششکردن بە مەبەستی ناسینی خوای باڵادەست و بەدیهێنەری گەردوون. ئەوەتا قورئانی پیرۆز ئەوەمان نیشان دەدات کە کار و پیشەی سەرەکیی پەیامبەرانی خودا، بریتییە لە ڕێنموونیکردنی خەڵك و بانگهێشتکردنیان بۆ ناسین و پەرستشی خودای تاقانە و دوورکەوتنەوە لە شیرك و هاوەڵدانان بۆ خودای گەورە، وەك دەفەرموێت:

﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ﴾[(١)].

واتە: "بێگومان ئێمە لەنێو هەموو گەل و نەتەوەیەکدا پەیامبەرمان ڕەوانە کردووە، تا فەرمان بە خەڵکی بکەن پەرستش و بەندایەتیی خودا بکەن و لە تاغووت و ملهوڕان خۆیان بەدوور بگرن."

هەرچی فەلسەفە و عەقڵی مرۆڤایەتییە، لە ڕاستیدا زۆرترین هەوڵ و کۆششەکانی چڕ بووەتەوە لە مەسەلەی ناسین و سەلماندنی بەدیهێنەری گەردوون و لێکۆڵینەوە دەربارەی خودا و مەسەلە پەنهان (غەیبی)یەکان، کە لە فەلسەفەدا ئەم بابەتانە لەژێر ناونیشانی میتافیزیقا (Metaphysics) خراونەتە ڕوو.

---

(١) سوورەتی (النحل), ئایەتی: (٣٦).

فەیلەسووفی بەناوبانگی ئەڵمانی (هیگڵ[1])، لەم بارەوە ئاماژە بۆ خاڵی هاوبەشی نێوان ئایین و فەلسەفە دەکات و دەڵێت: "ئایین و فەلسەفە لە ڕووی گرنگیدان و لێکۆڵینەوە دەربارەی حەق (الله)، هاوبەشن[2]."

## ٢- سەنتەربوونی مرۆڤ

ئایین و فەلسەفە لەوەدا کۆك و هاوڕان، کە کۆی بنەما و پرەنسیپەکانیان لەپێناو بەختەوەری و سەرفرازیی مرۆڤە لە ڕووە مەعریفی و ڕۆحی و ماددییەکانەوە، هەردووکیان زۆرترین هەوڵیان لەپێناو چارەسەرکردنی پرسە گرنگ و چارەنوسسازەکانی مرۆڤە. ئیبنو حەزمی[3] ئەندەلووسی دەفەرموێت: "لە ڕاستیدا کرۆکی فەلسەفە، مانا و بەروبوومەکەی و ئامانج و مەبەست لە فێربوون و بەرجەستەکردنی، بریتییە لە باشکردن و چاکسازیکردنی دەروونی مرۆڤ، بە شێوەیەك کە وا لە دەروونی مرۆڤ دەکات لە دونیادا چاکە و ڕەوشتی باش ئەنجام

---

(١) هیگڵ Hegel: فەیلەسووفێکی ئەڵمانییە، ساڵی (١٧٧٠ز.) لە شتوتگارت لەدایك بووە، ساڵی (١٨٣١ز.) بە نەخۆشیی کولێرا لە بەرلین کۆچی دوایی کردووە. یەکێکە لە کاریگەرترین فەیلەسووفەکانی فەلسەفەی نوێ، میتۆدی فەلسەفەکەی بریتییە لە دیالەکتیك کە زۆرێك لە فەیلەسووفەکانی دوای خۆی ئەم میتۆدەیان هەڵبژاردووە و گرنگیان پێی داوە. بەشێك لە بەرهەمەکانی: (محاضرات في فلسفة التاريخ، محاضرات في فلسفة الدين، فينومينولوجيا الروح)، بڕوانە: معجم الفلاسفة: جۆرج طرابيشي: (٧٢٢).

(٢) بڕوانە: محاضرات في تاريخ الفلسفة: هيگل: (١٤٧).

(٣) ئیبنو حەزم: ناوی موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی ئەحمەدی کوڕی سەعیدی کوڕی حەزمی زاهیری ئەندەلووسییە، ساڵی (٣٨٤ك.) لەدایك بووە و ساڵی (٤٥٦ك.) کۆچی دوایی کردووە. سەرەتا لەسەر مەزهەبی ئیمامی شافیعی بووە، بەڵام دواتر مەزهەبێکی تایبەت بە خۆی دانا کە پێی دەوترێت (مەزهەبی زاهیری)، کە پشت بە زاهیریی دەق دەبەستێت لە قورئان و فەرموودەدا. گرنگترین بەرهەمەکانی بریتین لە: (المحلى، الإحكام في أصول الأحكام، الفصل في الملل والأهواء والنحل)، بڕوانە: سير أعلام النبلاء: الذهبي: (١٨٤/١٨). الأعلام: الزركلي: (٢٥٤/٤).

بدات، که دەبێتە هۆی سەر فرازی لە دواڕۆژدا، ئەمەش ڕێك مەبەست و ئامانجی ئایین و شەریعەتی خودایە[1].

هەر بۆیە لە ئایین و فەلسەفەدا، هەرگیز دەقێك نادۆزیتەوە کە بە شێوەیەك لە شێوەکان پەیوەندیی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆی بە خودی مرۆڤ یان بە دۆز و پرسە مرۆڤایەتییەکانەوە نەبێت، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لە بنەڕەتدا مرۆڤ سەنتەری دەق و تێکستەکانی ئایین و فەلسەفەیە و جێی بایەخ و گرنگیپێدانی ڕاستەقینەی ئەو دووانەیە.

## ٣- گرنگیدان بە عەقڵ

بێگومان داکۆکیکردن لە گرنگیی عەقڵ و پشتبەستن بە یاسا و ڕێسا عەقڵییەکان، خاڵێکی هەرە گرنگە کە ئایین و فەلسەفە بەیەکەوە دەبەستێتەوە. شاراوە نییە کە فەلسەفە لە بنەڕەتدا لەسەر بنەمای عەقڵ و لۆژیکی مرۆڤ هاتووەتە کایەوە و زۆرترین هەوڵی بریتییە لە سەلماندنی پرسە گشتییەکانی مرۆڤ بە دید و بۆچوونێکی عەقڵییانە، ئایینیش وێڕای ئەوەی کە پشتی بە سرووش بەستووە-وەك لە بەشەکانی داهاتوودا ئاماژەی پێ دەدەین- گرنگیی تەواو بە عەقڵ دەدات و کردوویەتیە مەرجی بەرپرسیارێتی (تەکلیف) لەسەر باوەڕداران، هەر بۆیە دەگوترێت عەقڵ لە ئاییندا مەرجی بەرپرسیارێتییە (العقل مناط التكليف[2])، لە یاسا و ڕێساکانی فەلسەفەشدا، تاکە بنەما و سەرچاوەی ڕاستەقینەیە[3].

---

(١) بڕوانە: الفصل في الملل والأهواء والنحل: ابن حزم: (١٧١/١).

(٢) بڕوانە: المستصفى في علم الأصول: غەزالی: (٤١٥).

(٣) بڕوانە: تمهيد للفلسفة: دکتۆر محمود حمدی زقزوق: (٨٠).

## شەشەم: خاڵە جیاوازەکانی نێوان ئایین و فەلسەفە

سەرەتا پێویستە بزانین کە هەبوونی جیاوازی لەنێوان ئایین و فەلسەفەدا بە مانای ناکۆکی و دژایەتیی نێوان ئەم دووانە نایەت، بەڵکو مەبەست لە جیاوازیی نێوانیان ئاماژەدانە بە تایبەتمەندیی هەریەکێکیان کە لەوەی تردا بوونی نییە. بێگومان چەندین تایبەتمەندی هەن ئایین و فەلسەفە لە یەکتر جیا دەکەنەوە، کە ئێمە بەکورتی ئاماژە بە هەندێکیان دەدەین:

### ١- لە ڕووی سەرچاوەوە (من حیث المصدر)

بێگومان ئایینە ئاسمانییەکان سەرچاوەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ خودای گەورە، بەڵام هەرچی فەلسەفەیە، بریتییە لە هەوڵ و کۆششی مرۆڤەکان خۆیان[(١)]. هەڵبەتە ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە هەموو ئایینەکان خودا ڕەوانەی کردوون و میتۆدێکی ئاسمانییان هەیە، بەڵکو چەندین ئایین و بیروباوەڕی ترمان هەن کە لە داهێنان و دەستکردی مرۆڤەکان خۆیانن، وەك (کۆنفۆشیۆس و بودا)، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەوەیە، کە زۆرترین جار ئایینەکان پاڵ دەدرێنە لای خودا، بەپێچەوانەی فەلسەفە کە تەنها پاڵ دەدرێتە لای مرۆڤەکان.

### ٢- لە ڕووی ناوەرۆکەوە (من حیث المحتوی)

هەرچەندە ئایین و فەلسەفە لەوەدا یەك دەگرنەوە کە هەردووکیان گرنگی بە خودا و مرۆڤ و عەقڵ دەدەن، بەڵام چەندین بابەت لە ئاییندا بوونیان هەیە، کە لە فەلسەفەدا بەدی ناکرێن، کە ئەمەش خاڵێکی گرنگی جیاوازیی نێوان ئەم دووانەیە، وەك ئەو بابەتانەی پەیوەندییان بە پەرستش و یاسای باری کەسێتی و کڕین و

(١) بڕوانە: الدین بحوث ممهدة لدراسة تاریخ الأدیان: دکتۆر محمد عەبدوڵا دەڕاز: (٧١).

فرۆشتنەوە هەیە. لەبەرامبەردا، فەلسەفە چەندین بابەتی دەربارەی ئەپستمۆلۆژیا و تیۆری مەعریفە لەخۆ گرتووە، کە بە هیچ جۆرێك ئایین بەم شێوازە تیشکی نەخستووەتە سەریان[1].

### ٣- لە ڕووی ئامرازەوە (من حيث الوسيلة)

ئایین دوو ئامراز بەکار دەهێنێت بۆ بەرجەستەکردن و سەلماندنی بنەما و پرەنسیپەکانی خۆی، یەکەمیان: سرووش (وەحی)، دووەمیان: عەقڵ، بەڵام فەلسەفە تەنها پشت بە عەقڵ دەبەستێت، کاتێك دەیەوێت بابەتێك یان پرسێك بخاتە ڕوو یان بیسەلمێنێت[2].

بێگومان ئەم خاڵەش ئەوە دەردەخات کە ئایین گشتگیرترە لە فەلسەفە، چونکە ئایین وێڕای پشتبەستن بە عەقڵ و لۆژیکی مرۆڤەکان، پشت بە وەحی و سرووشی خوداییش دەبەستێت، ئەمەش کامڵی و گەورەیی ئایین نیشان دەدات لەهەمبەر فەلسەفەی مرۆڤایەتیدا.

### ٤- لە ڕووی جێگیری و نەگۆڕییەوە (من حيث الثبات وعدم التغير)

بنەما و پرەنسیپە ئایینییەکان بە شێوەیەکی گشتی بەسەر دوو بازنەدا دابەش بوون، **یەکەمیان:** هیچ کات گۆڕانکاری بەسەردا نایەت، **دووەمیان:** بەپێی کات و شوێن و سەردەم گۆڕانکاریی بەسەردا دێت. ڕوونتر بڵێیین، لە ئاییندا هەندێك بڕیار و پرس و بابەت هەن، چەسپاو و نەگۆڕ (ثابت)ن، وەك ئەو بابەتانەی کە پەیوەندییان بە بیروباوەڕ و پەرستشەکانەوە هەیە، لەبەرامبەردا کۆمەڵێك بابەت هەن کە چەسپاو نین، بەڵکو ڕێژەیین و بەپێی بارودۆخ گۆڕانکارییان بەسەردا دێت و

---

(١) بڕوانە: فلسفة الدين في الفكر الغربي: دکتۆر إحسان علي حيدری: (١١٦).

(٢) بڕوانە: تاريخ الفلسفة الإسلامية في المشرق: دکتۆر محمد إبراهيم الفيومي: (٣٣٥).

گۆڕاو (متغير)ن، وەك زۆرێك لە ڕاوبۆچوونە جیاوازەکانی نێو قوتابخانە فیقهی و ئوسوڵی و بیروباوەڕییەکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام.

هەرچی فەلسەفەیە، لە ڕاستیدا هیچ کات بنەما و پرەنسیپەکانی نەگۆڕ و چەسپاو نین، چونکە لە بنەڕەتدا فەلسەفە پشت بە عەقڵ دەبەستێت، عەقڵی مرۆڤیش سنوورێکی دیاریکراوی نییە، بۆیە دەکرێت ئەوەی ئەمڕۆ فەلسەفە و عەقڵی مرۆڤایەتی وەك حەقیقەت و پرسێکی نەگۆڕ دەیخاتە ڕوو، لە داهاتوودا عەقڵ ڕەتی بکاتەوە و پرسێکی تر بخاتە شوێنی، بێگومان لە مێژووی هزر و فەلسەفەی مرۆڤایەتیشدا، چەندین نموونەی لەم جۆرە بەدی دەکرێن.

بێگومان ئایینش لەو بازنەیەدا کە بڕیارەکانی نەگۆڕ و چەسپاو نین، هاوشانی فەلسەفە قابیلی گۆڕان و نوێگەرییە، بەڵام لە بازنەی نەگۆڕدا هیچ کات قابیلی نوێگەری نییە، چونکە مرۆڤەکان توانای ئیجتیهاد و ڕادەربڕینیان تیادا نییە.

### ٥- لە ڕووی بیروباوەڕەوە (من حيث العقيدة)

بێگومان ئایین وەك بیروباوەڕ و ئایدۆلۆژیا هەژمار دەکرێت، بەپێچەوانەی فەلسەفە کە تەنها غەریزەیەکی مرۆڤایەتییە و هیچ کات وەك ئایین و ئایدۆلۆژیا خۆی بەرجەستە ناکات[١].

### ٦- لە ڕووی مەبەستەوە (من حيث الغاية)

ئایین لە دووتوێی دەق و تێکست و بنەماکانیدا، دەیەوێت بەختەوەری و ئارامی بە دڵ و دەروونی مرۆڤایەتی ببەخشێت، ئەمەش لە دەرئەنجامی پابەندکردنی بە

---

(١) بڕوانە: مدخل إلى الفلسفة: دکتۆر موحەمەد موحەمەد قاسم: (٦٥).

کۆمەڵێك پەرستش و دروشمی ئایینی. هەرچی فەلسەفەیە، دەیەوێت مرۆڤ لە ڕووی زانست و مەعریفەوە تێر بکات[1].

بێگومان ئەم خاڵە ئەوە ناگەیەنێت کە ئایین مەعریفەی تێدا نییە و فەلسەفەش ئارامیی دڵ و دەروونی تێدا نییە، بەڵکو ئایین لە پەراوێزی خستنەڕووی پەیامەکانی خۆیدا زانست و مەعریفەی زۆری بۆ مرۆڤایەتی هەڵگرتووە، فەلسەفەش لە ڕێگەی بەخشینی زانیارییەکانی، ئاسوودەییەکی تەواو بە دڵ و دەروونی مرۆڤایەتی دەبەخشێت.

**٧- لە ڕووی دەستپێکەوە (من حيث المنطلق)**

ئایین لە حەقیقەتەوە دەست پێ دەکات، بەڵام فەلسەفە لە گومانەوە، بەو مانایەی لە ئاییندا مرۆڤ سەرەتا بڕوای بە پرسێکی دیارکراو هەیە، ئینجا هەوڵ دەدات بەڵگە بۆ ڕاستیی ئەو شتە بهێنێتەوە. بەڵام فەلسەفە بەپێچەوانەوە، هەموو شتێك لە سەرەتادا وەك گومان سەیر دەکات، ئینجا دواتر هەوڵ دەدات لە ڕێگەی خستنەڕووی بەڵگەی لۆژیکی و عەقڵی بڕوا بەو شتە بکات. بۆ نموونە: سەلماندنی بوونی خوای گەورە، لە ئاییندا تاکی بڕوادار هەر لە سەرەتادا بڕوای بە بوونی خودا هەیە، ئینجا دواتر بەڵگە دێنێتەوە بۆ سەلماندنی بوونی خودا. هەرچی فەلسەفەیە، لە سەرەتادا گومانی لە هەبوونی خودا هەیە، دواتر لە ڕێگەی بەڵگەی عەقڵی ئەو گومانەی لا دەبات و بوونی خودای گەورە دەسەلمێنێت.

ئەوەی لەم بەشەدا باسمان کرد، دەروازەیەکی کورت بوو بە مەبەستی ئاشنابوونی خوێنەر بە چەمکی ئایین و فەلسەفە، کە لەم بەرهەمەدا چەندین جار دووبارە دەبنەوە.

---

(١) بڕوانە: الفلسفة أنواعها ومشكلاتها: هنتر ميد: (٣٩).

# بەشی دووەم
# دوژمنی ڕاستەقینەی فەلسەفە و ئایین

غیابی ئایین یان عەقڵ، واتە لەدایکبوونی مرۆڤێکی ناکام. غیابی هەردووکیان، واتە لەدایکبوونی مرۆڤێکی مردوو، کۆبوونەوەی هەردووکیان بەیەکەوە، واتە هاتنەدونیا و بەرجەستەبوونی تاکێکی فەلسەفی و تاکێکی ئایینی کە لە دیدی فەلسەفەدا بە مرۆڤی کامڵ (الإنسان الكامل) و لە دیدی ئاییندا بە بڕواداری ڕاستەقینە (المؤمن الحق)، گوزارشتی لێ دەکرێت.

مرۆڤ کائینێکی دوو ڕەهەندییە، ڕەهەندێکە پەیوەندیی بە دیوی ئایدۆلۆژیا و بیروباوەڕ و نەستی (لاشعور)یەوە هەیە، ئەوەی تریان پەیوەندیی بە دیوی هزر و ئەندێشە و هەستی (شعور)یەوە هەیە، بە واتای ئەوەی بەشێك لە فاکت و حەقائیقەکانی ژیانی مرۆڤ پەیوەستە بەو ئایدۆلۆژیا و بیروباوەڕانەی کە لە نەست و لاشعوری خۆیدا بۆی پەیدا دەبن، بەبێ ئەوەی کەسایەتیی خۆی ڕۆڵی تێدا هەبێت، لەبەرامبەردا بەشێکیان پەیوەندیی بە هەستوسۆز و ئەندێشەی خودی مرۆڤ خۆی هەیە و توانا و ویستی تاك ڕۆڵی بەرچاوی لە بەرجەستەکردنیاندا هەیە.

بێگومان ئایین لە بنەڕەتدا ڕۆڵی تێرکردن و کامڵکردنی ڕەهەندە ئایدۆلۆژییەکە دەبینێت (ئەمە وێڕای ئەوەی کە ئامرازێکی سەرەکیی کامڵکردنی ڕەهەندە هزرییەکەشە). عەقڵ و فەلسەفەش ئەرکیان کامڵکردن و لێوانلێوکردنی ڕەهەندە هزری و ئەندێشەییەکەیە، ئەمە وێڕای ئەوەی کە کاریگەریی بەرچاوی هەیە لە چەسپاندن و ڕاگیرکردنی دیوەکەی تری مرۆڤ.

لەباربردنی هەر ڕەهەندێکیش، زیان بە بەردەوامی و بوون (وجود)ی مرۆڤ دەگەیەنێت و جاویدانی مرۆڤایەتی لەنگ دەکات، چونکە جەوهەر و ڕەسەنایەتی و شووناسی مرۆڤبوون وابەستەی ئەم دوو ڕەهەندەیە بەیەکەوە.

چیرۆك و پەیوەندیی ئەم دوو چەمکە –ئایین و عەقڵ– لەگەڵ مرۆڤدا بە جۆرێك لە جۆرەکان لە سەرگوزەشتە و چیرۆکی کوڕەکانی ئادەم ﷺ دەچێت. هابیل بەردەوامبوونی خۆی و ئاسوودەییی قابیلی گەرەکە، بەڵام قابیل هەوڵ دەدات بوون و ماهیەتی هابیل لەسەر زەوی نەهێڵێت، سەرئەنجام خۆی تووشی خەمۆکی و سزای پەروەرێن دەکات، بوون و ژیانی مرۆڤێکیش ڕەش دەکاتەوە.

لە ڕاستیدا مرۆڤ کارەکتەرێکی هاوشێوەی قابیلی هەیە و ئایین و عەقڵیش بەیەکەوە ڕۆڵی کارەکتەری هابیل بەرجەستە دەکەن.

مرۆڤ تەنها گەرەکیەتی پارێزگاری لە بوونی خۆی بکات، ئەگەر بوونێکی ناکامیش بێت و لەسەر ئەستۆی ئەو پێکهاتە و ئامرازانە بێت کە بەشێك لە بوونی ئەو پێك دەهێنن، ئایین و عەقڵیش لەپاڵ جاویدان و نەمریی خۆیان، هەوڵ دەدەن ببنە سەرچەشمە و ئالیەتی زیندەگی بۆ ڕەچەتەی مرۆڤایەتی.

مرۆڤ لەپێناو بەرژەوەندییەکانی خۆی دەست بۆ ماهیەت و کرۆکی ئایین و عەقڵ دەبات، لە کاتێکدا تاکە خواست و خولیای ئەو دووانە جاویدانی و ئاسوودەییدانە بە مرۆڤ.

هاوکێشەیەکی تەواو پێچەوانە لە دیدگای مرۆڤ و ئایین و عەقڵدا بەدی دەکرێت، مرۆڤ تێڕوانینێکی دیاریکراو (مشخص) و زاتیی هەیە، ئایین و عەقڵیش بۆچوونێکی غەیریەت و ناخودبوون (لا الأنا)یان هەیە.

ئایین و عەقڵ لە ڕێگەی بوون و بەرجەستەکردنی پەیام و بەهاکانیانەوە، بوون و جاویدانی مرۆڤایەتییان دەوێت و لە هەر ئەگەرێکدا کە بوونی مرۆڤ بکەوێتە مەترسی، ئەوان هەڵوەستە دەکەن، بەو مانایەی بوونیان لەپێناو وجودی مرۆڤە. هەرچی مرۆڤە، دەیەوێت بوونی خۆی بهێڵێتەوە بەبێ گوێدان بەو قوربانییانەی کە دەبنە فاکتەری مانەوەی ئەو لە ژیاندا، بەو پێیەش بێت مرۆڤ ئایین و عەقڵ وەك ئامرازێك بۆ مانەوەی خۆی بەکار دەهێنێت، هەر کاتێکیش ئەو دووانە بەربەست بن لەبەردەم بوون و بەرژەوەندییەکانی ئەو، بە هیچ جۆرێك سڵ ناکاتەوە لەوەی بەرەنگاریان ببێتەوە و هەوڵی کوشتنیان بدات.

دەشێ مرۆڤ لەپێناو مانەوەی خۆیدا، هاوکێشەی میکاڤیلی[1] بەرجەستە بکات (مەبەست پاساوی ئامراز دەدات/الغاية تبرر الوسيلة)، کە خولیای هەبوون و

(١) میکاڤیلی Machiavelli: سیاسەتمەدار و فەیلەسووفێکی ئیتالییە، ساڵی (١٤٦٩ز.) لەدایك بووە و ساڵی (١٥٢٧ز.) کۆچی دوایی کردووە. تیۆری میکاڤیلی لە سیاسەتدا, بۆ ئەم زانایە دەگەڕێتەوە. بڕوانە: معجم أعلام المورد: منير البعلبكي: (٤٣١).

ڕەسەنایەتیی خۆی وا دەکات هەموو چەمکێك بە ئایین و عەقڵیشەوە بکاتە شیرینی ئەو خولیایە.

بێگومان فەلسەفە و ئایین دوو چەمکن، بە درێژاییی مێژوو بوونەتە گۆچانی دەستی دوو مرۆڤی جیاواز:

**یەکەمیان:** هێندە کەنەفت و پەککەوتەیە کە ئیدی توانای نەماوە چیتر بەکاریان بهێنێت و پشتیان پێ ببەستێت، بۆیە تووشی ڕزین بوون و خەریکە مۆرانە لێیان دەدات.

**ئەوەی تریان:** هێندە منداڵ و کەمتەمەنە نازانێت چۆن چۆنی بەکاریان بهێنێت و سوودیان لێ ببینێت، بۆیە خەریکە تووشی شکان و لەناوچوونیان دەکاتەوە.

لە هەردوو باریشدا، تەنها ئایین و فەلسەفە بوونەتە قوربانی، چونکە لە ئەگەری یەکەمدا گومان دەکرێت ئیدی ئایین و مەعریفە وەلا بنرێن و چیتر نەبنە مژار و باسی لەپێشینەی مرۆڤایەتی، بەڵکو تەنها وەك قۆناغێکی کلاسیکی و کۆنی مێژووی مرۆڤایەتی هەژمار بکرێن.

لە ئەگەری دووەمیشدا، ئەگەرچی جێی بایەخی مرۆڤایەتی دەبن، بەڵام بەرجەستەکردنێکی خراپ و پیادەکردنێکی ناسروشتی و نالۆژیکی شووناس و مێژووی ئەم دووانە لەکەدار دەکات.

لە واقیعدا، ئەستەمە مرۆڤ توانای هەبێت ئایدۆلۆژیا و هزری مرۆڤایەتی یان ئایین و لۆژیك لەناو ببات، چونکە ئەم دووانە سیفەتی نەمری (خلود)یان هەیە، بۆیە تەنها مەرجی مردنی ئایین و هزرە مرۆڤایەتییەکان، لەدایکنەبوونیانە. لە ئەگەری دیارکەوتنیان، سەرمەدیەت و جاویدان دەبێتە شووناس و میدالیای هەمیشەیییان.

ئەوەی دەشێت بەرامبەریان ڕوو بدات، تەنها گۆڕان و وەرچەرخانیانە لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر، دەشێت لە ڕێگەی گۆڕینی فۆڕم و میکانیزمی

خۆبەرجەستەكردنیان ئەم سیفەتی نەمرییە نیشان بدەن، دەشگونجێت هەمان فۆرم و پرەنسیپ و بنەماكانی خۆیان لەژێر سیما و ناوێكی تردا بخەنە ڕوو.

لە ڕاستیدا ئەم جۆرە لە وەرچەرخان و خۆنیشاندانی بیرو باوەڕەكان ئایینی بن یان هزری و فەلسەفی، لە دیدی گۆستاڤ لۆبۆندا[1] بە مردن هەژمار دەكرێت، واتە ئەو بۆچوونی وایە كە بیروباوەڕ و هزرەكان نامرن، تەنها شێوازی بەرجەستەكردن و خۆنیشاندان و ناویان دەگۆڕێت، ئەم گۆڕانەشیان خودی مردنیانە[2].

بەڵام ئێمە ئەو كردارەی ئایین و هزرەكان ناو دەنێین: (بوونی سێبەری)، كە تیایدا ئایین و فەلسەفە بوونێكی هەقیقی و چەسپاویان نابێت، بەڵام ناشمرن، بەڵكو لەژێر سایەی ئایین و هزری تردا بەردەوامی بە بوونی خۆیان و بنەما و پرەنسیپەكانیان دەدەن، هەڵبەتە ئەمەش لە مێژووی ئایین و فەلسەفەدا زۆر بەڕوونی بەدی دەكرێت، كە بەشێك لە ئایین و فەلسەفە مرۆڤایەتییەكان نەیانتوانیوە جاویدان و نەمری بە دەق و تێكست و بەهاكانیان ببەخشن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە جۆرێك لە جۆرەكان لەژێر هەژموون و سێبەری ئایین و فەلسەفەی تردا ناوبەناو هەناسەی ژیانیان هەڵمژیوە.

مرۆڤ لە هەمان ئەو كاتەی داینەمۆی بووژانەوە و نەمریی ئایین و هزری مرۆڤایەتییە، بكوژی ڕاستەوخۆی ئەو دووانەشە، هەڵبەتە كوشتن بە واتای گۆڕینی فۆرمی بەردەوامییان لە بوونێكی حەقیقی بۆ بوونێكی سێبەری. بە گوزارشتێكی تر، ئایین و فەلسەفە جیاوازەكان سیفەتی سەرمەدی و نەمری لە جۆری پیادەكردن

---

(١) گۆستاف لۆبۆن Gostave Lobone: مێژوونووسێكی فەرەنسییە، ساڵی (١٨٤١ز.) لەدایك بووە و ساڵی (١٩٣١ز.) كۆچی دوایی كردووە. گرنگییەكی زۆری داوە بە شارستانیەتەكان, بەتایبەت شارستانیەتی عەرەب و ڕۆژهەڵات. چەندین بەرهەمی هەیە لەوانە: (حضارة العرب، روح السياسة، سيكولوجية الجماهير، السنن النفسية لتطور الأمم). بڕوانە: (ویكیپیدیا wikipedia.org).

(٢) بڕوانە: الآراء والمعتقدات: گۆستاڤ لۆبۆن: (١٩٥).

و ئەرگۆمێنتکردنی هەوادارانیان وەردەگرن، بە هەمان شێوە، ڕیشاڵی لەناوچوون و دەستپێکی ئاوابوونیشیان لە کرداری شوێنکەوتووەکانیانەوە سەرچاوە دەگرێت.

ئایدۆلۆژیا و هزر و فەلسەفە جیاوازەکانی مێژووی مرۆڤایەتی، بەردەوامی و لەناوچوونیان وابەستەی دوو بنەما و خاڵی سەرەکی بووە، کە یەکێکیان پەیوەندیی بە شووناس و سروشتی بەها و بنەماکانی خۆیانەوە هەیە، ئەوەی تریشیان پەیوەندیی بەو فۆڕم و مۆدێلەوە هەیە کە هەوادارانیان تیایدا بنەما و پڕەنسیپەکانیان لە تیۆر و دەقی نووسراو دەکەنە پڕاکتیك و تێکستی بەرجەستەکراو.

پێویستە بنەما و پڕەنسیپەکانی ئایدۆلۆژیا یان هزر و لۆژیك لە ئاستێکدا بن، کە توانای بەرجەستەکردنی خواست و داواکاریی مرۆڤەکانیان هەبێت، ئەگەر نا دەستپێکی لەدایکبوونیان بە کەمئەندامی و ناکامی دەبێت، دوا جار ناتوانن بەو چەشنە گەشە بکەن کە هەژموون و کاریگەریی خۆیان زاڵ بکەن بەسەر تاکەکانی کۆمەڵگەدا.

ئەو ئایین و فەلسەفە مرۆڤایەتییانەی بەناسروشتی لەدایك بوون، ئەگەرچی جاویدانیان دەبێت، بەڵام توانای سەرکردایەتیکردن و ڕێبەرایەتیکردنی مرۆڤ و کۆمەڵگەیان نییە، تەنها دەتوانن لەژێر چەتری ئایین و هزری تردا بەردەوامی بە جاویدان و نەمریی خۆیان بدەن. بە گوزارشتێکی سادەتر، ئەمانە ئایین و هزری سێبەرن و خزمەتیان بۆ ئایین و هزری ترە، تەنها قازانجێك کە هەیانە، لەو ڕێگەوە بەردەوامی بە بوون و مانەوەی خۆیان دەدەن، ئەم جۆرە لە ئایدۆلۆژیا و هزری مرۆڤایەتییە بەردەوام تەنها لە بازنەی خود (ذات)دا دەمێنێتەوە و ناتوانێت سنووری ئەو بازنەیە ببڕێت، چونکە بە جۆرێك هاتووەتە بوون، کە نەتوانێت جگە لە خۆی ببێتە سەرچاوەی ژیان بۆ هیچ تاکێك یان چەمکێکی تر.

لە ڕاستیدا بەردەوامنەبوونی ئەو جۆرە ئایین و هزرانە، پەیوەست نییە بە ئاکاری شوێنکەوتووەکانیان و فۆڕمی بەرجەستەکردنیان لە کۆمەڵگەدا، چونکە ئەوانە هەر لە بنەڕەتدا نەیانتوانیوە سنووری خود ببەزێنن و کاریگەری لەسەر تاك دروست بکەن، بە هۆی تێکگیرانیان لەگەڵ خواست و بەرژەوەندییە باڵاکانی مرۆڤدا، یان بێتواناییيان لەبەرامبەر دابینکردنی حەز و خواستەکانی مرۆڤدا.

بێگومان سازشنەکردن لەسەر ڕەهەندی مرۆڤایەتیبوون، هەموو ئایین و هزر و فەلسەفەیەك دەخاتە سەر سیستم و ڕێڕەوی نەمری و بەردەوامبوون. هەڵبەتە جاویدان و نەمری و بەردەوامی، جارێکی تر و لە قۆناغێکی تردا بەندە بە دید و تێڕوانین و جۆری فۆڕمەڵەکردنی بنەماکانیان لەنێو کۆمەڵگە و لەسەر زەمینی واقیعدا.

ئەو ئایین و فەلسەفانەی توانیویانە سنووری خود ببەزێنن و هەژموون و کاریگەریی خۆیان بەسەر هەندێك کۆمەڵگە یان هەندێك نەتەوەدا بسەپێنن، فاکتەری بەردەوامنەبوون و لەکەداربوونیان بە هیچ جۆرێك پەیوەندیی بە سروشتی بەها و پرەنسیپە خودی (ذاتي)یەکانەوە نییە، بەڵکو ئاوابوون و کزبوونی هێز و توانایان، پەیوەندیی بەو میکانیزم و مۆدێلانەوە هەیە کە شوێنکەوتە و هەوادارەکانیان نیشانیان داوە، یان بەرجەستەیان کردووە.

ڕەچەتەی ئایین، خواوەند بێت یان مرۆڤ –وەك لە داهاتوودا باسی دەکەین– ڕیشاڵێکی مرۆڤایەتیی هەیە، مرۆڤبوون بەو واتایەی ئایینەکان لە بنەڕەتدا لەپاڵ ناساندنی پەروەردگار و بەندایەتیکردندا لەپێناو تیماری ئاریشە و وەڵامی ئەندێشە لۆژیکی و عەقڵانییەکانی مرۆڤدا سەریان هەڵداوە، ئەمە جگە لەو ئایینە مرۆییيانەی کە لە بنەڕەتدا خواستی مرۆڤبوونیان هەبووە، بەڵام بەها و پرەنسیپە ئەنتی مرۆڤایەتییەکانیان، یان کەمتەرخەمییان لە ئاست داواکارییەکانی مرۆڤدا، بووەتە مایەی ئەوەی کە بەناسروشتی لەدایك بن و جاویدان و بەردەوامبوونیان نەبێت.

لۆژیکیترین پەیڤیش، داننانە بەوەی بەرهەمی هزر و ئەندێشەی خودی مرۆڤەکانیش لە بنەڕەتدا تەنها و تەنها توێکلێکی مرۆڤانە و ناواخنێکی مرۆڤایەتیی هەیە، ئەمە بەدەر لەو بەرهەمە هزری و عەقلانییانەی کە توێکلێکی مرۆڤایەتی و ناواخنێکی نامرۆڤانەیان هەیە.

ئەگەرچی بەرژەوەندیی مرۆڤ زیاتر لە ئاییندا پارێزراوە بە بەراورد لەگەڵ عەقڵ و هزر و فەلسەفەدا، بەڵام ئایین زێتر کەوتووەتە بەر ڕەخنە و توانجی مرۆڤەکان، کە بێگومان ئەمەش پەیوەندیی بە فاکتەری زەمەن و مانەوە و ڕێژەی زۆری تاکی بڕوادارەوە هەیە.

لە بەرامبەردا، هزر و فەلسەفە لە ئایین سادەترن لە ڕەهەندە مەعریفی و کردارییەکەوە، بەڵام زێتر تووشی فەرامۆشکردن و وەلانان دەبنەوە، کە بێگومان ئەمەشیان پەیوەستە بە زاڵبوونی هێزی دڵ کە پەیوەندیی بە ئیمانەوە هەیە، بەسەر هێزی عەقڵ کە پەیوەندیی بە زانستەوە هەیە.

لێرەدا پرسیارێکی لۆژیکی و مێژوویی هەیە بەرەوڕوومان دەبێتەوە و پێویستە بەوردی وەڵام بدرێتەوە، ئەویش ئەوەیە: ئایا ئایین و فەلسەفە دژی مرۆڤن، یان مرۆڤ دژی ئایین و فەلسەفەیە؟ بە گوزارشتێکی تر، ئایا مرۆڤ بووەتە هۆی ئازاردانی ئایین و عەقڵ، یان ئایین و عەقڵ مایەی ئازارەکانی مرۆڤن؟

بێگومان تێڕوانینی خودی و حەقیقی هزر و لۆژیك و ئایین بۆ ئەم پرسیارە تەواو جیاوازە لەگەڵ دید و تێڕوانینی فەلسەفەی مێژوو، ئەگەر وەك واقیعێکی مرۆڤایەتی هەژماری بکەین، کە دەکرێت بەکورتی بەم شێوەیەی خوارەوە بێت:

لە ڕووی هزر و لۆژیکەوە، ئایین و عەقڵ تا ئاستێك لە خزمەت مرۆڤدان، کە دەشێت بڵێین ڕۆڵی خزمەتکار دەبینن، هەڵبەتە ئەمە وێڕای پێگە و ئەرزشی ڕاستەقینەی خۆیان. بەڵام وەك بەراوردێك لەگەڵ مرۆڤدا، دەگونجێت مرۆڤ بە

خاوەنی ئایین و عەقڵ هەژمار بکرێت و ئەوان بە کۆیلە[1] و خزمەتکار، چونکە لە ڕاستیدا مرۆڤ بەرجەستەی عەقڵ و موممارەسەی ئایین دەکات، نەك ئەوان مرۆڤ بۆ خۆیان ڕام بکەن و بەکاری بهێنن.

ئەم هاوکێشەیەش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت، کە ئایین و عەقڵ بەها و پرەنسیپەکانیان لە دڕندەترین شێوە و بەرجەستەکردنیشدا مورکێکی مرۆڤایەتیی پێوە لکێنراوە، وەك ئاماژەیەك بۆ دەستەمۆبوونی ئەو دووانە بۆ هێز و توانا و خولیاکانی مرۆڤ.

عەقڵ زادە و بەرهەمی مرۆڤە، بۆیە نالوێت مرۆڤ لە ڕووی لۆژیکەوە سەرچاوەی بونیادنان و هێنانەکایەوەی دژی خۆی بێت، بۆیە هەر هزر و فەلسەفەیەك کە هاتووەتە بوون، لە بنەڕەتدا و لە دیدی خاوەنەکانیانەوە، بە ئامانجی خزمەتکردنی مرۆڤ دێتە بوون، ئەگەرچی تراژیدیاش بخولقێنێت و ببێتە سەرچاوەی کوژاندنەوەی تۆوی مرۆڤایەتی.

لەبەرامبەردا، ئایین ئەگەر سەرچاوەیەکی خوایی هەبێت، بێگومان بۆ ڕێبەرایەتی و ڕێنوێنیی مرۆڤایەتی دێتە خوارەوە، ئەگەر لە ئەفراندنی خودی مرۆڤایەتیش بێت، ئەوکات پڕکردنەوەی بۆشاییی ڕۆحی و تێرکردنی لایەنی مەعنەویی مرۆڤایەتی و پاڵفتەکردنی ناواخنی مرۆڤ و بەرجەستەکردنی یەکسانی و بەئازادیکردنی تاکەکانی کۆمەڵگە گرنگترین پەیام و داخوازیەکانیەتی، هەڵبەتە ئەمەش دیسان فۆڕمێکی تری کۆیلەبوون و خزمەتکاربوونی ئایینە بۆ مرۆڤ.

ئەستەمە بتوانین بەها و پرەنسیپە گشتییەکانی ئایینە ئاسمانی و ئایینە مرۆییەکانی مێژوو تاووتوێ بکەین، تا بەکۆیلەبوونیان بۆ مرۆڤ بسەلمێنین، چونکە بێگومان ئەمە پێویستی بە توێژینەوەی جیاجیا هەیە، بەڵام بە تێڕوانینێکی خێرا،

---

(١) هەڵبەتە کۆیلەبوون وەك ڕەهەندە کرداریەکە نەك وەك ڕەهەندە ئایینی و مەعنەوییەکە، بەو مانایەی چۆن کۆیلە خزمەت بە سەرداری خۆی دەکات, ئایینیش هەمان ڕۆڵ دەبینێت سەبارەت بە مرۆڤ.

به دیارترین ئایینە ئاسمانییەکانی وەك ئیسلام و مەسیحیەت و یەهودیەت ئەوە بەدی دەکرێت، کە دەق و تێکستەکانیان لە بەرژەوەندیی مرۆڤە، تەنانەت ئەو دەقانەشی کە فاکتەری لەناوبردنی مرۆڤێکی ترن، یان هۆکاری کەمئەندامبوونی مرۆڤن بە تێڕوانینێکی لۆژیکی و بابەتییانە قازانجی مرۆڤ دێننە کایەوە، وەك کوشتنەوەی بکوژ و تۆڵەسەندنەوە (القصاص) و دەست بڕینی دز و تەمبێکردنی تاوانباران... هتد.

هەڵبەتە هەمان ئەو تێڕوانینە بەرامبەر بە ئایینە دەستکردەکانی مرۆڤ دروستە، لەگەڵ خستنەڕووی جیاوازییەك کە قازانجی مرۆڤایەتی لە ئایینە ئاسمانییەکان لەسەر بنەمای حەقیقەتی ڕەها بونیاد نراوە، واتە گومان لەوەدا نییە کە بەرجەستەکردنی دەق و تێکستەکانیان دەبنە فاکتەری قازانج بۆ مرۆڤ، بەڵام ئایینە دەستکردەکان قازانجی مرۆڤ تیایاندا ڕێژەییە و لەسەر بنەمای گەشبینی و گومانی باش بونیاد دەنرێت، واتە مەرج نییە پیادەکردنی هەموو ئایینێکی دەستکردی مرۆڤایەتی لە بەرژەوەندیی مرۆڤدا بێت و قازانجی مرۆڤایەتی دەستەبەر بکات، ئەگەرچی لە بنەڕەتدا بەو ئامانج و مەبەستەش دروست کرابێت.

کەواتە لە ڕووی تیۆری و لە هەقیقەتدا، ئایین و عەقڵ خزمەتکاری مرۆڤن و ناگونجێت سەرچاوەی ئازارەکانی مرۆڤ، ئایین یان عەقڵ و فەلسەفە بێت، بەڵام لە ڕاستیدا ئەم خستنەڕووە تەنها لە باری تیۆرییەوە دەشێت قەزیە و هاوکێشەیەکی ڕاست بێت، بەڵام لە واقیع و مێژووی مرۆڤایەتیدا بێگومان قەزیە و هاوکێشەیەکی هەڵەیە، چونکە پێویستە دان بەو ڕاستییەدا بنرێت کە بەڵێ ئایین و هزرە مرۆڤایەتییەکانیش لە قۆناغێکی مێژووی مرۆڤدا سەرچاوە و ئامرازی ناسۆرییەکانی مرۆڤ و ئەشکەنجەدانی مرۆڤایەتی بوون، کە ئەمەش دەشێت جۆرێك لە ڕقەبەرایەتیی مرۆڤ بۆ ئایینێکی دیاریکراو یان فەلسەفەیەکی تایبەت دروست بکات.

بەڵام تێڕامانێکی لۆژیکییانە، سەرچاوەی ئەو ڕیشاڵەی ڕقوکینەی مرۆڤ بۆ ئایینەکان یان فەلسەفەکان وشك دەکات، ئەمەش کاتێك مرۆڤ بۆی دەردەکەوێت کە سەرچاوەی ئەو نەهامەتییانەی ئایین و هزرە جیاوازەکان بەسەر مرۆڤایەتییان هێناوە، ئۆباڵەکەی دەگەڕێتەوە سەر ئەستۆی خودی مرۆڤەکان خۆیان، ئەوکات ئازارەکانی مرۆڤ سەرچاوەکەی خۆی دەبێت، نەك ئایین و عەقڵ و فەلسەفە.

حەقیقەتێکی ڕەها هەیە گرنگە بیزانین، کە ئایین و عەقڵ هێزێکی ناوەکییان هەیە و ناتوانن ئەم هێزەیان وەدەربخەن تەنها لە ڕێگەی مرۆڤەکانەوە نەبێت، ئەگەر مرۆڤ ئایین بەرجەستە نەکات و عەقڵ بەکار نەهێنێت، عەقڵ و ئایین لە خودی خۆیاندا ناتوانن خۆیان بەرجەستە بکەن، بەڵکو بەردەوام بەدەوری خۆیاندا دەخولێنەوە، کەواتە جەوهەر و کلیلی پڕاکتیزەکردن و وەدەرخستنی ئایین و عەقڵ مرۆڤەکان خۆیانن. ئەگەر مرۆڤایەتی پەنا بۆ هزر و ئەندێشەیەك نەبات کە ئەگەری دەبەریەکڕاچوونی هەبێت لەگەڵ بەها و پرەنسیپە مرۆڤایەتییەکان و ئایینێك پیادە نەکات کە دژی خواستە باڵاکانی مرۆڤ بێت، هیچ کات پرسی مەترسیی ئایین و عەقڵ بۆ سەر مرۆڤایەتی هەر بوونی نابێت.

بۆیە لە ڕاستیدا ئەگەر ئایینێکی ناسروشتی هەبێت و هزرێکی نالۆژیکی هەبێت کە لە بنەڕەتدا بنەما و دەق و تێکستەکانیان دژ بە خواستی مرۆڤ بن، ئەوە تەنها مرۆڤە دەتوانێت ئەو بنەما و دەقە دژە مرۆییيانەیان لە ئەگەری تیۆری و نەبوونەوە بگوازێتەوە بۆ سەر زەمینی کردار و بوونەوە.

لەبەرامبەردا ئەگەر ئایین و هزرێکی مرۆڤایەتی هەبن، دەق و تێکست و بنەماکانیان لێوانلێو بن لە خواست و بەرژەوەندییەکانی مرۆڤ، ئەوە تەنها مرۆڤەکانن دەتوانن ئەو بنەما و خواستە مرۆییيانەیان لەگۆڕ بنێن و هەر لە باری خولانەوە بەدەوری خۆیاندا بیانهێڵێتەوە.

ئیدی دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە ئایین و هزرە ئەنتی مرۆڤایەتییەکان هەر مرۆڤن کە بەرجەستەیان دەکەن و سیفەتی بوونیان پێ دەدەن، هەروەها ئایین و فەلسەفە مرۆڤدۆستەکانیش بە هەمان شێوە، هەر مرۆڤەکانن کە لە سیفەتی بوون و هێنانەبوون بێبەشیان دەکەن، دوا جار سەرچاوە و فاکتەری سەرەکی لەپشت سوودی یان زیانی ئایین و فەلسەفە تەنها مرۆڤەکانن، نەك ئەم دووانە خۆیان.

ئەمە لە کاتێکدا کە دەشێت تا ڕادەیەکی زۆر بوترێت مرۆڤەکان سەرچاوەی ئازار و لەناوچوونی ئایین و فەلسەفەکانن، بەڵام لەو بوارەشدا پێویستە جیاوازی لەنێوان دوو فۆڕمی جیاوازی ئایدۆلۆژیا و هزر و فەلسەفە مرۆڤایەتییەکاندا بکرێت، بەم شێوەیەی خوارەوە:

**یەکەم:** بەشێك لە ئایین و هزرە مرۆڤایەتییەکان، توخمی لەناوچوون و لەکەداربوونیان لە خۆیانە، واتە خۆیان نەیانتوانیوە وەك پێویست بەرژەوەندییەکانی مرۆڤ بهێننە دی، بەو پێیەش کە مرۆڤ خوێکی کەسی و زاتیی هەیە، ڕاستەوخۆ ئەو جۆرە ئایین و هزرانەی فەرامۆش کردووە، بۆیە ئێستا یان هەوادار و شوێنکەوتەیان هەر نییە، یان ڕێژەی بوونی شوێنکەوتووەکانیان ناگاتە ئەو ئاستەی وەك ئایین و هزری زیندوو هەژمار بکرێن.

**دووەم:** جۆری دووەمی ئایین و فەلسەفەکان، توخمی دژ بە خۆیان تێدا نییە، بەڵکو هەموو بەها و پرەنسیپەکانیان بە شێوەیەکە کە مرۆڤێکی کامڵی فەلسەفی یان باوەڕدارێکی ئایینی ڕاستەقینە پێویستی پێیەتی، بەڵام ئەم مرۆڤە فەلسەفی و ئایینیانە جۆری پڕاکتیزەکردن و مومارەسەکردنیان بۆ دەق و تێکستە فەلسەفی و ئایینییەکان پێچەوانەی بەرژەوەندیی خۆیان و بەرژەوەندیی خودی ئایین و فەلسەفەکانە، سەرئەنجام ئەو کردارەیان دەبێتە مایەی ئەشکەنجەدانی ئایین و فەلسەفە تا ئەو ئاستەی بگاتە ڕادەی لەناوچوون و کوژانەوە و نەمانی کاریگەرییان لە دیرۆکی مرۆڤایەتیدا.

هەڵبەتە کاتێك باس لە ئەشکەنجەدانی ئایین و فەلسەفە دەکەین، مەبەستمان پێی ئەشکەنجەی جەستەیی نییە، بەڵکو مەبەستمان پێی ئەشکەنجەی مەعنەوییە، چونکە ئایین و عەقڵ لە ڕاستیدا وجودیان وجودێکی عەقڵی و لۆژیکییە نەك ماددی.

بۆیە –بە بۆچوونی ئێمە– هەمیشە ئایین و هزرەکان بوونەتە قوربانیی دەستی مرۆڤ. بەپێچەوانەوە، ئایین و فەلسەفە هەر خۆیان توخمی مرۆڤایەتییان تێدایە و هەر دژبوونێکیشیان بە خواست و خولیا مرۆڤەیەتییەکان، بەرهەمی پڕاکتیزەکردنی مرۆڤەکانە، نەك بنەما و دەق و تێکستەکانی خۆیان.

لەم سۆنگەوە، ئایین و فەلسەفە بوونەتە یاری بە دەست هەندێك مرۆڤ کە سەرەڕای بێتوانایی و کەمتەمەنی، گیرۆدەی کەمعەقڵی و کاڵفامی بوونەتەوە، ئیدی بە جۆرێك ئایین و فەلسەفەیان نیشانی مرۆڤایەتی داوە، کە ئایین دژی بەهاکانی خۆی و فەلسەفە دژی بنەماکانی خۆی دەدوێت، بە جۆرێك سروشت و تابلۆی ئەم دووانەیان شێواندووە کە ئەگەر ڕەوتێکی ڕاستەقینەی عەقڵدۆست و ئایینپەروەر بوونیاد نەنرێت و جارێکی تر تابلۆی ئایین و فەلسەفە وەك خۆیان نەنەخشێننەوە، دوور نییە مرۆڤایەتی بەر ئاهی فەلسەفە و نەفرەتی ئایین بکەوێت.

بە درێژاییی مێژووی ئایین و دیرۆکی فەلسەفە، دووانەیەك بوونیان نییە بەقەد ئەم دووانە دووچاری ستەم و ناوەزڕێندان بووبنەوە و خەڵکی لە دەرئەنجامی زیانگەیاندن پێیان، خۆیانیان پێ دەوڵەمەند کردبێت.

وێڕای ئەوەی کە ئایین و فەلسەفە دووانەیەکی سادە و ساکارن و تەنها پیشە و ئاوات و خواستی ڕاستەقینەیان بونیادنان و هێنانەکایەی ژیانێکی سادە و بەختەوەرانەیە بۆ مرۆڤ، ئەمەش لە دووتوێی بەرجەستەکردنی میتۆدێکی خودایی و ئاییندۆستی، هاوشان لەگەڵ میتۆدێکی مرۆیی و لۆژیکدۆست، کە بە هەردووکیان فۆڕمی ژیانی مرۆڤایەتی بونیاد دەنێن.

کەچی بەپێچەوانەوە، زۆرترین ئاستەنگ و بەربەست و لەمپەر خراوەتە بەردەم ئەو هەوڵ و خواستەیان، هەتا توانراوە دژواری و سەختی بەرەوڕووی پەیام و خواست و بنەما و پڕەنسیپەکانیان کراوەتەوە، کە سەرتاپای لە بەرژەوەندیی مرۆڤ و خولیاکانیدایە.

ئەوەی جێگەی هەڵوەستە لەسەر کردنە ئەوەیە، کە ئەم بەربەستانە لەلایەن خودی مرۆڤەکان دەخرێنە بەردەم ئایین و فەلسەفە، مرۆڤ بەربەست دەخاتە بەردەم چەمکێك کە دەیەوێت بەرژەوەندی و مافەکانی ئەو بپارێزێت و دژواری و سەختییەکانی ژیانی بۆ لا بەرێت، لوغز و پرسیارە ئاڵۆز و هەمیشەییەکانی هزری بۆ شیکار و پاڵفتە بکات.

هەڵبەتە ئازاردانی ئایدۆلۆژیا و فەلسەفە لەلایەن مرۆڤایەتی، فۆڕمێکی گشتی و ڕەهای نییە، بەو واتایەی نە هەموو مرۆڤەکان دژی ئایین و فەلسەفە دەوەستنەوە، نە هەموو ئایین و فەلسەفەکان جێی توانج و ڕەخنەی مرۆڤایەتین.

مرۆڤایەتی بەگشتی سەبارەت بەم پرسە بەسەر دوو بەرەی جیاوازدا دابەش دەبن، مرۆڤە دژە ئایینی و فەلسەفییەکان، هەروەها مرۆڤە ئایینپەروەر و عەقڵدۆستەکان. ئەوەی زیاتر جێگەی ئازارە و ویژدانی مرۆڤایەتی دەخاتە لەرزین، ئەوەیە کە ئایین و فەلسەفە هێندەی لەلایەن دۆست و هەوادارانی خۆیان ئەشکەنجە و ئازار و مەینەتییان بەرەوڕوو دەکرێتەوە، هێندە لەلایەن دوژمن و نەیارەکانیان دووچاری نابن.

چونکە ئەگەر سەرنج بدەینە ئاراستەی ئەو ڕەخنانەی کە بەرەوڕووی ئایین و فەلسەفە دەبنەوە، دەبینین ئەم دووانە –ئایین و فەلسەفە– لە دوو ئاڕاستە و ڕەوتی جیاوازەوە ستەمیان لێ دەکرێت. سادەتر بڵێین، ئایین و فەلسەفە بەدەست دوو گرووپ ئازار دەچێژن، بەم شێوەی خوارەوە:

## گرووپی یەکەم

**ئەو گرووپ و ڕەوت و ڕێبازانەی کە لە بنەڕەتدا هزر و ئینتیمایەکی ئەنتی ئایینی و ئەنتی عەقڵانییان هەیە، بۆیە زۆرترین هەوڵیان دژ بە پرەنسیپ و بەها و ئەرگۆمێنتە ئایینی و فیکرییەکانە.**

هەندێك جار دەبینین ئایین و فەلسەفە بوونەتە قوربانیی ئایدۆلۆژیا و لێکدانەوەی هەندێك مرۆڤ کە هەر لە سەرەتاوە بڕوایان بە میتۆدی ئایینی یان میتۆدی فەلسەفی نییە بۆ چارەسەرکردن و خستنەڕووی پرس و بابەتە مرۆییەکان، ئەمەش وێڕای ئەوەی جێگەی هەڵوەستە لەسەر کردنە –چونکە مرۆڤی ژیر نابێت دژی هزری ڕاستەقینە و ئایینی ڕاستەقینە بوەستێتەوە– بەڵام کردارێکی چاوەڕوانکراوە و تا ڕادەیەك جێگەی قبوڵە، چونکە دەشێت مرۆڤ لە حاڵەتی بڕوانەبوونی بە ئایین و ئایدۆلۆژیایەك، دژ بەو ئایین و بیروباوەڕە بوەستێتەوە و هەوڵی ناشیرینکردن و ڕەخنەگرتن و تاوانبارکردنی ئەو ئایینە بدات. بە هەمان شێوە، دەگونجێت مرۆڤ لە دەرئەنجامی متمانەنەبوونی بە عەقڵ و فەلسەفەیەکی دیاریکراو، دژی خواست و ئامانجەکانی ڕەوتی لۆژیك و عەقڵانیەت بوەستێتەوە و هەوڵ بدات زۆرترین ڕەخنە و توانجیان ئاڕاستە بکات. بە گوزارشتێکی تر، دەکرێت ئەو کەسەی بڕوای بە ئایین نییە، ڕەخنە لە ئایین بگرێت و ئەو کارانە ئەنجام بدات کە دەبنە مایەی ئازاردانی ئایین و ناشیرینکردنی. بە هەمان شێوە، دەکرێت ئەو کەسەی بڕوای بە عەقڵ و فەلسەفە نییە و کاریان پێ ناکات، ڕەخنە لە عەقڵ و فەلسەفە بگرێت و هەموو کارێك بکات کە ببێتە مایەی ناشیرینکردنیان.

بەڵام –بە بۆچوونی ئێمە– ئایین و فەلسەفە کەمتر لە ئاڕاستەی ئەم گرووپ و ڕەوتانە دووچاری لێدران و ڕەخنەگرتن بوونەتەوە، واتە ئەم دووانە کەمتر لەلایەن دوژمنان و نەیارانیان دووچاری ناشیرینکردن و ئازاردان بوونەتەوە، ئەمەش لەبەر دوو هۆکاری جیاواز:

### ١- پەیوەستە بە کەمیی ڕێژەی ئەو مرۆڤانەی کە هەڵگری هیچ بیروباوەڕێکی ئایینی نین

لە ڕاستیدا ئایین پانتاییەکی زەمەنی دوورودرێژی هەیە، کە کاریگەریی ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر هەبوونی ڕێژەی مرۆڤی نائایدۆلۆژی و دژەئایینی، چونکە بەپێی توێژینەوەکان، ڕیشاڵی هزری ئایین بە درێژاییی مێژووی مرۆڤایەتی بوونی هەبووە، تەنانەت هیچ کۆمەڵگە و نەتەوەیەك خاڵی نەبوون لە هەبوونی ئایین و بیروباوەڕ و ئایدۆلۆژیای تایبەت بە خۆیان[١]، ئەوەتا فەیلەسووفی بەناوبانگی فەرەنسی (هێنری بێرگسون[٢]) دەڵێت: "بەدڵنیاییەوە لە ڕابردوو یان لە ئێستادا چەندین کۆمەڵگە دەبینین کە خاوەنی زانست یان هونەر یان فەلسەفە نین، بەڵام ئێمە هیچ کۆمەڵگەیەك نازانین و نادۆزینەوە کە خاوەنی ئایین نەبێت[٣]."

هەبوونی ئایین لەنێو هەموو کۆمەڵگەیەك، وای کردووە ڕێژەی ئەو کەسانەی کە خاوەن ئایین و ئایدۆلۆژیان، زۆرتر بێت لەو کەسانەی کە خاوەنی ئایین و ئایدۆلۆژیا نین، بێگومان مرۆڤەکانیش زۆر بەکەمی بەرەنگاری ئەو ئایدۆلۆژیا و ئایین و بیروباوەڕە دەبنەوە کە خۆیان و باوو باپیرانیان بڕوایان پێی هەیە.

کەمیی ڕێژەی مرۆڤی بێئایین و هەڵگری توخمی دژەئایین بە بەراورد لەگەڵ زۆریی ڕێژەی مرۆڤی بڕوادار، فاکتەری بەهێزن بۆ ئەوەی کەمترین ڕەخنە و لێدان کە بەر ئایین بکەوێت، لەلایەن ئەو مرۆڤانە سەرچاوە بگرێت کە لە بنەڕەتدا ئەنتی ئایینین و خاوەن هیچ ئایدۆلۆژیا و بیروباوەڕێك نین، چونکە لە ڕاستیدا ئەوان لە کۆمەڵگەدا ئێجگار کەمینەن.

---

(١) بڕوانە: الدين بحوث ممهدة لدراسة تاريخ الأديان: دكتۆر محمد عبدالله دراز: (٧٩-٨١).

(٢) هێنری بێرگسون Henri Bergson: فەیلەسووفێکی فەرەنسییە، ساڵی (١٨٥٩ز.) لە پاریس لەدایك بووە و ساڵی (١٩٤١ز.) کۆچی دوایی کردووە. ساڵی (١٩٢٧ز.) خەڵاتی نۆبڵی لە ئەدەب بەدەست هێناوە. بڕوانە: أعلام الفلاسفة: هێنری تۆماس: (٣٢٨). معجم الفلاسفة: جۆرج طرابيشي: (١٦٢).

(٣) منبعا الأخلاق والدين: هێنری بێرگسون: (١١٣).

لەبەرامبەردا، زۆرینەی مرۆڤایەتی خاوەن ئایدۆلۆژیا و ئایینی تایبەت بە خۆیانن، بۆیە لە ڕواڵەتدا کەمتر ڕەخنە لە ئایینەکەیان دەگرن، ئەگەرچی زۆرترین ڕەخنە کە دێتە سەر ئایین، بە هۆی کارەکانی ئەوانە وەك دواتر ئاماژەی پێ دەکەین. پێویستە دان بەو ڕاستیەشدا بنێین کە نەیارانی ئایین تەنها لە ڕێگەی عەقڵ و زانست و بەڵگەوە دەتوانن ڕووبەڕووی ئایین بوەستنەوە و هەوڵی ناشیرینکردن و لەناوبردنی بدەن، بەپێچەوانەی مرۆڤە ئاییندارەکان، کە زۆرترین کات لە ڕێگەی کردەوەکانیان دەبنە مایەی ناشیرینکردنی ئایین.

**٢- پەیوەستە بە زۆریی ڕێژەی ئەو تاکانەی کە بۆ ڕاییکردنی کارەکانیان، پەنا نابەنە بەر چارەسەرییە عەقڵی و فەلسەفییەکان**

ئەگەرچی عەقڵ و ئەندێشە غەریزەیەکی مرۆڤایەتین و بە درێژاییی مێژووی مرۆڤ عەقڵ و هزر و فەلسەفە و بیرکردنەوەش بوونی هەبووە، بەڵام ڕێژەی پشتبەستن بە عەقڵ، ئێجگار کەمترە بە بەراورد لەگەڵ ڕێژەی بەکارنەهێنانی عەقڵ.

بۆیە ئەگەر بەراوردی فەیلەسووف و بیرمەندەکان بکەین، بە درێژاییی مێژوو کەمترین ڕێژەی هەبوونی مرۆڤایەتی پێك دەهێنن، بێگومان ئەمەش کاریگەریی ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر جۆری ئەو ڕەخنانەی بەرەوڕووی عەقڵ و فەلسەفە دەکرێنەوە.

هەروەك چۆن زۆریی ڕێژەی مرۆڤە باوەڕدارەکان و کەمیی ڕێژەی ئەو کەسانەی کە بڕوایان بە ئایین نەبوو، هۆکارێك بوو بۆ کەمتر ڕەخنەگرتن لە ئایین لەلایەن نەیارانی ئایین و دژەئایینەکان. بە هەمان شێوە، کەمیی ڕێژەی بەکارهێنەرانی عەقڵ و فەلسەفە بە بەراورد لەگەڵ زۆریی ڕێژەی ئەو مرۆڤانەی کە عەقڵ وەك چارەسەری یەکەمی کێشەکانیان بەکار ناهێنن، دەمانگەیەنێتە ئەو بڕوایەی کە کەمترین ڕەخنە و لێدان کە بەر ڕەوتی عەقڵ و فەلسەفە و بزاڤی ڕۆشنگەری

بکەوێت، لەلایەن ئەو مرۆڤانە سەرچاوە بگرێت کە لە بنەڕەتدا تاکی  نالۆژیکین و کەمتر متمانەیان بە عەقڵ و پرەنسیپەکانی هەیە.

هەڵبەتە دەشێ کەسێك بپرسێت بۆچی لە ئاییندا ڕێژەی زۆری بەکارهێنەران، فاکتەرێکە بۆ ئەوەی کەمترین ڕەخنە لەلایەن نەیارانی ئایین سەرچاوە بگرێت، بەڵام لە عەقڵ و فەلسەفەدا ڕێژەی زۆری نەیاران و بەکارنەهێنەران فاکتەری ئەوەن، کە کەمترین ڕەخنە و توانج لە نەیاران سەرچاوە بگرێت؟

لە ڕاستیدا –بە دیدی ئێمە– ئەم هاوکێشە پێچەوانەیە، پەیوەندیی بە جیاوازیی هێزی ئایین و عەقڵەوە هەیە، چونکە هەموو ئەوانەی بڕوایان بە ئایین هەیە، پێیان وایە کە ئایین توانای ئەوەی هەیە لایەنە مەعریفی و هزرییەکەشیان بۆ پڕ بکاتەوە، هاوشان لەگەڵ لایەنە مەعنەوی و ڕۆحییەکەیان. بە واتایەکی تر، ڕەخنەنەگرتنیان لە ئایین، دەگەڕێتەوە بۆ پشتبەستنیان بە دەق و تێکستە ئایینییەکان، بۆیە هۆگرییان بۆ ئایین، بەربەستە لەبەردەم توانج و ڕەخنەلێگرتنی.

لە بەرامبەردا، هەموو ئەوانەی نەیاری عەقڵ و فەلسەفەن، لە بنەڕەتدا خودی خۆیان پشت بە عەقڵ و ماریفەت نابەستن تا بەرەوڕووی بوەستنەوە و ڕەخنەی لێ بگرن و ببنە مایەی ناشیرینکردن و لەکەدارکردنی. بە واتای ئەوەی، پشتکردنیان لە عەقڵ و فەلسەفە لەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئەوان ئەرگۆمێنت و شیکارییە عەقڵییەکان هەر بە چارەسەر نازانن، تا ئەوەی هەوڵ بدەن ڕەخنەی لێ بگرن، بۆیە پشتنەبەستنیان بە عەقڵ، هۆکاری کەمتر ڕەخنەلێگرتنیەتی.

سەرئەنجام، کەمترین ڕەخنە کە بەرەوڕووی ئایین و عەقڵ ببێتەوە، ئەو ڕەخنەیەیە کە نەیارانی ئایین و فەلسەفە دەیوروژێنن و ئاڕاستەی دەق و تێکستە فەلسەفی و ئایینییەکانی دەکەن.

دوا جار ئەگەر ئایین و فەلسەفە لەلایەن ئەو دوو گرووپە –گرووپە نائایینی و ناعەقڵانییەکان– لێشیاندرابێت و دووچاری ڕەخنە و هێرشیش بووبنەوە، بێگومان

یان له دەرئەنجامی ئەرگۆمێنتی عەقڵانی یان له دەرئەنجامی کاریگەریی باکگراوندی ئایینی و ئایدۆلۆژی سەرچاوەی گرتووه. واته ئەو تاکەی که بڕوای به ئایین نییه و ڕەخنه له ئایین دەگرێت، زۆرترین جار دوای توێژینەوه و خستنەڕووی بەڵگە، ئەو بۆچوونه دژه ئایینییەی بۆ دروست بووه. به هەمان شێوه، ئەو تاکەی که دژی ڕەوتی ڕۆشنگەری و عەقڵانیەت دەوەستێتەوه و ڕەخنەی لێ دەگرێت، بەردەوام بەڵگە و هۆکاری تایبەت به خۆی هەیه سەبارەت بەو بۆچوونه دژه عەقڵانییەی که هەیەتی.

هەڵبەته ئەمه بەدەر لەوەی که ئاخۆ ئەو توێژینەوه و بەڵگانەی که ئەو کەسانه هەیانه بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئایین و عەقڵ، له بنەڕەتدا لەسەر بنەمای ئەرگۆمێنت و بەڵگەی لۆژیکی و ئایینیی دروست خراونەته ڕوو، یان له دەرئەنجامی خراپ تێگەیشتن له ئایین و عەقڵ سەرچاوەیان گرتووه، واته گرنگ ئەوەیه که تاکه دژەئایینی و دژەعەقڵانییەکان ئەو دژایەتییەیان لەسەر بنەمای بەڵگە هاتووەته کایەوه، بەدەر لەوەی ئاخۆ بەڵگەکانیان ڕاستن یان هەڵەن، هەر بۆیه ئەمه وای کردووه که زیانی ئەمانه بۆ سەر ئایین کەمتر بێت له زیانی ئەو ڕەوت و ئاڕاستەیەی که له بنەڕەتدا ئاییندۆست و عەقڵدۆستن، بەڵام زیاتر بوونەته مایەی ناشیرینکردنی ئایین و فەلسەفه، که له گرووپی دووەمدا تیشکی دەخەینه سەر.

**گرووپی دووەم :**

**گرووپ و ڕەوتێکی پابەند به ئایدۆلۆژیای ئایینی، یان وابەسته به تیۆر و بۆچوونه عەقڵانی و فەلسەفییەکان.**

واته هەندێك جار ئەو ئازار و ڕەخنانەی ئاڕاستەی ئایین و فەلسەفه و ڕۆشنگەری دەکرێن، هۆکارەکەیان خودی بڕواداران و ڕۆشنبیرانن، نەك دوژمنانی ئایین و هزر و فەلسەفه. له ڕاستیدا دژوارترین دوژمنی ئایین و سەرسەختترین بەربەستی ڕەوتی عەقڵانیەت، ئەم جۆره ڕەوت و گرووپەن، بۆیه ئاهی فەلسەفه و نەفرەتی ئایین بەر

لە هەر گرووپێکی تر، ڕووبەڕووی ئەم دەستە و تاقمانە دەبێتەوە، کە لەناو بەرگ و پێستی ئایینپەروەری و ڕۆشنگەریدا، گەورەترین شەرمەزاری و ڕەخنەیان ڕووبەڕووی ئایین و فەلسەفە کردووەتەوە.

بۆیە ناسۆری و مەینەتییەکانی ئایین لە مومارەسەکردنێکی نامرۆڤانە و ناتەندروستانە و نائایینییانەی کەسێکی پابەند بە ئایینەوە سەرچاوە دەگرێت، زۆرترین کاریگەریی خراپ کە لەسەر ئایین و ئایدۆلۆژیا بوونی هەبێت، خراپ فۆرمەلەکردن و بەرجەستەکردنی دەق و تێکستە ئایینییەکانە لەلایەن خودی مرۆڤە ئاییندارەکانەوە، کە ئەمەش ئەوە دەخوازێت ئایین بەر لە هەر دوژمنێك هەوڵ بدات ئەم تاکانە لەناو بەرێت یان بیانخاتەوە سەر ڕێگەی دروست، کە لە ڕاستیدا ئەمانە ڕۆڵی تابووری پێنجەم دەبینن و ئەرکیان دزەپێکردن و گەیاندنی زانیاریی ناڕاست و وێناکردنێکی خراپ و ناشیرینی ئایینە لە دیدگا و بینایی دوژمنەکانیدا.

ئایین هێندەی هەوڵی داوە ئاکار و ڕەوشت و مەترسیی ئەو مرۆڤانە بخاتە ڕوو کە بەڕواڵەت ئاییندارن و کردەوەکانیان دژی ئایین و پرەنسیپ و بەها ئایینی و مرۆییەکانە و مایەی توانج و شەرمەزارین بۆ ئایین و بڕوادارانی ڕاستەقینە، هێندە هەوڵی نەداوە نەیاران و دوژمنانی ئایین بناسێنێت و بەرەوڕوویان بوەستێتەوە[١].

هەر بۆیە ئایین دژوارترین و بەهێزترین دەقە ترسێنەرەکانی خۆی بەرەوڕووی ئەم جۆرە مرۆڤانە کردووەتەوە و بە کەسی دووڕوو (منافق) ناوی بردوون، چونکە ئەمانە بەڕووکەش ئاییندارن، بەڵام لە بنەڕەتدا مایەی سوککردن و ڕەخنەبارانکردنی ئایینن. ئەوەتا ئایینی پیرۆزی ئیسلام توندترین سزای خۆی بۆ ئەم گرووپە ئامادە کردووە، سزایەك کە قورستر بێت لە سزای نەیاران و دوژمنانی

(١) هەڵبەتە ئایین نەیارە ڕاستەقینەکانی خۆیشی ناساندووە، بەڵام دەکرێت بڵێین لەنێوان ئاییندارەکان و دژەئایینەکاندا دووڕووەکان کە لە بەرگی ئاییندا خۆیان دەردەخەن, بە خراپترین چین سەیر کراون و زۆرترین دەق دەربارەیان هاتووە, بەتایبەت لە توراس و دەق و تێکستەکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا.

ئاشکرای ئایین، کە بێبڕوا (کافرە)کانن. ئەوەتا خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴾ [(١)].

واتە: "بەڕاستی دووڕووەکان لە چینی هەرە خوارووی ناو دۆزەخدان و هەرگیز بۆ ئەوان پشتیوانێکت دەست ناکەوێت."

ئەم ڕەوتە بە ناو ئاییندارە، ئایینی تووشی نەزیفی ناوەکی کردووە، هەمیشە ئایین زۆرترین هێز و توانای خۆی بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو کردارانەیە کە بڕوادارەکان ئەنجامی دەدەن، بە جۆرێك کە هێندەی ئایین خەریکی پۆزشهێنانەوە و پینەکردنی نەنگی و خراپەی هۆگرانی خۆیەتی، هێندە نەیتوانیوە بپرژێتە سەر کردار و بۆچوونی نەیارەکانی خۆی. لە ڕاستیدا زیاتر ئایین خۆی لە دۆخی بەرگریدا بینیوەتەوە و نەیتوانیوە ڕۆڵی هێرشبردن بگێڕێت، چونکە بەرگریکردن لە کرداری مرۆڤە بڕوادارەکان، دەرفەتی نەداوە هێرش بباتە سەر خراپەی دوژمنەکانی.

لەم سۆنگەوە، ڕەوتێك بە ناوی عیرفان و تەسەوفەوە[(٢)]، مشەخۆریی بەسەر خەڵکێکی کاڵ فام و ناحاڵی لە ئاییندا دەکەن، هێندەی ئایین بووەتە سەرچاوەی پەیداکردنی سامان و خۆشگوزەرانیی ژیانیان، هێندە نەبووەتە ئامرازێك بۆ چاندنی تۆوی مەعریفەت و بڵاوکردنەوەی جەوهەر و ڕۆحی ڕاستەقینەی ئایین. ڕوونتر

---

(١) سوورەتی (النساء)، ئایەتی: (١٤٥).

(٢) بێگومان ئێمە مەبەستمان تەسەوف و عیرفانی ڕاستەقینە نییە, کە بەشێکی گرنگ و پڕبایەخی نێو توراسی ئیسلام و دەق و تێکستە ئایینییەکانە، هەروەك چۆن مەبەستمان ئەو کەسایەتی و زانا و شێخە ناودار و خواییانە نییە کە سەرتاپای کردارەکانیان لەپێناو بەرژەوەندیی ئایین و مرۆڤایەتیدایە و هەمیشە بوونەتە جێگەی شانازیی ئێمە و تەواوی موسوڵمانان، بەڵکو مەبەستمان ئەو فۆڕمەی نیشاندانی تەسەوفە کە هەندێك جار وەك جەهالەت و هێندێك جاریش وەك خورافە بەرجەستە دەکرێت، کە تەواو پێچەوانەی خواستی ئایینە و بەردەوام وەك دەرچە و ئامرازێك دەخرێتە کار, بە مەبەستی خۆدەوڵەمەندکردن و نانپێخواردن.

بڵێین، بەقەد ئەوەی زیانیان بۆ ئایین هەیە، نیوهێندە نەیانتوانیوە سوود و قازانج بە کار و ڕەوتی ئایینی بگەیەنن.

ئەم ڕەوتەی ئایین بەر لەوەی قووت و خۆراکی ڕۆح و دەروونیان بێت، خۆراکی گەدە و ئامرازی دامرکاندنەوەی حەز و ئارەزووەکانیان بووە. ئایین بەر لەوەی ئامرازی سادەیی و ئازادکردنی مرۆڤایەتی بووبێت، بۆتە ئاڵای خۆبەزلزانی و گەمژاندن و بەکۆیلەکردنی مرۆڤایەتی. ئایین لەبری ئەوەی ئامرازی یەکتاپەرستی و خواناسی بووبێت، کەچی ئەوان لە خزمەت بەخوداکردنی خۆیان و هەوڵدان بۆ ڕەوایەتیدان بە پەرستش و بەندایەتیکردنی عاریف و شێخەکانیان بەکاریان هێناوە، کە ئەمەش هەم پێچەوانەی دەقە ئایینییەکانە، هەم پێچەوانەی خواستی خودی عاریف و شێخە خوداییەکان.

لەولاشەوە کارەکتەرێکی تر بە ناوی بانگخواز و مورشیدی[1] ئایینی، هەرچی ئەتەکێتی ئایینی و بەها و ئەخلاقی ئایینییە خستوویەتە ژێر پێی خۆی لەپێناو دەستخستنی ناوبانگێکی ساختە و پارەوپوولێکی کاتی، تەنانەت درك بەوە ناکات کە بووەتە یاریی دەستی هەندێك میدیا و تۆڕی ئاڕاستەکراو، کە لە بنەڕەتدا ئەرکیان تاشینی پەیکەرێکی پڕکەموکووڕیی ئایینە.

ڕەوتێکیش بە ناوی ئوسولیەت و پابەندبوون بە دەق و تێکستە خوداییەکان، هەرچی مانای لۆژیك و عەقڵانیەتە لە سیمای ئاییندا نەیانهێشتووەتەوە، بە جۆرێك کە بە لێکدانەوە و بۆچوونی ئەوان پابەندبوون بە ئایین یەکسانە بە دەستبەرداربوون لە هەرچی لۆژیك و عەقڵ و فەلسەفەیە. بەپێچەوانەوە، بە

(١) بێگومان لێرەشدا مەبەستمانە بانگخواز و کارەکتەرە ڕەسەن و ڕاستەقینەکانی ئایین نییە، کە ئێمە شانازییان پێوە دەکەین و قەرزاری ئامۆژگارییەکانیانین، بەڵکو مەبەستمان ئەو کەسایەتییانەیە کە لەنێو ئەم بەرگەدا خەریکی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیانن.

بۆچوونی ئەوان پەنابردن یان پشتبەستن بە عەقڵانیەت و ڕۆشنگەری، بە واتای دوورخستنەوەی ئایینە لە کایە و کۆمەڵگا مرۆییەکان.

لەبەرامبەردا، گرووپێك بە ناوی ڕۆشنگەریی ئایینی و بەرجەستەکردنی لۆژیك و فەلسەفە لە توراس و مێژووی ئاییندا، لەژێر ناونیشانی نوێکردنەوە و پاڵفتەکردنی ئایین و توراسی ئایینی، هەموو هەوڵ و کۆششێکیان بریتییە لە ڕووخاندنی ئایین و سەرخستنی عەقڵ و لۆژیك و فەلسەفە، هەموو خواستێکیان لێدانە لە کەسایەتی و زانا ئایینییەکان کە دەبێ هەمیشە جێگەی شانازی و سەروەریی بڕواداران بن. ئەمانە هەموو دەستگرتنێك بە ئایین و دەق و تێکستە قورئانییەکان، بە واتای دەستەمۆبوونی مرۆڤ بۆ میسۆلۆژیا و دابونەریتی مرۆڤی کۆن لێك دەدەنەوە. لەبەرامبەردا، نماکردن و گەشەپێدانی عەقڵانیەت و ئاڕاستەکردنی مرۆڤ بەرەو مۆدێرنێتە و ڕۆشنگەری، لای ئەوان تەنها و تەنها بریتییە لە پشتکردن لەو پرەنسیپ و بەها و دەقە ئایینییانەی کە دەکرێت بە هزرێکی کلاسیکی و بەها و نەریتێکی کۆن و ماوە بەسەرچووی مرۆڤایەتی ناو ببرێت، بە دید و بۆچوونی ئەوان. بۆیە دەتوانین بڵێین خراپترین کارەکتەرەکانی دژ بە ئایین، ئەو کەسانەن کە لە ڕاستیدا هەڵگری بیروباوەڕێکی ئایینی و پاشخان و باکگراوندێکی ئایدۆلۆژیی ئایینین، بەڵام هەموو هەوڵەکانیان بەپێچەوانەی خواست و داواکارییەکانی خودی دەق و تێکستە ئایینییەکانە.

هەڵبەتە دۆخی فەلسەفە و بزاڤی عەقڵانیەت، زۆر لە دۆخی ئایین خراپترە، چونکە دەشێ مرۆڤی ئاییندار لە دەرئەنجامی لێحاڵینەبوون و دروست بەکارنەهێنانی عەقڵ لە شیکارکردنی دەق و تێکستە ئایینییەکان، دووچاری هەڵە ببێتەوە و هەڵەکەشی ببێتە مایەی زیانگەیاندن بە ناوبانگی خودی ئایین خۆی، بەڵام ئایین ئەو هەوڵەیان بۆ بە چاکە هەژمار بکات، وەك لە فەرموودەدا هاتووە: "إِذَا حَكَم الحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أصَابَ فَلَهُ أجْرَانِ، وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثمَّ أخْطَأَ، فَلَهُ

أَجْرٌ(١)." واته: "ئەگەر دادوەرێك یاخود كاربەدەستێكی مسوڵمانان بڕیارێكی دا لە دەرئەنجامی هەوڵدان بۆ گەیشتن بە بڕیارێكی تەندروست، جا ئەگەر لە هەوڵەكەی سەركەوتوو بوو و ڕاستییەكەی پێكا، ئەوا دوو پاداشتی بۆ هەیە، ئەگەر نەشیپێكا، لە دەرئەنجامی ماندووبوونەكەی پاداشتێك وەردەگرێت."

ئەمە وێڕای ئەوەی كە زۆرینەی پەرستش و بابەتە ئایینییەكان لە ڕووە عەقڵانییەكەوە گشتگیر نین، بە واتای ئەوەی هەموو تاكێكی ئیماندار پێویست نییە لەسەری ئەو كارەی ئەنجامی دەدات، لەسەر بنەمای تێگەیشتن و بەڵگە و ئەرگۆمێنتی ئایینی و عەقڵی و فەلسەفی بێت، بەڵام نەگبەتیی فەلسەفە و عەقڵ لەوەدایە، كە كارەكتەرەكانیان لە دەرئەنجامی بەكارهێنانی عەقڵ و پرەنسیپە لۆژیكییەكان دەبنە مایەی ئابڕووچوونی ڕەوتی عەقڵانیەت و دابەزینی كێرڤ و بەهای فەلسەفە لە دیدی كەسانی بەرامبەردا.

لەم كۆمەڵگەیەی ئێمەدا بەشێكی ئەوانەی سەرمەشقی ڕەوتی ڕۆشنگەری و فەلسەفە و مۆدێرنێتەن، پێچەوانەی بنەما لۆژیكی و عەقڵانییەكان دەوەستنەوە، زۆرینەیان ئەو كارە ئەنجام دەدەن كە لە بنەڕەتدا شۆڕشی ڕۆشنگەری لە دژی ئەوەدا سەری هەڵداوە.

بەشێك لەوانەی كە لاف ڕۆشنگەری لێ دەدەن، بوونەتە كۆیلە بەدەست پارت و لایەنێكی دیاریكراو، لە كاتێكدا پێویستە مرۆڤی ژیر خاوەنی بوون و ئازادی و كەسایەتیی خۆی بێت، بێگومان ڕێنسانس و شۆڕشی نوێگەرییش لەو پێناوەدا سەری هەڵدا كە مرۆڤ خاوەنی بوونی خۆی بێت و نەبێتە گۆچانی دەستی هیچ كەسێكی تر. ڕۆشنگەراكان تەنها ڕۆڵی ڕۆبۆتێك دەبینن بەدەست سەرووی خۆیانەوە، لەبری ئەوەی ئەوان كەسانی كاڵفام و دەسەڵاتدار ئاڕاستە بكەن و

---

(١) ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی كردووە, بە ژمارە: (٧٣٥٢).

بیانبەن بەڕێوە، کەچی ئەوان بوونەتە ئامرازێك بە دەستی ئەو نەزان و کاڵفامانەی کە سەرچاوەی نەهامەتی و ناسۆرییەکانی کۆمەڵگەن.

خراپتر لەوە، بە ناو فەیلەسووف و ڕۆشنگەراکان، هێندە دوورن لە هزر و فیکر و فەلسەفە کە گەورەترین زیانیان بەو ڕەوتە گەیاندووە، بە جۆرێك کە نەزانەکانیش درك بە جەهل و نەزانیی ئەوانە دەکەن کە بانگەشەی ڕۆشنبیربوون و هزر و فەلسەفە دەکەن. ڕێك وەك ئەو کەسە وان کە شاعیر لەبارەیانەوە وتوویەتی:

**وغير تقي يأمر الناس بالتقى**

**طبيب يداوي –الناس – والطبيب مريض**(١)

واتە: کەسی خراپ فەرمان بە خەڵکی دەکات باش بن

پزیشك خەڵکی چارەسەر دەکات، لە کاتێکدا خۆی نەخۆشە

ئەم گرووپە بە ناو ڕۆشنگەر و عەقڵانییە بوونەتە یەکەمین دوژمنی عەقڵ و ماریفەت، کە دەشێت لە هەر ساتێکدا بەر ئاهـ و نرکەی عەقڵ بکەون و ببنە قوربانیی دەستی خودی عەقڵ و فەلسەفە. ئەم هەوڵەی ئێمەش تەنها و تەنها لەپێناو خستنەڕووی ئەم وێناکردن و بەرجەستە خراپانەیە کە ئاییندۆستان و ڕۆشنگەراکان بە نەزانی و نەفامیی خۆیان دژ بەم دووانە ئەنجامی دەدەن لە دووتوێی بنەما لۆژیکی و فەلسەفی و ئایینییەکاندا. کە لە ڕاستیدا جگە لە شێواندن و ناشیرینکردنی ئایین و فەلسەفە و ئابڕووچوونی خۆیان، هیچ ئەرزش و بەهایەکیان نییە. بێگومان ئەم جۆرە پیادەکردن و گوزارشتکردنە لە بیروباوەڕی ئایینی و ئایدیای فەلسەفی و عەقڵانی، خزمەت بە بەرژەوەندیی ئەو دوو چەمکە ناکات، کە بە هەردووکیان هەوڵی ڕەخساندنی ژینگەیەکی لەبار و گونجاو دەدەن، تا مرۆڤ بتوانێت تیایدا پەرە بە لێهاتوویی و مەعریفەی خۆی بدات و جێنشینایەتیی خۆی لەسەر زەویدا فەراهەم بکات.

---

(١) شعب الإيمان: البيهقي: (٣/٣٢٥).

گومانیش لەوەدا نییە کە ئەو گرووپە ساختەیەی بە ناوی ئایین و فەلسەفە و عەقڵانیەت بوونەتە مایەی شەرمەزاریی خۆیان و لەکەدارکردنی ئایین و بزوتنەوەی عەقڵانیەت، ئەگەر لەلایەن گرووپە ڕاستەقینەکەی ئاییندار و ڕۆشنگەر بەرپەرچیان نەدرێتەوە و ئەو پێگە و بەهایەی کە بەساختە بۆ خۆیان بەدەستیان هێناوە، بە زووترین کات لێیان نەسەنرێتەوە، ئەوا هەر هەموویان بەر نەفرەتی ئایین و ئاهی فەلسەفە دەکەون، چونکە هەردووکیان بەشدارن لە تێکشکاندنی ئایین و فەلسەفە، یەکیان بە خراپ نیشاندان و هەڵە جێبەجێکردن، یەکیشیان بە خۆبێدەنگکردن و دەست بە کڵاوی خۆوە گرتن لە ترسی با بردن.

بەپێچەوانەوە، هەر هەوڵێك بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو گرووپانە –کە ئەم بەرهەمەش هەوڵێکی سادەیە لەو پێناوەدا– بەدەمەوەچوونی دەق و تێکستەکانی ئایین و بەها و پرەنسیپەکانی عەقڵ و فەلسەفەیە و خزمەتکردنە بە سروشتی ئەو دووانە و پاراستنی مرۆڤایەتییە لە مەترسییەکی ئێجگار گەورە، دوا جار سەرخستنی هەق و ڕاستییە بەسەر ناهەق و گومڕاییدا.

# بەشی سێیەم
# فەلسەفە و ئایین لەنێوان تێگەیشتن و بەرجەستەکردندا

چەمکی ئایین و فەلسەفە بەگشتی لە سێ فۆڕمی جیاوازدا نمایش دەکرێن، گەورەترین هەڵەی مرۆڤایەتییش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت، کە بڕیاردانی لەسەر ئەم دوو چەمکە لە هەر سێ فۆڕمدا یەك جۆرە، کە لە بنەڕەتدا خودی ئەم جۆرایەتییە لە خۆبەرجەستەکردنی ئەم دوو چەمکەدا، ئاماژەیەکە بۆ مرۆڤایەتی کە لە هەر فۆڕمێکدا پێویستە جۆرێك تێڕوانین و بڕیاردانی تایبەت هەبێت. پڕبایەخترین کاریش لەهەمبەر ئایین و فەلسەفەدا، خستنەڕووی فۆڕمە جیاوازەکانی ئەم دووانەیە، کە دواتر دەشێت دروستی و نادروستیی هەر بڕیارێك سەبارەت بەم دووانە، لە دەرئەنجامی تێڕوانین بۆ جۆری فۆڕمەکە بخرێتە ڕوو، بۆیە ئێمە بەکورتی ئاماژەیەکیان پێ دەکەین:

## فۆڕمەکانی ئایین:

ئایین یان وەك دەقی نووسراو سەیر دەکرێت، یان وەك تێگەیشتن لە دەقە نووسراوەکان، یان وەك بەرجەستەکردنی دەقە نووسراوەکان. هەڵبەت سروشتی ئایین و بڕیاردان لەسەر ئایین لە هەریەك لەم سێ فۆڕمەدا جیاوازە، لێرەدا بەکورتی ئەرگۆمێنتی ئەم سێ فۆڕمەی ئایین دەکەین.

### فۆڕمی یەکەم: ئایین وەك دەق

یەکەم دەرکەوتنی ئایین لە کۆمەڵگەدا لە شێوەی دەقی نووسراو و ڕستەی ئاراستەکراو بەرجەستە دەبێت. ئەو ئایینانەی ڕەچەتەیان بۆ خواوەند دەگەڕێتەوە، لە بەرکەوتنی یەکەمین جاری کۆمەڵگەدا بریتین لە کۆمەڵێك تێکستی پیرۆز، کە بە شێوەیەکی نووسراو و نەگۆڕ لە ڕێگەی پەیامبەران (دروودی خودایان لەسەر بێت) دەگەیەنرێتە مرۆڤایەتی و مۆرکێکی تەواوی خواوەندی پێوەیە و هیچ هزرێکی مرۆڤایەتیی تێکەڵ نابێت. دواتر لە بەرکەوتنی دووەمی کۆمەڵگەدا، ئەم دەق و تێکستانە کۆمەڵێك ڕستەی تری بۆ زیاد دەبێت کە خۆی لە شرۆڤە و لێکدانەوە و دید و تێڕوانینی پەیامبەرەکان (دروودی خودایان لەسەر بێت) دەبینێتەوە، کە ئەمە لە توراسی ئایینیدا بەتایبەت ئایینی ئیسلام، بە فەرموودە (حدیث) ناوزەد دەکرێت، کە پەیامبەران (دروودی خودایان لەسەر بێت) بە مەبەستی ڕاڤە و شیکاری دەقە خواییەکان ناچارن ڕستەی تایبەت بە خۆیان بخەنە ڕوو.

ئایین لەم فۆڕمەیدا ئەگەرچی لەلایەن بەشێکی مرۆڤایەتی گومان دەخرێتە سەر ڕێژەی خوداییبوونی دەق و تێکستەکانی –بەو پێیەی هەندێك گرووپ ئەوە ڕەد دەکەنەوە، ئەم دەقانە هی خودا بن– بەڵام بەگشتی سیمایەکی سادە و بێگوناهی هەیە، چونکە لەو قۆناغەدا ئایین تەنها بنەما و پرەنسیپە خوداییەکان وەك خۆی و

بەبێ لێکدانەوە و تێڕوانینە جیاوازەکانی مرۆڤایەتی دەخاتە ڕوو، هەڵبەتە ئەگەر ڕستە ئاڕاستەکراوەکانی پەیامبەرانیش (دروودی خودایان لەسەر بێت) بە دەقی خودایی هەژمار بکەین، بەڵام بە ڕێژەیەکی کەمتر.

ئەم قۆناغەی ئایین ئەگەر وەك خۆی بەرجەستە بکرێت، کەمترین تێکپڕژانی لەگەڵ بەرژەوەندییە لۆژیکییەکانی مرۆڤایەتی دەبێت، چونکە سێبەری خواوەند باڵ بەسەر بووندا دەکێشێت و خواست و خولیا ڕاستەقینەییەکانی مرۆڤایەتی بەرجەستە دەبن.

**فۆڕمی دووەم: ئایین وەك تێگەیشتن**

ئایین لە فۆڕمی دووەمدا سیفەتی خوداییبوونی تێدا کەمتر دەبێتەوە، زێتر ئایین ڕاڤەی بیروبۆچوونە جیاوازەکانی بڕواداران دەکات، نەك بەها و پڕەنسیپەکانی خۆی، بۆیە دەشێت بوترێت ئایین لەم قۆناغەدا بەرجەستەی تێگەیشتنی مرۆڤایەتی دەکات، نەك دەق و تێکستەکانی خۆی.

ئەگەرچی زۆرترین کێشەی ئایین لەگەڵ مرۆڤایەتی لەم فۆڕمەیدا سەرچاوە دەگرێت، بەڵام خۆشبەختانە ناکۆکی و کێشەکان تیۆرین و بەشێکیان تەنها وەك گەمەیەکی لۆژیکی و مەعریفی هەژمار دەکرێن.

لە بنەڕەتدا ناشێت ئەم کێشانە لەسەر ئایین هەژمار بکرێن، بەڵام نەریتی مرۆڤایەتی ئەم فۆڕمەشی وەك ئایین هەژمار کردووە، نەك وەك تێگەیشتن و ڕاڤەکردنی تیۆر و دەقە ئایینییەکان، بۆیە کێشەکانیش بە کێشەی ئایینی هەژمار کراون، نەك کێشەی ڕاڤە و تێگەیشتنی ئایینی.

لەم قۆناغەدا ئایین ئامرازی بەرگریکردنە لە تێگەیشتنی تاکەکانی، چونکە عەقڵانیەتی مرۆڤایەتی و جیاوازییان لە ڕاڤەی تێکستەکان، دەبێتە فاکتەرێك بۆ سەرهەڵدانی ڕێباز و ڕەوتی جۆراوجۆر، هەر گرووپێکیش بانگەشەی ڕەسەنایەتیی

خۆی دەکات و دەق و تێکستەکان بەو شێوەیە ڕاڤە دەکات کە لەگەڵ بۆچوونەکانی خۆی دەلوێت، سەرئەنجام ئایین پیشەی دەبێتە ڕەوایەتیدان بە تێڕوانین و تێگەیشتنە جیاوازەکانی بڕواداران.

هەڵبەتە لەم قۆناغەدا ئایین دوو ڕاڤەکەری جیاوازیی بۆ پەیدا دەبێت، هەندێك جار ڕاڤەکەران ئایین لەم فۆڕمەیدا دەوەستێنن و سیفەتی نەزۆکی دەدەنە پاڵی، نەزۆکی بەو واتایەی کە ئیدی ئایین گەشە ناسەنێت و تەنها لەو سەردەمەدا دەژیەت کە لە سەرەتادا تێیدا هاتووەتە خوارەوە، بێگومان ئەم لێکدانەوەیە هی ئەو گرووپ و ڕەوتە ئایینییانەیە کە بڕوایان وایە ئایین بۆ سەردەمێکی دیاریکراوە و ناشێت لە هەموو بوار و زەمەنێکدا جێبەجێ بکرێت، وەك ئەو ڕەوتە عەقڵانییەی کە بڕوایان بە توراس و دەق و تێکستە ئایینییەکان هەیە –مەبەستمان ئایینی ئیسلامە– بەڵام وای بۆ دەچن کە ئیتر لەم ڕۆژگارەدا ناکرێت جێبەجێ بکرێن، چونکە هەم ڕاستەقینەیی، هەم جێبەجێکردنی ئەو ئایینە بۆ سەردەمێکی دیاریکراوی مرۆڤایەتی بووە.

بێگومان ئەم جۆرە لێکدانەوەیە ئایین نەزۆك دەکات، چونکە ناتوانێت لە فۆڕم و قۆناغی تێگەیشتن و لێکدانەوە پەل بهاوێژێت بۆ قۆناغ و فۆڕمی بەرجەستەکردن، بەمەش ئایین لە ڕووی بڕیاردان و کاریگەربوون و بەردەوامبوون نەزۆك دەبێت.

بەڵام گرووپی دووەمی ڕاڤەکەران، بە جۆرێك ڕاڤەی ئایین دەکەن کە نەك هەر نەزۆك و بێ بەرهەم نابێت، بەڵکو چەند ئایینێکی جیاواز لەدایك دەبن. یان دروستتر بڵێین، چەند ڕێبازێکی جیاواز لەنێو یەك ئاییندا سەر هەڵدەدەن، ئەوکات ئایین لە حاڵەتی فەردانیەت دەگوێزنەوە بەرەو چەندایەتی (تنوع). هەڵبەتە جیاوازیی نێوان ئەم دوو ڕاڤەیە لەوەدایە کە: ئایین کاتێك وەك چەمکێکی نەزۆك و وەستاو ڕاڤە دەکرێت، تێکپڕژان و ڕقەبەرایەتی لەگەڵ مرۆڤدا دروست نابێت و ئایین تووشی ڕەخنە نابێتەوە، چونکە بواری بەرجەستەکردنی نەدراوەتێ تا ئەوەی

هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤایەتی دووچاری گەورەترین ناڕەحەتی دەکاتەوە، چونکە ئێمە پێمان وایە بەرجەستەنەکردنی ئایین مرۆڤێکی ناکام دێنێتە بەرهەم.

بەڵام کاتێك ئایین وا نیشان دەدرێت کە هەڵگری بۆچوون و ڕاڤە و جێبەجێکردنی جیاوازە، ئەوکات ئایین تووشی ڕەخنە دەبێتەوە، بەڵام لەبەرامبەردا کۆی مرۆڤایەتی سوودمەند دەبێت، چونکە ئایین لە لایەك مرۆڤایەتیبوونی بۆ کامڵ دەکات، لە لایەکی تریش یارمەتیدەرێکی باشی دەبێت بۆ چارەسەرکردنی کۆمەڵێك پرس و ئاریشەی عەقڵی و فیتری، کە تەنها ئایین توانای چارەسەرکردنیانی هەیە.

بێگومان ئەم فرەییەی کە ئایین لەلایەن بەشێك لە ڕاڤەکاران بۆی دەخرێتە ڕوو، ئایین لە فۆڕمی تێگەیشتن دەگوازێتەوە بۆ فۆڕمی بەرجەستەکردنی، کە سیمای سێیەمی ئایینە.

**فۆڕمی سێیەم: ئایین وەك بەرجەستەکردن**

لەم فۆڕمەیدا، ئایین بە شێوەیەکی کرداری لەگەڵ مرۆڤایەتیدا ڕووبەڕووی کێشە دەبێتەوە، چونکە لەم قۆناغەدا بەریەککەوتنەکان لە تیۆری و دەمەتەقێی نێوان بڕوادارەکان پێ دەنێتە نێو بەرجەستەکردن و پیادەکردن، ئەوکات لێکەوتەکانی ئەم ناکۆکییانە ماددی دەبن نەك هزری و لۆژیکی، کە زۆرترین جار بە ڕشتنی خوێن و ئەشکەنجەدانی مرۆڤایەتی لە لایەك و لەکەداربوون و بێهێزبوونی خودی ئایین لە لایەکی تر تەواو دەبێت.

بێگومان لە ڕووی لۆژیکی و ئایینییەوە ناشێت بڕیاردان و تێگەیشتن لە ئایین لە هەرسێ حاڵەتدا وەك یەك بێت، چونکە جیاوازیی گۆشەنیگا و خۆنمایشکردنەکانی ئایین فاکتەرێکی هزریی بەهێزە بۆ جۆری بڕیاردانمان لەسەر ئایین.

بڕیاردانی ڕاستەقینە سەبارەت بە ئایین ئەوکاتە دێتە بەرهەم، کە لەسەر بنەمای ئەرگۆمێنتکردنی خودی دەق و توراسە ئایینییەکان بێت، کە تەنها و تەنها خۆی لە دەقی خواوەند و ڕستەی پەیامبەران (دروودی خودایان لەسەر بێت)دا دەبینێتەوە، کە فۆڕمی یەکەمی ئایین بوو.

بەڵام کاتێك بڕیاردان لەسەر ئایین لە دەرئەنجامی تێگەیشتنی بڕواداران یان بەرجەستەکردنە جیاوازەکانیان بۆ دەق و تێکستە ئایینییەکان دێتە بەرهەم، هیچ کات بڕیاردانێکی لۆژیکی نابێت، چونکە ئایین شتێکە و بەرجەستەکردن و تێگەیشتنی شوێنکەوتووەکانی شتێکی تر.

### فۆڕمەکانی عەقڵ و فەلسەفە

چەمکی عەقڵانیەت جیاواز لە ئایین، دەشێت لە دوو فۆڕمی جیاوازدا بەرجەستە بکرێت، عەقڵ وەك دەقێکی ڕەها (مطلق) و تێگەیشتنی مرۆڤەکان بۆ ئاریشە و پرسە مرۆڤایەتی و گەردوونی (وجودی)یەکان، یان وەك بەرجەستەکردنی ڕاڤەی تیۆرا و تێگەیشتنە مرۆڤایەتییەکان. بێگومان جۆری بڕیاردانیش لەسەر عەقڵ و تیۆرە عەقڵییەکان پەیوەستە بە شێوەی فۆڕمەکان، بۆیە ئێمە بەکورتی تیشکیان دەخەینە سەر.

## فۆرمی یەکەم: عەقڵ وەك دەقێکی ڕەها و تێگەیشتنی مرۆڤایەتی

هێزی ئایین لە سەرەتادا فۆڕمێکی ماددیی نووسراوی هەیە، دواتر دەگۆڕدرێت بۆ تێگەیشتن، دوا جاریش بۆ بەرجەستەکردن، بەڵام عەقڵ لە بنەڕەتدا هێزێکی ڕۆحانی و ناماددیی هەیە، عەقڵ دەق و تێکستێکی نووسراو نییە، بۆیە ناتوانرێت لە قۆناغی یەکەمدا وەك کائینێکی جیا لە مرۆڤ هەژمار بکرێت، ئەمە بەپێچەوانەی ئایین کە لە سەرەتادا فۆڕمێکی خودایی هەیە و بە هیچ جۆرێك تێکەڵی توخمی

مرۆڤبوون ناکەوێت، ئەمە جگە لەو ئایینە مرۆییانەی کە لە سەرەتادا تێگەیشتن و تیۆرای مرۆڤی بوون، دواتر لە دەرئەنجامی زۆر پیادەکردن بوونەتە جۆرێك لە ئایین و بیروباوەڕ.

عەقڵ هەر لە سەرەتادا فۆڕمێکی تێگەیشتن و دونیابینیی مرۆڤایەتییە، بۆیە تێڕامان نییە لە دەق، بەڵکو خودی بەکارهێنانی عەقڵ گوزارشت لە دەق و تێکستی عەقڵانیەت دەکات. سادەتر بڵێین، ئەگەر عەقڵ لە شێوەی دەق و تێکستدا بەرجەستە بکەین، ئەوا خودی بەکارهێنانی هێزی عەقڵ گوزارشتە لە دەق و تێکستی عەقڵ.

دەشێ بوترێت، عەقڵ و فەلسەفە لە پلەیەکی باڵادا لەدایك دەبن، بەو واتایەی کە بە قۆناغی نووسینەوە و توراسێکی ماددی گوزەر ناکەن، بەڵکو ڕاستەوخۆ دەچنە قۆناغی تێگەیشتن. ئەمە بەپێچەوانەی ئایین کە بەر لە قۆناغی تێگەیشتن، پێویستە بە قۆناغی نووسینەوە و دەقدا بڕوات.

عەقڵ بەگەورەیی لەدایك دەبێت و ئایینیش بەمنداڵی، هەڵبەتە ئەم جۆرە لەدایکبوونە لە ڕواڵەتدا دەشێت بە کەم سەیرکردنی ئایینی لێ بخوێنرێتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا بەپێچەوانەوە ئەم فۆڕمەی هاتنەدونیای ئایین و فەلسەفە، کاملێی ئایین زیاتر لە عەقڵ و فەلسەفە دەسەلمێنێت، چونکە کاتێك عەقڵ دەقێکی نووسراوی نییە کە وەك مەرجەع پەنای بۆ بەرین لە کاتی ڕوودانی کێشمەکێش و ڕەخنەلێگرتنیدا، سەر دەکێشێت بۆ ئەوەی نەتوانرێت جیاوازی بکرێت لەنێوان خودی عەقڵ و چۆنێتیی بەکارهێنانیدا، بەمەش لە هەموو ئەگەرێکدا ڕەخنەکان بەرەوڕووی عەقڵ دەبنەوە، ئەگەر هۆکارەکەی جۆری بەکارهێنانیشی بێت نەك خودی خۆی.

لەبەرامبەردا، بوونی دەقی نووسراو کە ئێمە وەك قۆناغی منداڵی خستمانە ڕوو، وا دەکات ئایین لە زۆرێك لە ڕەخنە و توانجە جیاوازەکان ڕزگار بکات، چونکە

دەشێت لە ئەگەری هەر ڕەخنەیەك كە بە هۆی بەكارهێنەرانی ئایین ڕووبەڕووی ئایین دەكرێتەوە، پەنا بۆ دەقە نووسراوەكان ببەین و وەك مەرجەعێك بیكەینە داوەر لە ئاست هەقیقەت و ڕەوایەتیی توانج و ڕەخنەكان.

لە هەمان كاتدا بوونی دەق، مەودای ڕەخنەكان كەمتر دەكاتەوە، بەڵام نەبوونی دەقێكی دیاریكراو عەقڵ و فەلسەفە ڕووبەڕووی كۆمەڵێك پرس و ڕەخنە دەكاتەوە كە ئەگەر خاوەنی دەق و تێكست بووان، ڕووبەڕوویان نەدەبوویەوە.

لەم قۆناغەدا كێشەكانی عەقڵ لەگەڵ مرۆڤایەتیدا، كێشەی تێگەیشتن و ڕاڤەكردنن نەك جێبەجێكردن و مومارەسەكردن، بۆیە تێكپڕژانەكان تەنها لە دۆخی تیۆریدا دەبن و زیانی ماددییان نابێت.

عەقڵ بەپێچەوانەی ئایین هیچ كات نەزۆك و بێبەرهەم نابێت، چونكە ئەگەر عەقڵ و تێگەیشتنێكی دیاریكراو لە زەمەن و شوێنێكی دیاریكراودا بەرجەستەش نەكرێت، مرۆڤ لە كۆشش ناوەستێت و هەوڵی هێنانەدی عەقڵ و تێگەیشتنێكی تر دەدات كە بۆ ئەو سەردەمە بگونجێت، ئەمە بەپێچەوانەی ئایین كە ئەگەر لە خاڵێكی دیاریكراودا وەستێنرا، تووشی نەزۆكی دەبێت، چونكە مرۆڤەكان لە بنەڕەتدا كەمترین توانایان هەیە تا بتوانن ئایینێكی تر بخوڵقێنن، هەموو ئەو ئایینانەشی كە لە بنەڕەتدا دەستكردی مرۆڤایەتین، فاكتەری مەعریفی و ئابووری و دەروونی و سیاسی وای كردووە ببنە ئایین، هەڵبەتە ئەمەش دوای چەندین سەدە خەبات و تیكۆشان، كە دوا جار هەر نەشیانتوانیوە لە قاڵبی مرۆڤبووندا بچنە دەرەوە و وەك ئایینی خودایی خۆیان بەرجەستە بكەن.

## فۆڕمی دووەم: عەقڵ وەك بەرجەستەكردنی تێگەیشتن

ئاشكرایە كە لەم قۆناغەدا عەقڵ و فەلسەفەش لە تیۆراوە بەرەو بەرجەستەكردن پەل دەهاوێژن، ئیدی لێرەوە عەقڵیش وەك ئایین دەبێتە ئامراز نەك ئامانج، بە جۆرێك هەر ڕەوت و ڕێبازێكی عەقڵانی و فەلسەفی دەیەوێت عەقڵ بە جۆرێك بەرجەستە بكات، كە ئامانج و خواستە هزرییەكانی بۆ فەراهەم دەكات نەك بەو جۆرە كە عەقڵ خۆی دەیەوێت.

لەم فۆڕمەی عەقڵدا، دەبەر یەكڕاچوون و كێشەكانی عەقڵ ماددی دەبن و بە هەمان شێوەی ئایین سەرەتا مرۆڤایەتی دەبێتە قوربانی، دواتر خودی چەمكی عەقڵ.

گەرەكە مرۆڤایەتی كێشە و ڕەخنەكانی قۆناغی بەرجەستەكردنی عەقڵ لەسەر خودی عەقڵ هەژمار نەكات، هەرچەندە لە واقیعدا عەقڵ پێوەرێكی دیاریكراوی نییە تا ئەوەی بتوانین بیكەینە داوەر لەوەی ئاخۆ كێشەكان هی خودی عەقڵن، یان هی فۆڕم و میتۆدی بەكارهێنانی عەقڵ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەكرێت بەرژەوەندییە گشتییەكانی مرۆڤایەتی و كۆدەنگیی مرۆڤەكان و عەقڵێكی بێ ڕتوش بكرێنە پێوەرێكی ڕەمزی و ڕۆحی بۆ یەكلاییكردنەوەی كێشەكان لەنێوان پاڵدانی بۆ خودی عەقڵ، یان پاڵدانی بۆ شێوازی بەكارهێنانی عەقڵ لەلایەن مرۆڤەكانەوە.

دوا جار لەم خستنەڕووەی فۆڕمە جیاوازەكانی ئایین و عەقڵ، ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت كە لۆژیكیترین ڕەخنە ئەو ڕەخنانەن كە ئاڕاستەی قۆناغەكانی یەكەمی ئایین و عەقڵ بكرێنەوە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوەی دەبینرێت، زۆرترین ڕەخنە ئایینی و عەقڵانییەكان لە فۆڕمی سێیەمی ئایین و دووەمی عەقڵدا دەردەكەون، بۆیە زۆرترین ڕەخنەكان كە بەرەوڕووی ئەم دووانە دەبێتەوە، هۆكارەكەی خۆیان نین، بەڵكو چۆنێتیی ڕاڤەكردن و بەرجەستەكردنیان، فاكتەری ئەم بەریەككەوتە و كێشانەن.

بۆیە دەشێ بوترێت ئەم فۆڕمە جیاوازانەی ئایین و عەقڵ تەنها لە ڕووی تیۆرییەوە بوونیان هەیە، بەڵام لەسەر زەمینی واقیع کەمترین مرۆڤ ئەو مرۆڤانەن کە ڕەخنەکانیان بۆ ئەم دووانە لەسەر بنەمای جیاوازی فۆڕمی ئایین و عەقڵ بونیاد بنێن، ئەو مرۆڤانەی جیاوازی لەنێوان ئایین وەك دەق و ئایین وەك ڕاڤە و لێکدانەوەی مرۆڤە باوەڕدارەکان دەکەن زۆر کەمن، بە هەمان شێوە ئەو مرۆڤانەی خودی عەقڵانیەت و ڕاڤە و بەرجەستەکردنی ڕۆشنگەراکان بۆ پرسە فیکری و مەعریفییەکان لە یەك جیا دەکەنەوە، یەکجار کەمن.

بۆیە هەوڵ دەدەین لە خاڵەکانی داهاتوودا ئەو فۆڕمانە بخەینە ڕوو، کە لە واقیعی کۆمەڵگاکاندا بەرامبەر بە ئایین و عەقڵ بەرجەستە دەکرێن.

بێگومان لە واقیعدا دوو دیدگا و بۆچوونی جیاواز بۆ فۆرمەلەکردن و لێکدانەوەی دەق و تێکستە فەلسەفی و ئایینییەکان بوونی هەیە:

**دیدگای یەکەم :**

تیشك دەخاتە سەر خودی فەلسەفە و ئایین خۆیان، واتە ڕوانینێکی بابەتییانە و واقیعییانەیە بۆ ناواخن و کرۆکی فەلسەفە و ئایین و سەرچاوەی دەقەکانیان. ئەم دیدگایە خستنەڕووی پەیامەکانی فەلسەفە و ئایینە وەك ئەوەی خۆیان بانگەشەی بۆ دەکەن و دەیانەوێت، نەك وەك ئەوەی بڕواداران و ڕۆشنگەراکان بەرجەستەی دەکەن.

هەڵبەت ئەم جۆرە دید و تێڕوانینەیان، گوزارشت لە بوونی ڕاستەقینەی ئەم دووانە دەکات. بە واتایەکی تر، دیدگای یەکەم مومارەسەکردنی ئایین و فەلسەفەیە بە ستایل و فۆڕمی سروشتیی خۆیان، دوور لە هەر جۆرە خستنەڕوو و بەکارهێنانی هەر ماسکێك کە لەدەرەوەی پەیام و ئامانجە ڕاستەقینەکانیان بێت.

ئەم دیدگایە ئینتیمای بۆ هیچ بۆچوون و ئایدۆلۆژیا و هزر و ڕێبازێك نییە، كە بشێت كاریگەریی نەرێنیی هەبێت لەسەر نرخ و بەهای ڕاستەقینەی فەلسەفە و ئایین.

ئەم دیدگایە لە ڕووە فەلسەفی و لۆژیكییەكەوە پەیوەست نییە بە تیۆر و بۆچوونی ڕەوتێكی ڕۆشنگەریی دیاریكراو، هەڵگری پاشخانی ڕێبازێكی تایبەت نییە، وابەستەی هیچ سەردەم و كاتێكی دیاریكراوی مێژووی فەلسەفە و هزری مرۆڤایەتی نییە، تەنانەت هۆگری كەسایەتی و كارەكتەرە باو و دیارەكانی ئەو بوارەش نییە.

هەڵبەتە ئەمە بەو واتایە نایەت كە ئەم دیدگا و بۆچوونە تەواو دۆگما و دابڕاوە لەو ئامراز و كارەكتەرانەی كە پێویستە ڕۆڵیان هەبێت لە هەر توێژینەوە و بۆچوونێكی فیكری و فەلسەفیدا، چونكە نالویێ دیدێكی لۆژیكی و عەقڵانی بخەینە ڕوو كە كاریگەریی هیچ ڕەوت و ڕێبازێكی فەلسەفی و ژینگە و كات و ساتێكی دیاریكراوی لەسەر نەبێت، بەڵكو ئێمە دەمانەوێت بڵێین كە ئەم دیدگایە وێڕای ڕەچاوكردنی توراسی مرۆڤ و ژینگە جیاوازەكانی مەیدانی فیكر و فەلسەفە، تەنها و تەنها هەڵقوڵاوی ئەو دەق و تێكستانەیە كە گوزراشت لە هەقیقەتی فەلسەفە و ڕۆشنگەری دەكەن.

هەرچی تایبەتە بە ڕووە ئایینی و ئایدۆلۆژییەكەوە، ئەم دیدگایە ڕوانینێكی گشتی و ڕەهای هەیە بۆ تێكستە ئایینییەكان، گشتی بەو مانایەی كە تەنها لە سووچێكەوە شیكاری دەق و پرسە ئایینییەكان ناكات، بەڵكو ئایین وەك چەمكێكی گشتی دەخاتە بەر توێژینەوە و كۆی پرس و بابەتەكانی ئایین دەخاتە بەر باس و لێكۆڵینەوە، دواتر لە دەرئەنجامی ڕوانینێكی گشتی بڕیار لەسەر شێواز و فۆڕمی تایبەت بە ئایین دەدات.

ڕەهاش بەو واتایەی کە وابەستەی ڕێباز و ڕەوتێکی دیاریکراوی ئایدۆلۆژیا و بیروباوەڕی ئایینی نییە، بەڵکو کۆی ڕەوت و تیۆرە ئایینییەکان دەخاتە خزمەت شیکارکردنی خودی تێکست و توراسە ئایینییەکان.

بەگشتی، دیدگای یەکەم بە هەردوو لقە فەلسەفی و ئاینییەکەیەوە تەقدیسی تێکست و سەرچاوە تایبەتەکانی فەلسەفە و ئایین دەکات، لەبەرامبەردا کەسایەتی و ڕێباز و ڕەوتە ئایدۆلۆژی و فەلسەفییەکان تەنها ڕۆڵی شیکردنەوە و یارمەتیدانی تاکیان هەیە بە مەبەستی تێگەیشتن لە خودی دەقەکان، وەك دەوترێت لەم بۆچوونەدا پێگەی دەق و پرەنسیپەکان لەسەرووی ڕێز و شکۆی کەسایەتییەکانە.

ئەگەر ڕاست بێت ئایین و فەلسەفە دابەشی بواری تیۆری و پراکتیکی بکەین، ئەم دیدگایە گوزارشت لە بەشە تیۆرییەکەیان دەکات، کە تەنها لێکدانەوە بۆ فۆرم و میتۆدی ئایین و فەلسەفە دەکات و خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانیان دەخاتە ڕوو، لە ئەگەری بانگەشەکردنیش بۆ بەکردارکردن و پراکتیککردنی فەلسەفە و ئایین، ئەوا لەسەر ئەو شێوازە سروشتییە دەیانخاتە ڕوو کە خۆیان پێوەی دەرکەوتوون.

گومان لەوەدا نییە کە هەر ڕەخنەیەك لەسەر بنەمای ئەم جۆرە دید و تێڕوانینە بهێتە ئاراوە، جێگەی ئەرگۆمێنتکردن و گفتوگۆ لەسەر کردنن، تا ڕادەیەکی زۆریش لۆژیکی و مەقبوڵن، چونکە لەسەر بنەمای دەق و تێکستە ئایینی و عەقڵییەکان خراونەتە ڕوو، بەڵام مەرج نییە هەموو ڕەخنەکان ڕاست و ڕەوا بن.

**دیدگای دووەم :**

بریتییە لە خستنەڕووی ئایین و فەلسەفە بەپێچەوانەی بوون و سروشتی ڕاستەقینەی خۆیان، ئەم دیدگایە زیاتر پەیوەستە بە جۆری ئەو فۆڕمەی کە فەلسەفە و ئایینیان تیادا دەخرێتە بواری جێبەجێکردن، واتە بەشە کرداری و پراکتیکییەکەی ئایین و عەقڵ و فەلسەفە دەگرێتەوە.

هەڵبەتە فەلسەفە و ئایین خاڵی نین لە لایەنی کرداری و پراکتیکی، بەڵام ئەوەی جێگەی هەڵوەستە لەسەر کردنە، جۆر و شێوازی ئەو میتۆدەیە کە هەوڵ دەدرێت ئایین و فەلسەفە تیایدا مومارەسە و بەرجەستە بکرێن.

ئەم دیدگایە زیاتر کار لەسەر ڕەوت و ڕێباز و تیۆرە فەلسەفی و ئایینییەکان دەکات و لێکدانەوەی ئەوان بۆ فەلسەفە و ئایین دەخاتە سەرووی خودی دەق و تێکستە ئایینییەکان. ڕوونتر بڵێین، لەم جۆرە دید و بۆچوونەدا کەسایەتی و بیردۆزەکانیان تەقدیس دەکرێن، خودی ئایین و فەلسەفە دەخرێنە خزمەت پارت و ڕێبازە ئایدۆلۆژی و فیکرییەکان، تەواو پێچەوانەی دیدی یەکەمە.

زۆرترین ئەو ڕەخنانەی ئەم دیدە بەرەوڕووی ئایین و فەلسەفەیان دەکاتەوە نالۆژیکین، چونکە ڕەخنەکان لەبری ئەوەی لەسەر خودی ئایین و عەقڵ بونیاد نرابن، کردەوەی بڕواداران و ڕۆشنگەراکان کراوەتە پێوەری ڕەخنەگرتن لە ئایین یان لە عەقڵانیەت، کە بەم کردارەیان زۆرترین ستەم لەم دووانە دەکەن، بە هۆی ئەوەی هەندێك ڕەخنەیان ئاڕاستە دەکەن کە لە بنەڕەتدا پێویستە لەسەر شوێنکەوتووەکانیان هەژمار بکرێت، نەك خودی خۆیان.

تا ئێرە ڕوونە کە ئایین و فەلسەفە دوو جەمسەریان هەیە، چ لە خودی خۆیاندا چ لە دیدی پەیڕەوکارانیاندا، لە خودی خۆیاندا خاوەن جەمسەرێکی تیۆری و جەمسەرێکی پراکتیکین، لە دیدی هۆگرانیشیاندا خاوەن جەمسەرێکی سروشتی و جەمسەرێکی ناسروشتین.

ئەوەی ئێمە دەمانەوێت قسەی لەسەر بکەین، خودی تێکست و دەقە ئایینییەکان و خودی عەقڵ و فەلسەفە نین کە جۆرێکیان تیۆری و جۆرێکیشیان پڕاکتیکین، بەڵکو ئێمە قسە لەسەر میتۆدی خستنەڕووی ئەو دەقانە دەکەین، ئاخۆ بە شێوازێکی سروشتی خراونەتە ڕوو وەك ئەوەی خۆیان هەن؟ یان جۆرێك لە ناسروشتییان پێوە بەدی دەکرێت و بەپێچەوانەی پەیام و ئامانجە سەرەکییەکانی خۆیان جیبەجیٚ کراون؟

هەڵبەتە بۆ بەدەستخستنی وەڵامێکی دیاریکراوی پەیوەست بەم پرسە، پێویستە لە سەرەتادا ئامانجی ڕاستەقینەی دەق و تێکستە فەلسەفی و ئایینییەکان بخەینە ڕوو، بەو پێیەش کە ئایین لە ڕێگەی عەقڵەوە شیکار دەکرێت، سەرەتا قسە لەسەر میتۆدی فەلسەفە دەکەین، دواتر میتۆدی ئایین دەخەینە ڕوو.

لە بنەڕەتدا دەق و تێکستە فەلسەفییەکان، میتۆدێکی لۆژیکی و عەقڵانی مرۆڤن لەهەمبەر ئاریشە ئەندێشەیی و سیاسی و ئایینی و کۆمەڵایەتی و پەروەردەییەکانی کۆمەڵگە، هەمیشە بەرەو ئاڕاستەی سەروەربوونی مرۆڤ و زاڵبوون بەسەر کێشە مرۆڤایەتییەکاندا هەنگاو دەنێن، مەغزای دەقەکان فەراهەمکردنی ئارامی و تێرکردنی غەریزەی زانینییە لە مرۆڤدا. بەگشتی فەلسەفە فۆڕمێکی مرۆڤانەیە بۆ خستنەڕوو و چارەسەرکردنی پرسە پەیوەندیدارەکانی پەیوەست بە ژیانی مرۆڤ بەبیٚ جیاوازی.

ئیتر بەدەر لەمە، فەلسەفە هەرگیز ئەرگۆمێنت و شیکاری پرسێك ناکات کە بخزێتە دەرەوەی چێوارچێوەی بەرژەوەندییەکانی مرۆڤ، هەرگیز  توانای خۆی لە کایەیەکدا ناخاتە گەڕ کە کایەی مرۆڤ نەبێت یان لە خزمەت بەرژەوەندییە تیۆری و پراکتیکییەکانی مرۆڤدا نەبێت.

لەم پێناوەدا بە درێژاییی مێژووی هزر و فەلسەفە عەقڵی دروست و فەلسەفەی ڕاستەقینە، هیچ کات نەچوونەتە ژێر باری هێزی هیچ هزر و بۆچوونێك کە میتۆد و

فۆڕمێکی ئەنتی مرۆڤانەیان هەبێت، یان هەڵگری خەسڵەتێکی نامرۆڤانە بن، چونکە یاسا فەلسەفی و لۆژیکییەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ناکرێ بانگەشە بۆ شتێك بکەیت و پێچەوانەکەی ئەنجام بدەیت.

بەو پێیەش کە پەیام و ئامانجی عەقڵ و فەلسەفە لەپێناو مرۆڤ و دۆزەکانیدایە، ناکرێت کارێکی نامرۆڤانە ئەنجام بدەن، یان هەوڵی کارێك بدەن دژی خواست و داواکارییەکانی مرۆڤ بێت، چونکە ئەوکات عەقڵ و فەلسەفە دژی خودی ئامانج و پەیامەکانی خۆیان دەوەستنەوە و کارێکی نالۆژیکی ئەنجام دەدەن.

لەبەرامبەردا، ئایینی ئاسمانی بەرنامەیەکی خواییە بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لەژێر سایەی سرووش (وەحی)ی خودا و لێکدانەوە عەقڵی و فەلسەفییەکانی خودی مرۆڤدا، بەو پێیەش بێت ئایین میتۆدێکی تێکەڵی هەیە کە خۆی لە دەق و تێکستە موقەدەسەکانی خودا و لێکدانەوە و شیکارییە عەقڵانی و لۆژیکییەکانی خودی مرۆڤدا دەبینێتەوە.

بەڵام یەك ڕەهەندی میتۆدی فەلسەفە (کە میتۆدێکی مرۆڤانەیە)، لەبەرامبەردا دووانەیی میتۆدی ئایین (کە میتۆدێکی خودایی و مرۆڤانەیە)، نابێتە هۆی جیاوازیی ئامانجەکانیان، چونکە فەلسەفە بە فۆڕم و شێوە عەقڵانی و لۆژیکییەکەی خۆی هەوڵی بارگاویکردنی مرۆڤ دەدات لە گۆشەنیگای زانست و بەختەوەری، لەبەرامبەردا ئایین بە میتۆدێکی خوداییانە و لەژێر سایەی عەقڵ و هزری فەلسەفیی مرۆڤدا بە هەمان شێوە بەرەو ئاڕاستەی خزمەتکردن و سەروەربوونی مرۆڤ و لەنگەرگرتنی لەکەناری ئارامیدا هەنگاو دەنێت.

ئیتر ئاساییە کە ئایینیش بە درێژاییی مێژووی خۆی لە دووتوێی دەقەکانیدا جگە لە خزمەتکردنی مرۆڤ، بونیادی هیچ تیۆرێکی نەکردووە کە هەڵگری ناوکێکی نامرۆڤانە بێت، هەمیشە ئەرگۆمێنت و بەرسڤەکانی لەپێناو بونیادنانی مرۆڤی ڕاستەقینە بووە، ئەوەشی کە مۆرکێکی ئایینی پێوە لکێنراوە و دژ بە خواست و

بەھا مرۆییەکان خراوەتە کار، لە ڕاستیدا کەم تا زۆر پەیوەندیی بە خودی دەق و سروشتی ئایینەکانەوە نییە، بەڵکو لێکدانەوەیەکی هەڵە و بەکارهێنانێکی ناتەندروستی ئایینە لەپێناو مەرامێکی تایبەت.

بە گەڕانەوە بۆ دەقەکانی قورئانی پیرۆز کە کۆکەرەوەی کۆی ئایینە ئاسمانییەکانە، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئایین میتۆدێکی مرۆڤانەی هەیە بە هەمان چەشنی عەقڵ و فەلسەفە و لۆژیك، بێگومان ئەم مرۆڤبوونەی میتۆدی ئایین لە چەند گۆشەیەك بەرجەستە کراوە، لەوانە:

١- بوونیادی بوونەوەر خراوەتە خزمەت بەرژەوەندییەکانی مرۆڤ، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ﴾[١]. واتە: "هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بۆ ئێوەی ڕام هێناوە، بۆ خزمەتگوزاریی ئێوە فەراهەمی هێناوە، هەمووشی تێکڕا بەخششن لەلایەن ئەو زاتەوە، بەڕاستی ئا لەم بەخشش و دیارییانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێك کە بیر بکەنەوە و تێ بفکرن."

٢- ئایین گەرەکیەتی فۆڕمێکی ئاسان بۆ ژیانی مرۆڤەکان دروست بکات و تەوژم و کاریگەریی خراپ لەسەر توانای مرۆڤەکان لا بدات، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ﴾[٢]. واتە: "خودای گەورە ئاسانکاریی بۆ ئێوە دەوێت، نایەوێت پەرستش و فەرزەکانتان لەسەر قورس و گران بکات."

٣- خودی بیری ئایینی وابەستەی تواناکانی مرۆڤ کراوە، کە ئەمەش مۆرکێکی مرۆڤانەی تایبەتە، هەر بۆیە مرۆڤ هەرگیز ئاڕاستەی کارێکی ئایینی ناکرێت کە

---

(١) سوورەتی (الجاثية)، ئایەتی: (١٣).

(٢) سوورەتی (البقرة)، ئایەتی: (١٨٥).

لەسەرووی ئاست و توانای خۆی بێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَا ﴾[(١)]. واتە: "خوای گەورە ئەرك ناخاتە سەر هیچ کەسێك، مەگەر بەقەدەر توانای خۆی نەبێت."

٤- سەرئەنجام سەرتاپای ئایین بۆ ڕۆشنکردنی ژیانی مرۆڤ و ڕزگارکردنیەتی لە زەلکاوی جەهالەت و شەوەزەنگی گومڕایی، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ الٓرۚ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ لِتُخۡرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِ رَبِّهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ﴾[(٢)]. واتە: "ئەلیف، لام، میم، ئەم قورئانە کتێبێکە دامانبەزاندووە بۆت ئەی موحەمەدﷺ، تا خەڵکی لە تاریکییەکانی بێباوەڕی و نەزانی و سەرلێشێواوی دەربهێنیت بەرەو نوور و ڕێبازی ڕۆشناییی ئیمان بە ویستی پەروەردگاریان، تا دەگەنە ڕێبازی ڕاستی خوای باڵادەست و شایستەی سوپاسگوزاری."

کەواتە ئایین و فەلسەفە خاوەن مۆرکێکی مرۆڤانەی سروشتین، بۆیە بەکارهێنانی هەر میتۆدێکی عەقڵانی و فەلسەفی یان هەر فۆڕمێکی ئایدۆلۆژی و ئایینی بەدەر لە میتۆد و فۆڕمە مرۆییەکە، بەکارهێنانی فەلسەفە و ئایینە بەپێچەوانەی سروشت و هەقیقەتی خۆیان. بێگومان تێگەیشتن لە ڕووە تیۆرییەکەی ئایین و فەلسەفە، کاریگەریی ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر چۆنێتیی بەرجەستەکردنی ئایین و فەلسەفە لەسەر ئەرزی واقیعدا.

هەڵبەتە ئێمە ئەوەمان خستە ڕوو کە ئایین و فەلسەفە لە ڕووە تیۆرییەکەوە دوو چەمکن، کە خاوەن میتۆد و فۆڕمێکی مرۆڤایەتین، واتە هەردووکیان لەپێناو

---

(١) سوورەتی (البقرة)، ئایەتی: (٢٨٦).

(٢) سوورەتی (إبراهیم)، ئایەتی: (١).

هێنانەدی بەرژەوەندییەکانی مرۆڤ تێدەکۆشن و هەوڵ دەدەن مرۆڤ لە نەهامەتی و لەناوچوون دوور بخەنەوە.

بەڵام تێگەیشتنی مرۆڤەکان بۆ دەق و توراسی ئایین و فەلسەفە، تێگەیشتنێکی ناسروشتییانەیە و دەکەوێتە ژێر جۆری دووەم لەو دوو جۆرە دید و بۆچوونانەی کە بەرامبەر بە ئایین و فەلسەفە خستنمانە ڕوو، بۆیە بەرجەستەکردنی ئەو دووانەش لەسەر ئەرزی واقیعدا، بەرجەستەکردن و مومارەسەکردنێکی ناسروشتییانەیە.

ئا لێرەوە مرۆڤەکان دەکەونە بەر ئاهی فەلسەفە و نەفرەتی ئایین، چونکە ئەو شێواز و فۆڕمانەی کە ئێستا ئایین و فەلسەفەیان تیادا دەخرێتە ڕوو و دواتر لەژێر سایەیاندا مومارەسەی دەق و تێکستەکانیان دەکرێت، بەشێکیان تەواو نامرۆڤانەن و پێچەوانەی سروشت و فۆڕمی ڕاستەقینەی فەلسەفە و ئایینن.

بە بۆچوونی ئێمە –دەشێت زۆر کەس هاوڕا نەبن لەگەڵمان– هەموو ئەو نەهامەتییانەی کە دووچاری مرۆڤ دەبنەوە لەسەر بنەمای فەرزکردنی ئایین و تەوژمی فیکرین، هەموو ئەو لێکەوتە خراپانەشی کە ئێستا درکی پێ دەکەین و مرۆڤایەتی پێی دەناڵێنێت، لە ڕاستیدا ناگەڕێتەوە بۆ دژایەتیی نێوان ئایینەکان یان هزر و فەلسەفەکان، بەڵکو تەنها خراپ لێحاڵیبوونە لە پەیامی ئایینەکان و بە هەڵە تێگەیشتنە لە بەها و پڕەنسیپە عەقڵی و لۆژیکییەکان، چونکە هەرگیز خودی عەقڵ و فەلسەفە و ئایین نابنە سەرچاوەی زیان بۆ مرۆڤ، بەڵکو خراپ سوودبینینی مرۆڤ لەو دووانە، هۆکاری کێشەکانە.

ڕاشکاوانە بڵێین، کێشەکان لە بنەڕەتدا هی تێروانینی بڕواداران و ڕۆشنگەراکانە، بەڵام دوا جار مرۆڤایەتی ئۆباڵی ئەم کێشانە دەخاتە ئەستۆی خودی ئایین و عەقڵ، کە ئەمەش دژوارترین ستەمە کە لەو دووانە دەکرێت، بۆ نموونە: دەمارگیریی ئایینی و خراپ سوود بینین لە ئایدۆلۆژیا و بیروباوەڕ، ئێستا لە جیهاندا فاکتەرێکە

بۆ ئەوەی هەزاران مرۆڤی بێتاوان ببنە قوربانی، وەك ئەوەی لە بەشێك لە وڵاتانی جیهان ڕوو دەدات.

هەروەك بە هەڵە ڕاڤەکردن و تێگەیشتن لە دەقەکانی قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ، جارێکی تر بووەتە هۆکاری بەرجەستەکردن و مومارەسەکردنێکی خراپی ئایین لەلایەن چەندین گرووپ کە بە هۆیەوە هەزاران کەسی بێتاوان بوونەتە قوربانی.

تەنانەت زۆرینەی ئەو جەنگ و کوشتارانەی مرۆڤ دووچاریان دەبێتەوە، لە سایەی عەقڵی ئەو مرۆڤانەوەیە کە بۆ سەپاندنی ئایدیا و لۆژیکی خۆیان گاڵتە بە مرۆڤایەتی دەکەن و هۆکارن بۆ پەرتەوازەبوونی کۆمەڵگاکان و لەناوچوونی گیانی هەزاران کەس.

بەڵام مرۆڤایەتی بەگشتی ئەم کێشە و ڕەخنانە ڕووبەرووی ئایین و عەقڵ دەکاتەوە و ئەم دووانە بە هۆکاری ڕاستەوخۆی ئەو کێشانە دەزانن، کە لە ڕاستیدا ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هەموو فۆڕمەکانی ئایین و عەقڵ –کە لە سەرەتادا ئاماژەمان پێی دا– بە یەك چاو هەژمار دەکەن و جیاوازیی نێوان ئایین و ئایینداری و عەقڵ و عەقڵداری ناکەن.

بۆیە ئەو ڕەوشەی کە لە واقیعدا هەستی پێ دەکرێت، تەواو پێچەوانەی ئایین و فەلسەفەیە لە ڕووە تیۆرییەکەیەوە، بە جۆرێك کە پەیامی عەقڵ و فەلسەفەو ئایین دژ بە خواست و ئامانجەکانی مرۆڤ خراونەتە کار، لە کاتێکدا عەقڵ و ئایین لەم کارە بێبەرین.

بۆ ڕزگاربوونیشمان لە ئاهی فەلسەفە و نەفرەتی ئایین –کە شتێکی حەتمین ئەگەر مرۆڤایەتی بەم شێوەی ئێستا بەردەوام بێت– پێویستە لەسەرمان فۆڕمی تێگەیشتنمان بۆ ئایین و فەلسەفە سروشتی بکەینەوە، ئەوکات جێبەجێکردن و مومارەسەکردنی ئایین و فەلسەفەش ڕێگەی سروشتی خۆی وەردەگرێت،

دەرئەنجام مرۆڤ لەژێر هەژموون و سایەی دەقەکانی ئایین و تێکستەکانی فەلسەفە ژیانێکی سروشتی و ئاسوودە بۆ خۆی و نەوەکانی داهاتووی دێنێتە کایەوە، بێگومان ئەم ئەرکەش لە ئەستۆی زانایانی ئایینی و پسپۆڕانی بیروباوەڕ و شەیدایانی هزر و فەلسەفەدایە.

# بەشی چوارەم
# فەلسەفە و ئایین

ئایین و هزر و مرۆڤ، سیانەیەکی لەیەك گرێدراون، هەوڵدان بۆ پەراوێزخستنی هەر کامێکیان، جۆرێکە لە خودکوژی. لە هەر شوێنێك ئایین هەبێت، پێویستە هزر و ئەندێشەش بوونیان هەبێت، هزر و فەلسەفەی ڕاستەقینەش بە بوونی ئایین بەرجەستە دەبن، دوا جار مانای بوونی مرۆڤایەتییش ئەو کاتە کامڵ دەبێت کە ئەم دووانە ئاوێتەی یەکتر دەبن. ئەم حاڵەتە وێنە و سیمای ڕاستەقینەی ئایین و عەقڵە، بەڵام ئەوەی مرۆڤە ئایدۆلۆژی و بیرمەندەکان بەرجەستەی دەکەن، تەواو پێچەوانەی ئەم تابلۆیەمان نیشان دەدات، بە جۆرێك کە عەقڵ دژی ئایین و ئایینیش بە دژی عەقڵ و لۆژیکی مرۆڤایەتی دەخەنە ڕوو.

ئەو ڕقەبەرایەتی و دژایەتییەی ڕۆشنگەراكان بە ناوی بیری هاوچەرخ و ڕەوتی عەقلانیەت دژی ئایین و ئایدۆلۆژیا ئاسمانییەكان وێنایان كردووە و بەردەوام بە گوێی خەڵكیدا دەیلێنەوە، یەكێكە لە گەورەترین ئەو نەهامەتییانەی كە بەناڕەوا بەسەر فەلسەفەدا سەپێنراوە، كە بە هۆیەوە بیرمەندەكان لەبری سوودگەیاندن بە بزوتنەوەی عەقلانیەت و ڕۆشنگەری و زیادكردنی ڕێژەی مرۆڤە هزرمەندەكان، بوونەتە فاكتەری ناشیرینكردنی عەقڵ و لۆژیك و بیرمەندە ڕاستەقینەكانی بواری ڕۆشنگەری.

ئەگەر سەرنج بدەینە سروشت و پێكهاتەكانی فەلسەفە، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە كە هیچ كات فەلسەفە دژی ئایین نەبووە، دوا جار ئەو دژایەتییەی كە بەهەڵە دروست كراوە، بووەتە هۆی ئەوەی كە زیانێكی ئێجگار گەورە بەر ڕەوتی فەلسەفە و عەقلانیەت بكەوێت، چونكە مرۆڤە ئایینداره‌كان بە هۆی ئەم تێڕوانینەوە ڕقوكینەیەكیان بەرامبەر بە فەلسەفە و لۆژیك و عەقلانیەت بۆ دروست بووە و كەمتر بە بنەما و پرەنسیپە لۆژیكی و فەلسەفییەكان ڕازی دەبن.

بێگومان جەوهەری فەلسەفە لەسەر بنەمای عەقڵ و لۆژیكی مرۆڤایەتی هاتووەتە كایەوە، بەو پێیەش بێت كرۆكی فەلسەفە عەقڵە، بێگومان ئەكتیڤیتی و چالاكییەكانی عەقڵ و ئاوەزی مرۆڤیش پەیوەندییان بە ئاڕاستەكردنی مرۆڤەوە هەیە بەرەو كەناری ئارامی و ڕاستی. ڕوونتر بڵێین، كاری عەقڵیش ئاشكراكردنی ڕاستییەكانە بۆ مرۆڤ، بۆیە ئەگەر عەقڵ بنەمای فەلسەفە بێت و كاری عەقڵیش ڕوونكردنەوەی ڕاستییەكان بێت بۆ مرۆڤ، ئەوا بە هیچ جۆرێك فەلسەفە و ئایین دژی یەكتر نین، دوا جار ئەو وێناكردنەی دژایەتیی نێوانیان وێناكردنێكی هەڵەیە و لە بەرژەوەندیی ڕەوتی عەقلانیەت و فەلسەفەدا نییە.

چونكە لە ڕاستیدا ئایینیش هەمان ئەو میتۆدە دەخاتە نێو پرەنسیپ و بنەما مرۆڤایەتییەكانی خۆی و بەرگری لەم جۆرە چالاكییانە دەكات، واتە ئایینیش

بەرگری لە بەدواداگەڕان و لێکوڵینەوە دەکات بە مەبەستی گەیشتن بە ڕاستی و هەقیقەت، ئەوەتا قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ ﴾[1].

واتە: "ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەر کەسێکی لەفەرماندەرچوو و متمانەپێنەکراو هەواڵێکی گرنگی بۆ هێنان، خێرا بڕوای پێ مەکەن، بەڵکو سەرنج بدەن، لێی بکۆڵنەوە تا بۆتان ڕوون دەبێتەوە، نەوەکو ئازار و ناخۆشی و گێروگرفت بۆ خەڵکی دروست بکەن بەنەزانی، جا دوایی پەشیمان ببنەوە لەو کارەی کە پێی هەڵساون."

ڕاڤەکارانی قورئانی پیرۆز لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەفەرموون: "مەبەست لە وشەی (فتبينوا)، ئاشنابوون و بەدواداگەڕان و لێکۆڵینەوەیە لەو کارەی کە هاتووەتە پێش، بۆ ئەوەی ڕوون ببێتەوە[2]."

تەوراتیش فەرمان بە جوولەکەکان دەکات بۆ گەیشتن بە هەقیقەت و ڕاستیی شتەکان، پرسیار لە کەسی پسپۆڕ بکەن کە پیاوانی ئایینن، وەك دەڵێت: "هكذا قال رب الجنود إسأل الكهنة عن الشريعة[3]."

واتە: "بەم جۆرە سەرکردەی سەربازەکان گوتی: دەربارەی ئایین پرسیار لە پیاوانی ئایینی بکەن."

کەواتە ئایینیش داوای هەمان ئەو کارە دەکات کە فەلسەفە داوای دەکات، کە ئەویش لێکۆڵینەوە و تێکۆشانە بە مەبەستی زێتر دڵنیابوون و گەیشتن بە هەقیقەت و ڕاستی.

---

(١) سوورەتی (الحجرات)، ئایەتی: (٦).

(٢) بڕوانە: فتح القدير: الشوكاني: (٧١/٥).

(٣) سفری حەجی: (١١/٢).

ئەو بانگەشەیەی بەشێك لە بیرمەندان و ڕۆشنگەراکانی ئەمڕۆ دەیکەن و هەوڵ دەدەن فەلسەفە وەك نەیار و دوژمنی ئایین بخەنە ڕوو، ئەگەر ئەم بانگەشەیان تۆزقاڵێك ڕاستی و هەقیقەتی لۆژیکی و فەلسەفی هەبووایە، دەبووایە زۆرینەی فەیلەسووف و بیرمەندانی سەدە زێڕینەکانی فەلسەفە و لۆژیك دژی ئایین بووان و زۆرترین ئەرگۆمێنت و گفتوگۆ و بەرهەمە فەلسەفییەکانی خۆیان بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو دژایەتییە تەرخان کردبا.

بەڵام ئەوەی لە مێژووی کۆن و هاوچەرخی فەلسەفە و ڕۆشنگەری بەدی دەکرێت، تەواو پێچەوانەی ئەم گریمانەیە، بە جۆرێك کە بەشێك لە کاراکتەرە فەلسەفی و کەسایەتییە هەرە گەورەکانی ڕەوتی ڕۆشنگەری و عەقڵانیەت نەك هەر دژی ئایین نەبوون، بەڵکو پیاوی ئایینییش بوون، زۆرینەشیان نەك هەر ڕەخنەیان لە ئایین نەگرتووە، بەڵکو بەشێکی هەوڵ و کۆششەکانیان بریتی بووە لە دوورخستنەوەی ئایین لەو ئەفسانە و دەق و تێکستە ئەفسووناوییانەی کە بە ئایینەوە لکێنراون و لە ڕاستیدا پێچەوانەی سروشت و ژینگەی ڕاستەقینەی ئایینن و کاریگەریی خراپیان هەیە لەسەر پێگەی ئایین.

ڕێژەیەکی زۆری ئەو فەیلەسووفانەی کە تا ئێستاش کاریگەرییان لەسەر ڕەوتی عەقڵانیەت و ڕۆشنگەریی ئەورووپا و وڵاتانی ئیسلامی هەیە، کتێبیان دەربارەی ئایین نووسیوە، ڕەنگە بەشێکی کتێبەکان ڕەخنەیی بن، بەڵام لە ڕاستیدا ڕەخنە نین لە خودی ئایین خۆی، بەڵکو ڕەخنەن:

١- لەو ناوەند و دەزگایانەی کە ئەرکیان پەخشکردن و بڵاوکردنەوەی ئایینە، بەتایبەت کڵێسا و پیاوانی ئایینی مەسیحی.

٢- لەو کاروکردەوە ناشیرینانەی کە بەهەڵە و بە شێوازێکی ناتەندروستانە بە ناوی ئایین ئەنجام دەدرێن و مۆرکێکی ئایینییان پێوە دەلکێنرێت.

٣- یانیش بەتایبەتی ڕەخنەبوون لە خودی پەرتووکی پیرۆز -تەورات و ئینجیل- کە چەندین پرس و بابەتیان تێ خراوە کە نە لەگەڵ پرەنسیپ و بەها عەقلانییەکان دەگونجێن، نە لەگەڵ بەها و یاسا ئایینییەکان دەگونجێن.

٤- هەندێك جاریش ڕەخنەکان فۆڕمێکی ڕەهایان هەبووە و لەسەر بنەمای ئایینێکی دیاریکراو بووە، کە دەشێت ئەو ڕەخنانە بۆ هەموو ئایینێك دروست نەبن، بەتایبەت ئایینی پیرۆزی ئیسلام، کە سەرتاپای پرەنسیپەکانی مۆرکێکی عەقلانی و لۆژیکیی بەرچاویان پێوە دیارە.

فەیلەسووفی بەناوبانگی ئەڵمانی (ئیمانوێل کانت) کە بە باوکی فەلسەفەی نوێ دادەنرێت، یەکێکە لەو فەیلەسووفانەی کە زۆرترین کاریگەریی هەیە لەسەر هزری فەلسەفی و ڕەوتی عەقلانیەت لە تەواوی جیهاندا، ئەم کەسایەتییە بەشێکی زۆری نووسینەکانی تایبەت کردووە بە توێژینەوە دەربارەی ئایینی مەسیحیەت و کلێسا، بەتایبەت کتێبە نایابەکەی (الدين في حدود مجرد العقل).

ئەگەر ئایین و فەلسەفە دژی یەك بووان، دەبووایە ئەم فەیلەسووفەش بەو پێیەی عەقلێکی ناوازەی مرۆڤایەتیی هەیە و باوکی فەلسەفەی نوێیە، دژایەتیی خۆی بۆ ئایین بخستبایەتە ڕوو.

بەڵام لە ڕاستیدا ئەم فەیلەسووفە نەك هەر دژایەتیی ئایین ناکات، بەڵکو زۆرترین هەوڵ دەدات تا ئەوە بخاتە ڕوو کە پەرتووکی پیرۆز -تەورات و ئینجیل- لەگەڵ پایە و بنەما فەلسەفی و عەقڵییەکان دەگونجێت، بۆیە لێکدانەوە و خستنەڕووەکانی بەرەو ئەو ئامانجە دەڕۆن کە:

١- پێویستە پەرتووکی پیرۆز بخوێنرێت، بەڵام فەرز نەکرێت لەسەر گرووپە ئەخلاقی و بڕوادارەکان[1]، ئەمەش نزیکە لەو ئایەتە قورئانییەی کە دەفەرموێت: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ ﴾ [1].

(١) بڕوانە: الدين في حدود مجرد العقل: كانت: (٢١٥).

واتە: "بە هیچ جۆرێك زۆرکردن نییە لە وەرگرتنی بیروباوەڕی ئایینی ئیسلامدا، چونکە بەڕاستی ڕێبازی چاك و دروست، ڕوون و ئاشکرا بووە و جیا بووەتەوە لە گومڕایی و سەرکەشی."

٢- فەلسەفە و ئایین لە ڕووی ناوەرۆك و بابەتەوە هاوتان، کە مەبەستی ئەوەیە هەردووکیان گرنگی بە خودا و مرۆڤ و حەق دەدەن[٢].

٣- فەلسەفە ئامرازی تێگەیشتنە لە ئایین، بۆیە جیاوازیکردن لەنێوان ئایین و فەلسەفە و نیشاندانی فەلسەفە وەك چەمکێك کە دژی خوداناسین و وەرع و تەقوایە، هەوڵێکی بێبەرهەمە و بە هیچ شێوەیەك دانی پێدا نانرێت[٣].

٤- هەماهەنگی و یەکگرتوویی کتێبی پیرۆز ( تەورات و ئینجیل) لەگەڵ عەقڵ و فەلسەفە، بە چەشنێکە کە هەر کەسێك دوای یەکێکیان بکەوێت، ئەوەی تریش دەدۆزێتەوە[٤]، بەو مانایەی لە هەر شوێنێك عەقڵ هەبێت، ئایین هەیە و لە هەر شوێنێکیش ئایین هەبێت، عەقڵ هەیە.

بەهەمان شێوە، فەیلەسووفی بەناوبانگی ئەڵمانی (هیگڵ)، زنجیرەیەك پەرتووکی دەربارەی ئایین و مێژووی ئایین نووسیوە لەژێر ناونیشانی (محاضرات في فلسفة الدين)، کە وێڕای ئەوەی شیکاری جۆرەکانی ئایین و تێکپڕژانی بەشێکیان لەگەڵ عەقڵ و لۆژیکدا دەکات، بەڵام ئەوە دەخاتە ڕوو کە:

١- ئایین پلەیەکە لە پلەکانی دەرکەوتنی خوای گەورە[٥]، چونکە ئەو پێی وایە هونەر (فن) خودا وەك جەستە و پەیکەرێکی ماددی پیشان دەدات، فەلسەفەش خودا وەك شتێکی ڕەها (مطلق) و ڕۆحی (مثال) پیشان دەدات، واتە تەنها لە هزردا

---

(١) سوورەتی (البقرة)، ئایەتی: (٢٥٦).

(٢) بڕوانە: الدين فی حدود مجرد العقل: كانت: (٥٦-٥٧).

(٣) بڕوانە: الدين فی حدود مجرد العقل: كانت: (٥٤).

(٤) بڕوانە: الدين فی حدود مجرد العقل: كانت: (٥٧).

(٥) بڕوانە: فينومينولوجيا الروح: هيگل: (٦٧١). محاضرات في تاريخ الفلسفة: هيگل: (١٦١و١٩٣).

وێنا دەكرێت و بە هیچ شێوەیەك وەك شتێكی ماددی ناخرێتە ڕوو، بەڵام ئایین لەم نێوەندەدایە هەندێك جار خودا بە شێوەیەك وەسف دەكات كە سیفەتی ماددیی هەبێت، وەك: (دەست و قاچ و چاو)، هەندێك جاریش بە جۆرێكی فیكری و ڕۆحی وەسفی دەكات، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾[1]. واتە: "هیچ شتێك نییە لە وێنەی ئەو زاتە، هیچ شتێك لەو ناچێت، هەر ئەویش بیسەر و بینایە."

٢- هەم ئایین هەم فەلسەفە گرنگی بە خودا دەدەن بۆیە لە ناوەرۆكدا هاوتان[2]، كە ئەمەش هەمان ئەو بۆچوونەی كانتە كە پێی وایە ئایین و فەلسەفە گرنگی بە خودا و مرۆڤ و هەقیقەت دەدەن.

٣- دوا جار فەلسەفە هەرگیز نایەوێت ئایین لەناو بەرێت، چونكە ئایین هەقیقەتە[3].

ئەمە وێڕای ئەوەی كە چەندین فەیلەسووفمان هەیە كە لە جیهاندا تاكو ئێستاش بەرهەمەكانیان جێگەی بایەخن و خـۆیان هەڵگری بیروباوەڕی ئایینی بوون، بەتایبەت ئایینی ئیسلام، وەك: كیندی[4]، فارابی[5]،

---

(١) سوورەتی (الشوری) ئایەتی: (١١).

(٢) بڕوانە: محاضرات في تاريخ الفلسفة: هیگل: (١٤٧-١٤٨).

(٣) بڕوانە: فلسفة الدين: هیگل: (٩٠).

(٤) كیندی: ناوی یەعقوبی كوڕی ئیسحاقی كیندییە، ساڵی (١٨٥ك.) لە شاری كوفە لەدایك بووە و ساڵی (٢٦٠ك.) لە بەغدا كۆچی دوایی كردووە. بە (فەیلەسووفی عەرەب) ناوبانگی دەركردووە، چونكە تاكە فەیلەسووفی عەرەبە كە گرنگیی زۆری داوە بە وەرگێڕانی پەرتووكە فەلسەفییەكانی یۆنان بۆ سەر زمانی عەرەبی. زانا بووە لە زانستەكانی ماتماتیك و مۆسیقا و كەلام و فەلسەفە و هەندەسە و فەلەكناسی. بڕوانە: معجم الفلاسفة: جۆرج طرابيشي: (٥٢٨).

(٥) فارابی: ناوی موحەممەدی كوڕی موحەممەدی كوڕی تەرخانی فارابییە، ساڵی (٢٦٠ك.) لە ناوچەی فارابیی توركیا لەدایك بووە و ساڵی (٣٣٩ك.) لە دیمەشق كۆچی دوایی كردووە. زانستەكانی فەلسەفە

ئیبنو سینا، ئیبنو ڕوشد[1]، ئیبنو خەلــدون[2]، غەزالی[3]، ئیبنو توفەیل[4]،

و ماتماتیك و لۆژیك و موسیقای زۆر بەباشی زانیوە، پێی گوتراوە (مامۆستای دووەم — المعلم الثاني)، ئەوەش بە هۆی ڕاڤە و شیكارییە زۆرەكانی لەسەر بەرهەمەكانی ئەرستۆ كە پێی دەگوترێت (مامۆستای یەكەم— المعلم الأول). بەرهەمی زۆری هەیە، لەوانە: (آراء أهل المدينة الفاضلة، الجمع بين رأي الحكيمين، السياسة المدنية، تحصيل السعادة،)، بڕوانە: سير أعلام النبلاء: الذهبي: (١٥/٤١٦). معجم الفلاسفة: جۆرج طرابيشي: (٤٤٩).

(١) ئیبنو ڕوشد: ناوی موحەممەدی كوڕی ئەحمەدی كوڕی موحەممەدی كوڕی ئەحمەدی كوڕی ڕوشدی ئەندەلووسییە، نازناوی (حەفیدە)، ساڵی (٥٢٠ك.) لە قورتوبە هاتووەتە دونیاوە، ساڵی (٥٩٥ك.) كۆچی دواییی كردووە. زانستەكانی فەرموودە و فەلسەفە و كەلام و ماتماتیك و فیقهی مالیكی خوێندووە. بەرگرییەكی زۆری لە فەلسەفە كردووە و ڕەخنەی توندی ڕووبەڕووی ئیمامی غەزالی كردووەتەوە سەبارەت بە هێرشەكانی بۆ سەر فەلسەفە. بە تۆمەتی دەرچوون لە ئایین، شاربەدەر كراوە و كتێبەكانی سووتێنراون. بەشێك لە بەرهەمەكانی: (بداية المجتهد، تهافت التهافت، فصل المقال، الكشف عن مناهج الأدلة)، بڕوانە: سير أعلام النبلاء: الذهبي: (٢١/٣٠٧). الأعلام: الزركلي: (٥/٣١٨). معجم الفلاسفة: جۆرج طرابيشي: (٢٣).

(٢) ئیبنو خەلدون: ناوی عەبدولڕەحمانی كوڕی موحەممەدی كوڕی موحەممەدی كوڕی خەلدونی ئەشبیلییە، فەیلەسووف و مێژوونووس و كۆمەڵناسێكی ئیسلامییە و دامەزرێنەری فەلسەفەی مێژووە، ساڵی (٧٣٢ك.) لە تونس لەدایك بووە، ساڵی (٨٠٨ك.) لە قاهیرە كۆچی دواییی كردووە. بەشێك لە بەرهەمەكانی: (مقدمة ابن خلدون، رسالة في المنطق، شفاء السائل لتهذيب المسائل)، بڕوانە: الأعلام: الزركلي: (٣/٣٣٠). معجم الفلاسفة: جۆرج طرابيشي: (٢١).

(٣) غەزالی: ناوی موحەممەدی كوڕی موحەممەدی كوڕی موحەممەدی كوڕی ئەحمەدی غەزالییە، ساڵی (٤٥٠ك.) لەدایك بووە و ساڵی (٥٠٥ك.) كۆچی دواییی كردووە. لە زانستەكانی كەلام و فەلسەفە و لۆژیك و فیقه و ئوسوڵ و تەسەوف و عیرفاندا دەستێكی باڵای هەبووە. نزیكەی دوو سەد پەرتووكی هەیە، لەوانە: (تهافت الفلاسفة، مقاصد الفلاسفة، المنقذ من الضلال، المستصفى من علم الأصول). بڕوانە: طبقات الشافعية الكبرى: السبكي: (٦/١٩١). معجم الفلاسفة: جۆرج طرابيشي: (٤٢٩).

(٤) ئیبنو توفەیل: ناوی موحەممەدی كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی عەبدولمەلیكی كوڕی توفەیلە، ساڵی (٤٩٤ك.) لەدایك بووە، ساڵی (٥٨٠ك.) لە مەراكشی مەغریبی كۆچی دواییی كردووە. ئەم فەیلەسووفە بە كتێبی (حي بن يقظان) ناوبانگی دەركردووە، كە تیایدا سەلماندوویەتی چۆن مرۆڤێك بەتەنها لە ڕێگەی

ئیبنو باجە[1]... هتد، هەموو ئەوانە ئەوە دەردەخەن کە لە ڕاستیدا فەلسەفە دژی ئایین نییە، بەڵکو لێکدانەوەیەکی لۆژیکی و جیهانبینییانەی مرۆڤایەتییە بۆ دەق و تێکستە خوداییەکان، بۆیە ئەم بانگەشەیە پێچەوانەی واقیع و هەقیقەتی مێژووی هزری بیرمەندە ناوازەکانی ڕەوتی ڕۆشنگەرییە.

ئەمە بەدەر لەوەی کە بەڵێ بەشێك لە فەیلەسووف و بیرمەندەکانی ڕەوتی ڕۆشنگەری لە کۆی سەردەمەکانی ئەم ڕەوتە دژایەتیی خۆیان بۆ ئایین و ئایدۆلۆژیا ئاسمانی و دەستکردەکان خستۆتە ڕوو و بەشێك لە بەها و پرەنسیپە بەرجەستەکراوەکانی ئایین –جگە لە ئایینە ئاسمانییەکان– لە سەردەمێکی دیاریکراو و لە حاڵەت و گۆشەیەکی دیاریکراودا دژی عەقڵ و هزری مرۆڤایەتی بوون.

سەردەمانێکی زۆر خەڵکی بەیەکەوە لەژێر سایەی بنەما و یاساکانی ئایین و فەلسەفەدا ژیاون، بەبێ ئەوەی هەست بە دژایەتیی نێوانیان بکرێت، ئەوەتا خاوەنی پەرتووکی ( مێژووی فەلسەفەی نوێ)، ئاماژە بەم خاڵە دەکات و دەڵێت: "لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ژیانی مرۆڤ لە زۆربەی لایەنەکان لەلایەن کەنیسەوە دیاری دەکرا، بەردەوامیش فەیلەسووف و بیرمەندەکان لە پیاوانی ئایینی کەنیسە بوون[2]."

---

لێکۆڵینەوە لە گەردوون دەتوانێت بگاتە ئاستی خوداناسی. بڕوانە: معجم الفلاسفة: جۆرج طرابيشي: (٣٠).

(١) ئیبنو باجە: ناوی موحەممەدی کوڕی یەحیای کوڕی سائیغی کوڕی باجەیە، لە کۆتاییەکانی سەدەی پێنجەمی کۆچی لە شاری سەرەقستەی ئەندەلووسی لەدایك بووە و ساڵی (٥٣٣ك.) کۆچی دوایی کردووە. گرنگیی داوە بە زانستەکانی پزیشکی و ماتماتیك و مۆسیقا و ئەدەب و فەلەکناسی. بەناوبانگترین بەرهەمی بریتییە لە (تدبير المتوحد). بڕوانە: معجم الفلاسفة: جۆرج طرابيشي: (١٨).

(٢) تاريخ الفلسفة الحديثة: وليم كلي رايت: (٢٥).

له لایەکی تر کرۆکی فەلسەفە لەسەر بنەمای لێکۆڵینەوە و هەوڵدان بۆ گەیشتن بە ڕاستی سەری هەڵداوە، لەو بوارەشدا فەلسەفە خاوەن میتۆدێکی ڕەها (مطلق)ە، بە واتای ئەوەی هیچ پرس و بابەتێك نییە کە فەلسەفە قسەی تایبەتی تێدا نەبێت، چونکە فەلسەفە جیهانبینیی مرۆڤەکانە، مرۆڤیش سروشتێکی سەرەڕۆی هەیە و بەردەوام هەوڵ دەدات کۆی چەمکە جیاوازەکانی دەوروبەری بخاتە ژێر توێژینەوە و لێکدانەوە تایبەتەکانی خۆی.

بۆیە لە فەرهەنگی فەلسەفەدا هەموو شتێك دەکەوێتە ژێر هەیمەنە و هەژموون و لێکۆڵینەوە، لەناویشیاندا ئایین و خودا و پرسە میتافیزیکییەکان.

کێشەی فەلسەفە لەگەڵ ئاییندا لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە ڕۆشنگەراکان وا گومان دەبەن کە لە ئاییندا کۆمەڵێك پرسی نالۆژیکی و میسۆلۆژی بوونیان هەیە و ئایینەکانیش ئامادە نین ڕێگە بە عەقلانیەت بدەن ئەو پرسانە بە شێوازێکی لۆژیکییانە و لەژێر سێبەری یاسا بنەڕەتییەکانی عەقڵدا شیکار بکات. بە گوزارشتێکی تر، ئایین لە دیدی فەلسەفەدا خۆی بە لاواز دەبینێت و ئامادەش نییە لاوازییەکانی خۆی بۆ عەقلانیەتی مرۆڤەکان بخاتە ڕوو.

بەڵام لە ڕاستیدا ئەگەر کاری فەلسەفە سەبارەت بە ئایین لێکۆڵینەوە بێت لەبارەی ڕاستی و ناڕاستیی ئایینەکان و گەیشتن بە هەقیقەت، ئەوا بێگومان ئەم کارە لە خودی ئاییندا ڕێگەپێدراو. دواتر ئەگەر لێکۆڵینەوەی عەقلانی و فەلسەفی دەربارەی ئایین بە ئامانجی دوورخستنەوەی خورافە و ئەفسانە بێت کە لەگەڵ عەقڵدا ناگونجێن، ئەوا هەم دیسان ئەمە لە ئاییندا جێگەی قبوڵکردنە، ئەوەتا لە فەرمایشتی پەیامبەری ئیسلامدا ﷺ هاتووە کە دەفەرموێت: "إنّ الله عز وجل يبعث لهذه الأمة على رأس كل مئة سنة من يجدد لها دينها[1]."

---

(١) ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە: (٤٢٩١)، هەروەها حاکمیش ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە: (٨٥٩٢).

واتە: "خوای گەورە لەسەری هەموو سەدەیەکدا کەسێك دەنێرێت بۆ ئەم ئوممەتە، تا کاروباری ئایینەکەیان بۆ نویێ بکاتەوە."

بێگومان نوێکردنەوەی ئایینیش لەم فەرمایشتەدا بریتییە لە زیندووکردنەوەی ئەو ئاکار و ڕەوشتە ڕاستەقینانەی کە لەنێو خەڵکیدا نەماون، هەروەها لەناوبردنی ئەو شتانەی کە داهێنراو و سەرپێچین لە ئاییندا(١).

بەشێکیش لەو دژایەتییەی دەخرێتە ڕوو، هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ڕۆشنگەراکان بڕوایان وایە هەر شتێك یاسا عەقڵی و فەلسەفییەکان نەتوانن شیکاری و لێکدانەوەیان بۆ بکەن، پرس و بابەتی بۆش (فاریغ) و بێمانان، بەو پێیەش کە لە ئاییندا کۆمەڵێك پرس و بابەتی لەو جۆرە بوونیان هەیە و ئایینیش ئامادە نییە سازشیان لەسەر بکات و دان بنێت بەوەی کە ئەو پرسانە هەڵەن و پێچەوانەی عەقڵی مرۆڤایەتین، بۆیە فەلسەفە لەو ڕووەوە دەبێتە دوژمنێکی سەرسەختی ئایین.

بەڵام لە ڕاستیدا ئەم دید و بۆچوونە پێچەوانەی بۆچوونی فەیلەسووف و بیرمەندە ناودارەکانی جیهان و هێز و توانای عەقڵ خۆیەتی، چونکە لە ڕووە فەلسەفی و عەقڵانییەکەوە عەقڵ ناتوانێت هەموو پرس و چەمکێك بخاتە ژێر شیکاری و هەژموونی خۆیەوە. بە گوزارشتێکی تر، عەقڵ لەبەرامبەر هەندێك پرسدا بێتوانایە و ناتوانێت دەرکیان بکات، جا بەشێکی ئەو پرسانەی کە عەقڵ توانای وەڵامدانەوەیانی نییە، پرسی عەقڵی و فەلسەفین، بۆیە ئەگەر عەقڵ نەتوانێت شیکاری ئەو بابەتانە بکات کە پەیوەندییان بە خۆیەوە هەیە، ئەوا بێگومان ناشتوانێت بەشێك لەو بابەتانە شیکار بکات کە پەیوەندییان بە ئایینەوە هەیە. دوا جار نەتوانینی عەقڵ بۆ شیکارکردنی ئەو بابەتانە مانای هەڵەبوون و نادروستیی ئەو بابەتانە ناگەیەنێت، بۆیە هەر دژایەتییەك لەسەر ئەم بۆچوونە بونیاد بنرێت، دوورە

(١) بڕوانە: عون المعبود شرح سنن أبي داود: العظيم آبادي: (٢٦٣/١١).

له هەقیقەت، ئەوەتا کەسێکی وەك (کانت) دان بە بێتواناییی عەقڵدا دەنێت کە کرۆکی فەلسەفە و لۆژیکە، کاتێك لەهەمبەر سروشتی عەقڵدا دەڵێت: "عەقڵی مرۆڤ لە بەشێك لە زانیارییەکانیدا ئەو تایبەتمەندییەی هەیە کە ماندوو بێت بەدەست هەندێك پرسیار، کە ناتوانێت ڕەتیان بکاتەوە، چونکە ئەو پرسیارانە بە سروشتی عەقڵ خۆی لەسەری فەرز کراون، ناشتوانێت وەڵامیان بداتەوە، چونکە بەتەواوی لەدەرەوەی تواناکانی عەقڵی مرۆڤن[1]."

هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە ئایین و فەلسەفە لە سەرچاوەی زانیارییەکانیاندا جیاوازیان هەیە، بۆیە کاتێك فەلسەفە و عەقڵانیەتی مرۆڤەکان تەنها دان بە سەرچاوەکانی خۆیاندا دەنێن، ئەم دژایەتی و تێکپرژانە ڕوو دەدات.

میتۆدی ئاین لە تیۆری زانین (نظرية المعرفة)دا میتۆدێکی دوو ڕەهەندەیە، واتە ئاین لە ڕێگەی دوو ئامرازەوە پەیام و بنەماکانی خۆی دەخاتە بەردەم شوێنکەوتووانی خۆی، وەك پێشتر ئاماژەمان پێی دا:

**یەکەم:** لە ڕێگەی سرووش (وەحی)یەوە، واتە بەشێك لە پرەنسیپ و بەها و پرسە ئایینییەکان تەنها وەحی دەتوانێت شیکاریان بکات و عەقڵ بێتوانایە لە ئاست دۆزینەوەی وەڵامێك بۆیان.

**دووەم:** لە ڕێگەی عەقڵەوە، واتە بەشێك لە یاسا و پرسە ئایینییەکان دەکەونە ژێر سایە و هەژموونی عەقڵ و جیهانبینیی مرۆڤەکان، ئەمەش لەمیانەی ئەو بەڵگە و نموونە عەقڵی و لۆژیکییانەی کە لەمەڕ هەندێك لە پرسە ئایینییەکان خراونەتە ڕوو و عەقڵیش توانای شیکارکردنیانی هەیە.

بەڵام میتۆدی فەلسەفە میتۆدێکی یەك ڕەهەندییە، کە بێگومان ئەویش میتۆدێکی عەقڵییە، واتە لە فەلسەفەدا تەنها ئەو پرس و بابەتانە جێگەی قبوڵ و

---

(١) نقد العقل المحض: کانت: (٢٥).

بایەخپێدانن کە عەقڵ بەڵێیان بۆ دەکات و بڕوای پێیان هەیە. بە گوزارشتێکی تر، فەلسەفە کاتێك بابەتێك ڕاڤە دەکات، تەنها پشت بە عەقڵ دەبەستێت.

ئەو میتۆدەی کە ئایین لە ڕێگەی سرووش (وەحی)یەوە دەیخاتە ڕوو، پشت بە عەقڵ نابەستێت، بەڵکو پشت بە قەناعەت پێکردن (الإقناع) دەبەستێت، بە بۆچوونی ئێمەش ئەو شتانەی کە مرۆڤ لە ڕێگەی ئیقناعەوە قبوڵیان دەکات، بەهێزترن لەو شتانەی کە لە ڕێگەی عەقڵ و بەڵگەوە قبوڵیان دەکات، چونکە ئەو پرسانەی مرۆڤ لە ڕێگەی بەڵگە و عەقڵەوە بڕوایان پێ دەکات، زیاتر قابیلی ئەوەن مرۆڤ لێیان پاشگەز ببێتەوە، ئەمەش کاتێك مرۆڤ بەڵگەیەکی بەهێزتر لەو بەڵگە دەبینێتەوە کە وای کردووە متمانەی بەو شتە هەبێت.

بەڵام ئەو پرسانەی کە لە ڕێگەی ئیقناعەوە قبوڵ کراون، دوورن لەم ئەگەرە، چونکە هەر لە سەرەتادا مرۆڤ بۆ بڕواکردن بەو شتە پشتی بە عەقڵ و بەڵگە نەبەستووە تا دواتر ئاشنای بەڵگەیەکی وا بەهێز ببێت، کە لە بڕواکردن بەم شتە پاشگەزی بکاتەوە.

لە ڕاستیدا هەموو مرۆڤێك خاوەنی ئایدۆلۆژیای ئایینی بێت یان نا، بڕوای بە بنەماکانی عەقڵ و فەلسەفە هەبێت یان نا، هەندێك پرس و بابەت هەن کە ئەو لە ناخیدا بڕوای پێیان هەیە، هەرچەندە لە ڕێگەی عەقڵیشەوە نەتوانێت وەڵامێك بۆ هۆکاری بڕوابوونی بەو شتانە بدۆزێتەوە. لێرەوە پێویستە ئاماژە بە خاڵێکی ئێجگار گرنگ بدەین، ئەویش ئەوەیە: کاتێك ئایین جگە لە عەقڵ و فەلسەفە و لۆژیك، پشت بە ئیقناع و وەحی دەبەستێت، ئەمە بێهێزیی ئایین و نەگونجانی لەگەڵ عەقڵ ناگەیەنێت. کاتێکیش عەقڵ و فەلسەفە تەنها پشت بە بەڵگەی عەقڵی دەبەستێت، مانای بەهێزیی عەقڵ و فەلسەفە ناگەیەنێت لە ئاست وەحی و ئاییندا، چونکە:

زانسته مرۆڤایەتییەکان –بە فەلسەفەشەوە– پەیوەندییان بە عەقڵەوە هەیە، بەڵام ئیمان و بڕواهێنان پەیوەندیی بە دڵەوە هەیە، بێگومان ئەو پرس و بابەتانەش کە مرۆڤ لە ڕێگەی دڵەوە بڕوایان پێ دەکات و قبوڵیان دەکات، بەهێزترن لەو پرس و بابەتانەی کە لە ڕێگەی عەقڵەوە بڕوایان پێ دەکات و قبوڵیان دەکات. بۆ ئەو مەبەستە، بەشێك لە زانایان نموونەیەکی کرداری دەهێننەوە و دەڵێن:

کاتێك مرۆڤێك ناچار دەکرێت لە ژوورێکدا بەتەنها لەگەڵ لاشەی مردوویەکدا بمێنێتەوە و لەو ژوورەدا بخەوێت، مرۆڤ بە عەقڵ دەزانێت کە ئەو مردووە ناتوانێت زیان بە هیچ کەسێك بگەیەنێت، هەموو مردووەکانی جیهان بەقەد مێشوولەیەك جووڵە و هەستیان نییە، هەموو هێزەکانی جەستە و دڵ و دەروونیان لێ جودا بوونەتەوە و پەیوەندییان بەو مردووە نەماوە، بەڵام چونکە دڵ و دەروونی مرۆڤ ئەو کارەی پێ قبوڵ ناکرێت و وەك عەقڵ بڕوای پێ نییە، ئەوا مرۆڤ ناتوانێت تەنها یەك شەوی تاریك لەگەڵ مردوویەکدا بمێنێتەوە[(١)].

کەواتە خودی مرۆڤ هەندێك جار بۆ بڕوابوون بە شتێك، پشت بە قەناعەت دەبەستێت، هەر چەندە ئەو قەناعەتەی پێچەوانەی عەقڵ و لۆژیك بێت و عەقڵی ئەو توانای لێکدانەوەی نەبێت.

بۆیە کاتێك ئایین هەندێك بابەت دەخاتە بەردەم بڕوداران و تەنها ئیقناعکردن و وەحی دەکاتە بەڵگە و پشت بە عەقڵ نابەستێت، ئەوا لە ڕاستیدا ئەو قەناعەت و بڕوایەی لای شوێنکەوتووەکانی دروستی دەکات، زۆر لەو بڕوایە بەهێزترە کە هەندێك جار لە ڕێگەی عەقڵەوە دروست دەبێت، ئەمە وێڕای ئەوەی کە ئەو قەناعەتەی ئایین لە ڕێگەی وەحییەوە دروستی دەکات، لەگەڵ ئەو سروشتەی مرۆڤ دەگونجێت کە بڕوا بە شتێك بکات، هەرچەندە عەقڵ نەتوانێت شیکاری بکات یان دانی پێدا نەنێت. کەواتە هەم دیسان ئەم بانگەشەیەی بە ناو ڕۆشنگەراکان

---

(١) بڕوانە: المعاد الجسماني إنسان ما بعد الموت: شفيق جرادي: (٢٥٦)، پەراوێزی دووەم.

خستوویانەتە ڕوو بۆ دەرخستنی دژایەتیی نێوان ئایین و فەلسەفە، بانگەشەیەکی ناڕاستە و خودی عەقڵ و فەلسەفە و واقیع بەدرۆی دەخەنەوە.

سەرەڕای هەموو ئەوانە، ئەم جۆرە بانگەشانە ڕقی بڕواداران بەرامبەر بە عەقڵ و فەلسەفە زێتر دەکات، دوا جار ئەو هەوڵەی بیرمەند و نوێگەراکان لەبری ئەوەی لە بەرژەوەندیی ڕەوتی ڕۆشنگەری بێت، دەبێتە مایەی ناشیرینکردن و لەکەدارکردنی کەسایەتیی خۆیان و هێنانەخوارەوەی بەها و نرخی عەقڵ و فەلسەفە لە دیدی نەیارانیدا. ئێمە لێرەدا نامانەوێت ئەو بەڵگە و ڕاوبۆچوونانە بخەینە بەر دەست کە ئەوە دەسەلمێنن فەلسەفە دژی ئایین نییە، چونکە پێشتر فەیلەسووفە ناودارەکانی وەك: کیندی و فارابی و ئیبنو سینا و غەزالی و ئیبنو ڕوشد و کانت و هیگڵ... هتد، ئەم بابەتەیان خستووەتە ڕوو. ئەوەی ئێمە گەرەکمانە ئەوەیە، کە ئەم خستنەڕووەی فەلسەفە و عەقڵانیەت وەك نەیار و دوژمنێکی سەرسەختی ئایین، کارێکی ئێجگار هەڵە و مەترسیدارە.

هەڵەیە چونکە لە ڕاستیدا ئەو بۆچوونە لەسەر هەندێك بنەما خراوەتە ڕوو، کە لەگەڵ خودی عەقڵ و فەلسەفەدا ناگونجێن، ئەمە وێڕای ئەوەی کە کەسایەتییە هەرە ناودارەکانی بواری فەلسەفە و لۆژیك ئەم بۆچوونەیان ڕەت کردووەتەوە و وتوویانە فەلسەفە دژی ئایین نییە، تەنها کارێك کە فەلسەفە دەیەوێت ئەنجامی بدات ئەوەیە، هەوڵ دەدات ئایین لە میسۆلۆژیا و ئەفسانە و شتی نالۆژیکی دوور بخاتەوە.

مەترسیداریشە چونکە ئەم بۆچوونە پەرچەکرداری خراپ لەلایەن بڕواداران دروست دەکات، کە پێمان وایە بەشێکی کێشەکە لەو خاڵەدایە. بۆیە لە ڕاستیدا ئەو کارانەی کە ئێستا بەشێك لە کارەکتەرەکانی بواری فەلسەفە و عیرفان و نوێگەریی ئایینی بە ناوی فەلسەفە بەرامبەر بە ئایین ئەنجامی دەدەن، کارێکی مەترسیدار و

نالۆژیکییانەیە، کە پێویستە بە زووترین کات ڕێگە لەو کارانە بگیرێت، ئەگەر نا بەر نەفرەتی ئایین و ئاهی فەلسەفە دەکەون، بۆ نموونە:

١- گاڵتەکردن بە پرس و بابەتە ئایینییەکان بە پاساوی نەگونجانیان لەگەڵ عەقڵ و سەردەمدا، کە ئەمە گیانی توندوتیژی لە هزری خەڵکی عەوامدا بونیاد دەنێت.

٢- گومان دروستکردن لەسەر پرس و بابەتە ئایینییەکان، وێڕای ئەوەی کە لەدیدی ئاییندا ئەو پرسانە قەتعینە و قابیلی ئەرگۆمێنتکردن نین.

٣- ڕەتکردنەوەی توراسی زانا و پێشینە ناودراەکانی ئیسلام و ناوزڕاندنی کارەکتەرە دیارەکانی ئیسلام، بە ناوی ڕۆشنگەری و گونجاندنی ئایین لەگەڵ جهانبینیی سەردەمدا.

هەموو ئەم پرسانە و چەندین پرسی تر، کۆمەڵێك کەس بە ناوی مۆدێرنێتە و جیهانبینی و نوێگەری بۆ مەرامی تایبەت بە خۆیان دەیانخەنە ڕوو، هێڵێکی ناتەبایی و دژایەتی لەنێوان ئایین و فەلسەفەدا دروست دەکەن، کە لە ڕاستیدا پێچەوانەی بنەما فەلسەفییەکان و هەقیقەتە ئاینییەکەیە.

ڕێگەگرتن لەم هەوڵانە، فەلسەفە و ڕەوتی عەقڵانیەت دەگێڕێتەوە سەر مەسار و ڕێڕەوی ڕاستەقینەی خۆی، هاوشان لەگەڵ ئایین نموونەیەکی جوان پێشکەش بە مرۆڤایەتی دەکەن و لەژێر سایەی دەق و شیکارییەکانیاندا بەختەوەری فەراهەم دەبێت، عەقڵ و ماریفەت و بیروباوەڕی ئایینی ڕاستەقینە باڵ بەسەر تەواوی کۆمەڵگەدا دەکێشێت.

بەپێچەوانەوە، بەردەوامبوون لەسەر ئەم میتۆدە و برەودان پێی، مرۆڤایەتی و بزاڤی ڕۆشنگەری بەرەو ئاڕاستەیەکی نادیار دەبات و تووشی داڕووخان و ئازاریان دەکاتەوە.

# بەشی پێنجەم
# ئایین و فەلسەفە

ئەگەر بەشێك لە ڕۆشنبیر و فەیلەسووفەكان بەناڕەوا و بەهەڵە فەلسەفە و لۆژیك وەك نەیار و دوژمنێكی ئایین نیشان بدەن، بە بیانووی ئەوەی كە ئایین كۆمەڵێك شتی تێدایە كە لەگەڵ عەقڵ و لۆژیكدا ناگونجێن و عەقڵ توانای شیكاركردن و وەڵامدانەوەیانی نییە، ئەوا لەبەرامبەردا بەشێكیش لە زانایان و بیرمەندانی ئایینی بەناڕەوا و بەهەڵە ئایینیان وەك نەیار و دوژمنی فەلسەفە و لۆژیك خستووەتە ڕوو.

سەرئەنجام چۆن ڕەوتە ڕۆشنگەرییەکە لەبری ئەوەی سوود بە فەلسەفە و بزوتنەوەی عەقلانیەت بگەیەنێت، مایەی نەگبەتی و زیادکردنی نەیارانی ڕەوتی ڕۆشنگەری بوون. بە هەمان شێوە ئەو ڕەوتە ئایینیەش لەبری ئەوەی ببنە مایەی زیاتر بلاوکردنەوەی ئایین و لێك نزیککردنەوەیان لەگەڵ عەقڵ و لۆژیکی مرۆڤایەتی، بوونەتە مایەی لەکەدارکردنی ئایین و ناوزەدکردنی بە ناعەقلانیەت و نالۆژیکیبوون.

بێگومان کێشەی سەرەکیی نێوان ئەم دوو ڕەوتە دەگەڕێتەوە بۆ کورتبینی و دەمارگیرییان بۆ ڕێبازەکانیان، کە ئەمەش فاکتەرێکی بەهێزە بۆ بەهەڵە تێگەیشتنیان لە چەمکی بەرامبەر و دروستبوونی دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی لەنێوانیاندا.

ڕەوتە ڕۆشنبیرەکە لەوەدا کەوتووەتە هەڵە کە بڕوای بە وەحی نییە و تاکە سەرچاوەی زانیاریی ڕاستەقینە کە هەقیقەت بە مرۆڤ ببەخشێت بە دیدی ئەو عەقڵ و هزری مرۆڤ خۆیەتی، ئەمە بەدەر لەوەی کە ئەم ڕەوتە خۆیشی دان بەوەدا دەنێت کە هەندێك پرس و بابەت هەن لەدەرەوەی تواناکانی عەقڵ و لۆژیکی مرۆڤایەتین.

ڕەوتە ئایینیەکەش لەوەدا کەوتووەتە هەڵە کە پێی وایە عەقڵ و لۆژیك و فەلسەفە پێچەوانەی وەحی و بنەماکانی ئایین دەوەستنەوە و ئەو پرسانەی ئەوان دەیسەلمێنن هیچ بەها و ئەرزشێکیان نییە، ئەمە بەدەر لەوەی کە ئەم ڕەوتەش خۆیان دەزانن ئایین بەشێك لە پرەنسیپ و یاسا و بنەماکانی خۆی لەسەر عەقڵ و لۆژیك بوونیاد دەنێت.

هەڵبەتە هەڵەی ڕەوتە ئایینییەکە لاوازتر و کەمترە بە بەراورد لەگەڵ هەڵەی ڕەوتە ڕۆشنبیرەکە، چونکە ئەو ڕەوتە ئایینییەی کە دژی ڕەوتی عەقلانیەت و لۆژیك وەستاوەتەوە، عەقڵ و فەلسەفە و لۆژیکی بە شێوەیەکی گشتی لەلا قبوڵە،

بەڵام زیاتر ئەو ڕەوت و ڕێبازانەی کردووەتە ئامانج کە لەگەڵ ئاییندا یەك ناگرنەوە و یاسا و بەهاکانیان پێچەوانەی بەها و پڕەنسیپە ئایینییەکانە.

ئاشکراشە کە ئەم ڕەوتە بە ناو ئایینییە بە دوو فۆڕمی جیاواز ئایین وەك نەیار و دوژمنی عەقڵ و لۆژیك دەناسێنێت، فۆڕمێکیان خۆی لە دەرخستنی کەموکووڕییەکانی فەلسەفەدا دەبینێتەوە کە بە دیدی ئەوان هۆکاری ڕقەبەرایەتی و ناکۆکیی نێوانیان لەم کەموکووڕییانەوە سەرچاوە دەگرێت، فۆڕمێکی تریشیان لە شێوازی خۆدەرخستنی ئاییندا دەبینێتەوە کە ئایین بە شێوەیەك دەخرێتە ڕوو کە هیچ سیما و نیشانەیەکی عەقلانیەت و لۆژیکی بوونی پێوە دیار نابێت، بێگومان لە هەردوو فۆڕمیشدا نموونە و حاڵەتی جیاجیا بوونیان هەیە، کە ئێمە بەکورتی ئاماژەیان بۆ دەکەین.

## فۆڕمی یەکەم: دژایەتیکردن و هێرشکردنە سەر عەقلانیەت و فەلسەفە و لۆژیك

یەکێك لە هەڵە گەورەکان کە ڕەوتە ئایینییەکان بەرامبەر بە ئایین ئەنجامی دەدەن بریتییە لە هێرشکردنە سەر هزر و لۆژێك و فەلسەفەی مرۆڤایەتی بەبێ بوونی پاساوێکی گونجاو یان لێکۆڵینەوەیەکی ورد، ئەم هەڵەیەشیان پەیوەستە بە پاشخانی فیکری و مەعریفییان، بە شێوەیەك کە لە حاڵەتێکدا بڕیار لەسەر فەلسەفە و لۆژیك و عەقڵی مرۆڤایەتی دەدەن کە نەخزاونەتە نێو کرۆکی ئەو زانستە مرۆییانە.

بێگومان ئایین پێش بزوتنەوە عەقلانییەکان بوونی هەبووە، بۆیە زێتر و زووتر توانیویەتی مرۆڤایەتی بەلای خۆیدا کەمەندکێش و دەستەمۆ بکات، کاتێکیش کەسانێکی هەڵکەوتە هەوڵیان داوە لە ڕێگەی عەقڵ و لۆژیکەوە ڕاڤەی پرس و بابەتە ئایینی و میتافیزیکییەکان بکەن بەشێك لە کارەکتەرە باوەڕدارەکان نەیانتوانیوە ئەو ڕەوشە ئیستیعاب بکەن، بۆیە پەنایان بۆ هێزی ئایین بردووە تا لە

ڕێگەیەوە گومان بخەنە سەر ئەو ڕاڤە و شیکارییانەی لە ڕێگەی لۆژیک و عەقڵەوە بۆ ئایین دەخرێنە ڕوو، هەڵبەتە ئەمە جگە لە زانا ڕاستەقینەکان کە هەوڵیان داوە ئەو هەولانە وەك جیهانبینییەکی مرۆڤایەتی هەژمار بکەن و لە هەندێك بڕیاریاندا پشتگیری بکەن و لە هەندێکیشدا نەیار و دژایەتی.

دەستپێکی ئەم دوژمنایەتییە لەوەدا دەبێت کە بەشێکی زۆری هێرشەکانی ئەم ڕەوتە ئایینییە لەسەر بنەمای زانست و پسپۆڕی نییە، بە بۆچوونی هەندێك لە شارەزایانی بواری ئایین تەنانەت ئەو کەسایەتییە دیارانەی ئایینی ئیسلام کە وەك ڕەخنەگری ڕاستەقینەی بزوتنەوەی عەقلانیەت و چەمکی لۆژیك و فەلسەفە هەژمار دەکرێن، زانای تایبەتمەند و پسپۆڕ نین لەو بوارەدا، واتە پسپۆڕی ئەو زانا بەڕێزانە فەلسەفە و لۆژیك نەبووە تا توانای ئەوەیان هەبێت بڕیاری لە دژدا بدەن، بۆیە بەدەر لە ئەبو حامیدی غەزالی بۆچوون و ڕای زاناکانی تر هێندە جێی بایەخ و تێڕامان نەبووە، چونکە تەنها غەزالی لەسەر بنەمای پسپۆڕی قسەی لە فەلسەفەدا کردووە و هێرشێکی لۆژیکی کردووەتە سەری، ئەمە وێڕای ئەوەی کە غەزالی تەواوی فەلسەفە و لۆژیکی ڕەت نەکردووەتەوە، بەڵکو لە هەندێك بواردا بە ڕاستی داناوە و لە هەندێکیشدا بە هەڵە.

بێگومان ئاشنانەبوونی بەشێك لەو کارەکتەرانەی کە هێرشیان کردووەتە سەر لۆژیك و فەلسەفەی مرۆڤایەتی وای کردوە بۆچوونەکانیان زۆر لاواز بێت، کە دواتر ئەم لاوازی بۆچوونە دەشێت هۆکارێك بێت بۆ ئەوەی ئایین وەك نەیاری عەقلانیەت و ڕۆشنگەری پیشان بدرێت، بۆ نموونە دیارترین زانای ئایینی ئیسلام کە لەبەرامبەر لۆژیك و فەلسەفەدا وەستابێتەوە، ئیبنو سەلاحی[1] شارەزوورییە کە لە فەتاواکەیدا

---

(١) ئیبنو سەلاح: ناوی عوسمانی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی موسای شارەزوورییە، بە (ئیبنو سەلاحی شارەزووری) ناوبانگی دەرکردووە، ساڵی (٥٧٧ك.) لەدایك بووە و ساڵی (٦٤٣ك.) کۆچی دوایی کردووە. ئەم زانایە بەڕەچەڵەك کوردە و خەڵکی دەڤەری شارەزوورە، یەکێکە لە گەورەزانایانی

هێرشێکی توند دەکاتە سەریان و دەڵێت: "وأمّا المنطق فهو مدخل الفلسفة، ومدخل الشر شرّ، وليس الإشتغال بتعليمه وتعلّمه مما أباحه الشارع ولا استباحه أحد من الصحابة والتابعين وأئمة المجتهدين وسائر من يهتدى بهم من أعلام الأئمة وسادتها[1]."

واتە: "هەرچی زانستی لۆژیکە، ئەوا دەرگای زانستی فەلسەفەیە، دەرگای شەڕیش شەڕە، خۆخەریککردن بە فێربوونی و هەروەها فێرکردنی خەڵکیش خودا (شاریع) ڕێگەی پێ نەداوە، هیچ کام لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان و زانا موجتەهیدەکان و تێکڕای ئەوانەی شوێنپێیان هەڵدەگیرێت لە گەورە زانایان، ڕێگەیان پێی نەداوە."

ئەمە وێڕای ئەوەی کە ئەم دژایەتیکردنە دەدرێتە پاڵ هەریەك لە ئیمامی سیوطی[2] و ئیمامی نەواوی[3]، بەڵام لە ڕاستیدا هیچ کام لەم زانا بەڕێزانە پسپۆڕی ئەم بابەتە نین و ڕاو بۆچوونەکەیان زۆر بەهەند وەرناگیرێت، بە بەراورد لەگەڵ ئەو

---

مەزهەبی ئیمامی شافیعی، لە زانستەکانی فەرموودە و فیقهو تەفسیر و ئوسوڵ دەستێکی باڵای هەبووە. گرنگترین بەرهەمی بریتییە لە: (مصطلح علم الحديث)، بڕوانە: سير أعلام النبلاء: الذهبي: (٢٣/١٤٠).

(١) فتاوى ومسائل ابن الصلاح: (٢/٢٠٩).

(٢) سیوطي: ناوی عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی سابیقولدینی سیوتییە، زانا و ئەدیبێکی ئیسلامییە، شارەزاییەکی تەواوی هەبووە دەربارەی فەرمووده و فیقه و نەحوی عەرەبی، یەکێکە لە گەورزانایانی مەزهەبی ئیمامی شافیعی. ساڵی (٨٤٩ك.) لەدایك بووە و ساڵی (٩١١ك.) کۆچی دوایی کردووە. گرنگترین بەرهەمەکانی: (الإتقان في علوم القرآن، الأشباه والنظائر)، بڕوانە: الأعلام: الزركلي: (٣/٣٠١).

(٣) نەواوی: ناوی موحیەدینی کوڕی یەحیای کوڕی شەڕەفی کوڕی حەسەنی نەواوییە، ساڵی (٦٣١ك.) لە گوندی (نەوا) لە دیمەشقی سوریا لەدایك بووە و ساڵی (٦٧٦ك.) وەفاتی کردووە. یەکێکە لە گەورەزانایانی مەزهەبی ئیمامی شافیعی. لە بەرهەمەکانی: (المجموع شرح المهذب، روضة الطالبين، المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج)، بڕوانە: طبقات الشافعية الكبرى: السبكي: (٨/٣٩٥).

زانا بەڕێزانەی کە لەسەر بنەمای لێکۆڵینەوە و پسپۆڕی بڕیاریان لەسەر فەلسەفە و لۆژیك داوە.

بێگومان پاساوی ئەم زانا بەڕێزانە زۆرترین جار بریتییە لەوەی کە ئەم زانستانە کۆمەڵێك دەرچەی گومان لای باوەڕداران دەکەنەوە و زۆرترین جار بەهەڵە بەکار هێنراون، یاخود ئەم زانستانە لە سەردەمی زێڕینی پێغەمبەری خودا ﷺ و یاوەرانیدا ﷺ بوونیان نەبووە و ئەوان ڕێگەیان پێ نەداوە، بەڵام دەشێ ئێمە لە وەڵامی ئەم پاساوانەدا بپرسین:

١- ئەگەر مەبەست لە فەلسەفە و لۆژیك خودی خۆیان بێت وەك دوو زانستی مرۆڤایەتی، ئەوا بە هیچ جۆرێك هیچ دەقێك نییە لەسەر ئەوەی بڵێت حەڕامن، تەنانەت لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و یاوەرەکانیدا ﷺ ئەو دوو زانستە بەم دوو ناوە تایبەتەوە هەر بوونیان نەبووە، تا خودای گەورە یان پێغەمبەرﷺ حوکمی لەسەر بدەن. خۆ ئەگەر مەبەستیش کۆی پرۆسەی عەقڵانیەت و بیرکردنەوە بێت، ئەوا تەواو پێچەوانەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزە، کەواتە دەشێ بپرسین: ئەم حوکمە لەسەر چ بنەمایەك دراوە؟

٢- دواتر نەبوونی ئەم دوو زانستە بەدیاریکراوی لە سەردەمی پێغەمبەرﷺ و یاوەراندا ﷺ و مومارەسەنەکردنیان لەو سەردەمدا، نابێتە بەڵگە لەسەر حەرامبوونیان، چونکە چەندین زانست ئێستا بوونیان هەیە و لە سەردەمی ئەواندا نەبوون، لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگەپێدراون.

٣- پاشان بەهەڵە بەکارهێنانی عەقڵ و فەلسەفە دژ بە بنەماکانی ئایین، نابێتە پاساوی حەرامکردنی ئەو دوو زانستە، بە بەڵگەی ئەوەی چەندین کەسیش ئایین بەهەڵە بەکار دەهێنن، بەڵام هیچ کاتێك ناکرێ بوترێت ئایین حەرامە.

بەشێکی تری کێشەکە ئەوەیە، کە ئەم ڕەوتە ئایینییە بە جۆرێك بڕیار لەسەر فەلسەفە و لۆژیك دەدات، وەك ئەوەی هەرچی لۆژیك و فەلسەفە بێت دژی خواست

و بنەماکانی ئایین بێت، بە واتای ئەوەی کە بڕیاردانیان لەسەر تەواوی لۆژیك و فەلسەفەی مرۆڤایەتی یەك جۆرە و جیاوازی لەنێوان فەلسەفە و لۆژیکی ڕاستەقینە و هەڵەدا ناکەن، گومان لەوەدا نییە کە بەشێکی فەلسەفە مرۆڤایەتییەکان پێچەوانەی دەق و ڕێسا ئایینییەکانن، بەڵام ئەمە نابێتە پاساوێکی زانستی و لۆژیکی بۆ ئەوەی تەواوی فەلسەفە و بزوتنەوەی عەقڵانیەت بخەیتە ژێر پرسیار، بە بەڵگەی ئەوەی کە زانایانی ڕاستەقینە مەبەستیان لە دژایەتیکردنی فەلسەفە و لۆژیك تەواوی ئەم پرۆسەیە نییە بەگشتی، بەڵکو تەنها مەبەستیان ئەو بەشەیانە کە تێکەڵ بە گومان بووە، ئەگینا هەموو ئەو زانا بەڕێزانە فەلسەفە و لۆژیکیان بەکار هێناوە، بەڵام لەژێر ئەو دوو ناوەدا نا، چونکە وەك دەگوترێت فەلسەفە و لۆژیك هەبوونیان پێش ناوەکانیان کەوتووە، واتە ئەم دوو زانستە هەر هەبوون، بەڵام نەك بەم ناوە، بەڵکو دواتر ئەم ناوەیان لێ نراوە، بۆیە دەربارەی حەرامکردنی لۆژیك -و فەلسەفە- لەلایەن بەشێك لە زانایانی ئایینی ئیسلامەوە وتراوە:

**فـــإن تقــل حـــرّمه الـــنواوي**

**وابن الصلاح والسيوطي الراوي**

**قــلت نرى الأقوال ذي المخالفة**

**مـحلها مــا صنف الـــفلاســفة**

**أمـــا الذي خلصه مـن أســلما**

**لابـدّ أن يعـلـم عــند الـعلما[1].**

واتە: "ئەگەر بڵێی ئیمامی نەواوی و ئیبنو سەلاح و سیوطی -مەنتیق و فەلسەفەیان- قەدەغە کردووە، ئەوە من دەڵێم ئەم بۆ چوونە دژانە مەبەستیان تەنها ئەو بەشەیە کە فەیلەسووفە نامسوڵمانەکان دایانناوە و نووسیویانەتەوە- کە

---

(١) آداب البحث والمناظرة: محمد الأمين الشنقيطي: (٥).

پڕە لە هەڵە و گومان– بەڵام ئەو لۆژیك و فەلسەفەی كە زانا مسوڵمانەكان نووسیویانەتەوە و پوختیان كردووە، ئەوا زانایان ڕایان وایە كە پێویستە بخوێنرێت و بزانرێت."

هەڵبەتە خاڵێكی تر كە بەشێك لەو ڕەوتە ئایینییە پشتی پێ دەبەستن و وەك پاڵپشتییەك بۆ ڕقەبەرایەتی و ناكۆكیی نێوان ئایین و فەلسەفە نیشانی دەدەن، بریتییە لەوەی كە بەردەوام ئەوە دووپات دەكەنەوە كە زانایان ئەم زانستە مرۆییانەیان لە بەشێك لە پرس و بابەتەكانیاندا بە هەڵەیان داناون، كە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر دژایەتی و ناكۆكیی نێوان ئەم دووانە، بێگومان بەشێك لە زانا ناودارەكانی ئیسلام وەك ئەبو حامیدی غەزالی و ئیبنو تەیمییە[1]، هێرشیان كردووەتە سەر فەلسەفە و لۆژیك لە بەشێك لەو پرسانەی كە تیایدا بڕیاری بە هەڵەیان داوە، بەڵام:

– وەك دەوترێت: "التخطئة لا تفيد التحريم"

واتە: "بە هەڵەدانان واتای حەرامكردن ناگەیەنێت."

– ئەم زانایانە مەبەستیان كۆی فەلسەفە و لۆژیك نەبووە، بەڵكو تەنها ئەو بەشەیان ڕەت كردووەتەوە كە لەگەڵ بنەما و دەق و تێكستە ئایینییەكان تێك دەگیرێت.

– ئەم زانایانە خۆیشیان زۆر بەچڕی لە بەرهەم و نووسینەكانیاندا پەنایان بردووەتە بەر ڕێكارە لۆژیكی و فەلسەفییەكان، كە ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەوانە تەنها بەشێكی فەلسەفەیان ڕەت كردووەتە نەك هەمووی.

---

(١) ئیبنو تەیمییە: ناوی ئەحمەدی كوڕی عەبدولحەلیمی كوڕی عەبدولسەلامی حەڕانییە،ساڵی (٦٦١ك.) لەدایك بووە و ساڵی (٧٢٨ك.) كۆچی دوایی كردووە. لە زانستەكانی فەرموودە و تەفسیرو كەلام و فەلسەفە و فیقهدا دەستێكی باڵای هەبووە، بە ڕێبەری سەلەفیەت هەژمار دەكرێت و نازناوی (شەیخول ئیسلامی) لێ نراوە. گرنگترین كتێبەكانی ئەمانەن: (منهاج السنة، درء تعارض العقل والنقل، السياسة الشرعية)، بڕوانە: الأعلام: الزركلي: (١/١٤٤). معجم الفلاسفة: جۆرج طرابيشي: (٩١).

### فۆڕمی دووەم: نیشاندانی ئایین وەك كایەكی ناعەقڵانی و نالۆژیكی

بەشێك لەو كردارانەی هەندێك كەس لەژێر پەردەی زانای ئایینی ئەنجامی دەدەن، پێچەوانەی میتۆدە عەقڵانییەكەی ئایینە، كە بێگومان ئەوەش بووەتە بەهانەیەك بەدەست ڕەوتی ڕۆشنگەری كە ئایین بە میسۆلۆژیا و ئەفسانە و خوڕافات و ناعەقڵانیەت ناو ببەن، بەشێكیش لەو كردارانەی بوونەتە مایەی ناوزڕاندنی ئایین و بوونەتە بەڵگەیەك بەدەست ڕەوتی ڕۆشنگەری بۆ لێدان لە ئایین، بریتین لەمانەی خوارەوە:

**یەكەم: پشتبەستن بە ئەفسانە**

بەشێك لەو كارەكتەرە ئایینییانەی كە ئەم ڕەوشەی ئێستای موسڵمانان وای كردووە ببنە دەمڕاست و قسەكەری ئایین، بە جۆرێك مەهزەلەن بۆ سەر پێگە و بەهای ئایین كە تەنانەت بڕوادارانیش بوونەتە بەشێك لەو دەنگانەی كە بانگەشەی وەلانانی ئەو كاراكتەرانە دەكەن، هێندەی تاكە بڕوادارەكان بوونەتە قوربانیی دەستی ئەم گرووپە، هێندە نەیاران و دوژمنانی ئایین زیانیان ڕووبەڕوو نەبووەتەوە.

بێگومان ئایین وێڕای ئەوەی كە كایەیەكی ئیمانی و ڕۆحییە، گرنگی بە ناواخن و دڵ و دەروونی مرۆڤەكان دەدات، لەگەڵ ئەوەشدا كایەیەكی مەعریفییە و لە دووتوێی دەق و تێكستەكانیدا هەوڵ دەدات زۆرترین زانیاری ببەخشێتە پەیڕەوانی، ئەوپەڕی كۆشش دەكات و توانای دەخاتە گەڕ تا بڕواداران وا لێ بكات لە ڕووی زانست و زانیارییەوە بتوانن لەگەڵ ڕۆژگاردا بگونجێن، بۆ ئەو مەبەستەش ئایینی ئیسلام هەموو هەفتەیەك كۆڕبەندێكی گشتی لە سەرتاسەری خاكی موسڵمانان ڕێك دەخات كە ئەویش بریتییە لە (گوتاری ڕۆژی هەینی).

بەڵام ئەوەی جێگەی هەڵوەستە لەسەر كردنە، ئەم گوتارە مەعریفییە بۆتە دەروازەیەك بۆ كۆمەڵێك كەس كە تیایدا تەنها خەریكی خوێندنەوەی چیرۆكی

ئەفسوناوی و خەوننامەن، کە نە لەگەڵ ژینگە و ناوەرۆکی ئاییندا و نە لەگەڵ عەقڵ و لۆژیکدا دەگونجێن، ئیدی مرۆڤیان بە شێوەیەك تووشی شۆك و بێزاری کردووە، کە دەشێ بپرسین ئایا ئەمانە وتارن یان ڕۆمانن یاخود خەوننامە؟

بێگومان ئەم جۆرە پێشکەشکردنەی گوتاری ئایینی بووەتە ئامرازێك بەدەست نەیارانی ئایین تا ئایین بە دواکەوتن و کەلەپووری کۆن و گەڕانەوە بۆ دواوە لەقەڵەم بدەن، تەنانەت بڕوادارانیش تووشی بێزاری و بێهیوایی بوون لەم جۆرە پێشکەشکردن و نیشاندانەی ئایین.

## دووەم: نەبوونی نوێگەری

هەڵبەتە ئایین واتا ڕۆیشتن لەگەڵ ڕۆژگار و دوانەکەوتن لە شەمەندەفەری مەعریفە و لۆژیك، ئایین واتا دۆزینەوەی دەرگای نوێی زانست و زانیاری، ئایین واتە نوێگەری لە هزر و بۆچوون و بیرکردنەوە، بەڵام ئەوەی ئیمڕۆ بەشێك لە کارەکتەرە ئایینییەکان نیشانمان دەدەن بریتییە لە چەند بابەتێك کە نەك مرۆڤە بەتەمەنەکانمان، بەڵکو مناڵانیش بە دەیان جار گوێبیستی بوون، ئیدی وەك چیرۆکی هەزار و یەك شەوەی لێهاتووە هێندەی دووبارە بکرێنەوە.

بێگومان ئێمە لەگەڵ ئەوەدا نین کە پرس و بابەتە ئایینییەکان کۆن بن و پێویستیمان بە دووبارە وەبیرهێنانەوەیان نەبێت، نەخێر ئێمە دەڵێین پێویستە هەمیشە مامۆستایان و زانایان ئەو بابەتە ئایینییانەمان بۆ باس بکەن کە مرۆڤایەتی پێویستی پێیان هەیە، بەڵام دەبێت لەگەڵ ڕۆژگاریشدا بڕۆن و ئەو پرس و بابەتە هەنووکەییانە بۆ بڕواداران باس بکەن کە ناخی مرۆڤایەتی پێویستی بەوە هەیە لێیان ئاگادار بێت.

هەر کەسێك هەفتانە گوێ لە گوتاری بەشێك لە کارەکتەرە ئایینییەکان بگرێت، دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە بەڵێ دەشێ لە سەددا حەفتای بابەتەکان دووبارە بن.

دراوسێیەکمان هەیە دەیووت بەر لەوەی بچمە مزگەوت دەزانم بابەتی ئەمڕۆ چییە، چونکە مامۆستاکەمان یەك ساڵە سوورەتی فاتیحە ڕاڤە دەکات! من خۆم لە ماوەی چەند ساڵێك لە هەمان مزگەوتدا زیاد لە پێنج جار گوێم لە ژیاننامەی وەیسی قەرەنی بوو!

دوا جار تەنها نموونەیەکی زیندوو دەهێنمەوە کە بەسەر یەکێك لە ناسیاوەکانی خۆمان هاتبوو: ناسیاوێکمان سێ کەسی خانەوادەکەی مامۆستای ئایینین، هەڵبەتە لەو مامۆستا بەڕێزانەن کە دڵسۆزن بۆ ئایین و کەسی خواناس و دیندارن، ئەم ناسیاوەمان شێوەی زۆر لە برایەکی دەچێت کە مامۆستای ئایینییە، ئەویش ڕۆژێك بەسەردان دەچێتەوە لادێکەی خۆیان، قەدەری خوا ئەو ڕۆژە هەینی دەبێت و مامۆستای لادێکەش لەوێ نابێت، بۆیە دەیەوێ بگەڕێتەوە بۆ شار بەڵام کە خەڵکەکە بینیبوویان و خەبەریشیان هەبوو کە مامۆستاکەیان لە ماڵ نییە، ڕێگەی پێ دەگرن و پێی دەڵێن مامۆستا فلان، بە خوا تا ئەمڕۆ وتارمان بۆ نەخوێنیتەوە، ڕێگەت پێ نادەین بڕۆیت. خەڵکەکە وایان زانیبوو براکەیەتی کە مامۆستای ئایینییە، ئەم ناسیاوەشمان کڵاو و جەمەدانییەك لە کەسێك وەردەگرێت و گوتارێکی قیتیان بۆ دەخوێنێتەوە. باوکم لێی پرسیبوو ئێ خۆ تۆ وتاربێژ نیت، چۆن توانیت وتار بدەی؟ ئەویش گوتبووی وەڵا ئەو وتارەی بابم هەندە گوێی لێ بووبوو، کە لەسەر وەرەقەی دەخوێندەوە من لەبەرم کردووە!

### سێیەم: گرنگینەدان بە عەقڵانیەتی ئایین

هەڵبەت دەق و تێکستەکانی ئایین کۆمەڵێك بنەمای عەقڵانی و لۆژیکیی گرنگیان تێدایە کە پێویستە بۆ مرۆڤایەتی نیشان بدرێن، وەك وەڵامدانەوەیەك بۆ ئەو گرووپەی بە ناوی عەقڵانیەت ڕەخنە لە ئایین دەگرن و بە ناعەقڵانیبوون تۆمەتباری دەکەن، بەڵام ئەوەی جێگەی داخە، کەمتر ئەم بابەتانە دەخرێنە بەر باس و

لێکۆڵینەوە، ئەمەش وای کردووە ئایین وەك چەمکێکی دژ بە فەلسەفە و لۆژیك دەربکەوێت. بێگومان بەشێك لەو خاڵانەی کە عەقڵانیەتی ئایین دەخەنە ڕوو، لەم ئایەتانەی خوارەوەدا بەدەردەکەون کە دەبێت زیاتر تیشکیان بخرێتە سەر:

١- پێویستی تێڕامان و بیرکردنەوە: وەك خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ أَوَلَمْ يَنظُرُوا۟ فِى مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ ﴾ (١). واتە: "ئایا بۆ سەرنجیان نەداوە لەو هەموو دەسەڵاتە گەورەیەی خوا لە ئاسمانەکان و زەویدا و ئەو هەموو شتانەی خوا بەدی هێناون؟"

٢- بانگەشەکردن بۆ بەکارهێنانی عەقڵ و تێفکرین لە گەردوون بەگشتی، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴿١٧﴾ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ رُفِعَتْ ﴿١٨﴾ وَإِلَى ٱلْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ ﴿١٩﴾ وَإِلَى ٱلْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ ﴾ (٢).

واتە: "ئایا سەرنجی وشتر نادەن چۆن دروست کراوە! ئایا سەرنجی ئاسمان نادەن چۆن بەرز کراوەتەوە، ئەی سەرنجی کێوەکان نادەن چۆن داکوتراون و دامەزرێنراون و ڕەگیان چووە بە ناخی زەویدا! ئەی سەرنجی زەوی نادەن چۆن تەخت کراوە!"

٣- پشتبەستن بە دیالۆگی بەڵگەدار، وەك خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾(٣). واتە: "پێیان بڵێ ئەگەر ڕاستگۆن، بەڵگەکانتان (لەسەر ئەم قسەیە) بهێننە مەیدانەوە."

٤- ڕەخنەگرتن لە بەکارنەهێنانی عەقڵ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ:

---

(١) سوورەتی (الأعراف)، ئایەتی: (١٨٥).

(٢) سوورەتی (الغاشية)، ئایەتەکانی: (١٧- ٢٠).

(٣) سوورەتی (البقرة)، ئایەتی: (١١١).

﴿ وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَـٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَـٰفِلُونَ ﴾ (١).

واتە: "سوێند بە خوا بێگومان ئێمە زۆر لە پەری و ئادەمیزادمان بۆ دۆزەخ دروست کردووە، ئەوانەی دەزگای دڵیان هەیە و کەچی حەقی پێ تێناگەن، چاویشیان هەیە کەچی حەقی پێ نابینن، گوێیان هەیە کەچی حەقی پێ نابیستن، ئا ئەوانە وەکو ئاژەڵ وان (لە شوێنکەوتنی ئارەزوودا) بەڵکو ئەوانە وێڵتریشن، ئا ئەوانە هەر غافڵ و بێئاگان لە حەق."

٥- چەسپاندنی پرەنسیپی ئیجتهاد و ڕا دەربڕین، کە فیقهی ئیسلامی و بەشێکی زۆری زانستە ئیسلامییەکان بەرهەمی ئەم خاڵەن.

**لە ڕاستیدا ئەم بابەتە دەمانگەیەنێت بە دوو خاڵی گرنگ:**

١- وەك چۆن بەشێك لە ڕۆشنبیران بوونەتە مایەی ڕەخنە بۆ عەقڵانیەت، بە هەمان شێوە بەشێك لە پسپۆڕان و کارەکتەرە سەرەکییەکانی ئایینی بوونەتە مایەی ڕەخنە بۆ سەر ئایین و بەها و پرەنسیپەکانی.

٢- ئەوانەی لە ئاییندا دژی فەلسەفە و لۆژیك وەستاونەتەوە پسپۆڕی ئەو بوارانە نین، ئەمە وێڕای ئەوەی کە مەبەستیان کۆی فەلسەفە و لۆژیك نییە، بەڵکو مەبەستیان ئەو بەشەیە کە دژی بنەما گشتیەکانی ئایینە و دەبێتە مایەی دروستکردنی گومان لای موسڵمانان.

دوا جار گەورەترین فاکتەر بۆ سەرکەوتن، بەرەنگاربوونەوەی ئەو بەها و نەریتە هەڵە و ناڕاستانەیە کە لای خەڵکی بوونەتە یاسا و پرەنسیپی ژیان، پێویستە دەستپێکی گۆڕانکاری لەو شتانەوە دەست پێ بکات، تا زانایانی ئایینی

---

(١) سوورەتی (الأعراف)، ئایەتی: (١٧٩).

ڕاستەقینەش بەرەنگاری ئەو بەها ناڕاستەقینانە نەبنەوە و جێگە بەو کەسانە چۆڵ نەکەن کە بە ناوی ئایینەوە قسە دەکەن بە بێ ئەوەی زانیارییان لەو بارەوە هەبێت، گومان لەوەدا نییە کە ڕەوشەکە زیاتر بەرەو کەناری نائارامی هەنگاو دەنێت.

دیارترین ئەو هۆکارانەی یارمەتیدەر بوون بۆ سەرکەوتنی پەیامی موحەممەدﷺ، بریتی بوو لە لێهاتوویی و بوێریی ئەو زاتە بەرامبەر بە دژایەتیکردن و بەرەنگاربوونەوەی دیاردە باوەکانی ئەوسای نێو کۆمەڵگە، وەك: هاوبەشدانان بۆ خودا و بەکۆیلەکردن و خیانەت و داوێنپیسی و ستەم... هتد، بێگومان ئەگەر سەرەتا دژ بەو نەریتانە نەوەستابایە و لەبری ئەمە پایە و بنەماکانی ئیسلامی بۆ خوێندبانەوە، نەیدەتوانی بەم شێوە گەورەیە دەستکەوت و سەرکەوتن بکاتە بەشی خۆی، چونکە بەر لە تێکدانی دابونەریت و بەها کۆنەکان، ئەستەمە مرۆڤ بتوانێت دابونەریت و بەهای نوێ بۆ کۆمەڵگە بکاتە بەها و پرەنسیپ لای هاوڵاتیان.

بۆ ئەوەی بتوانین دیدگایەکی نوێ لای هاوڵاتیان دروست بکەین سەبارەت بە عەقڵانیەتی ئایین، پێویستە ناعەقڵانیەکان لە ئایین دوور بخەینەوە، پێویستە ئەو بەها و پرەنسیپانەی چەندین ساڵە کەسانێك لە دەرئەنجامی نەزانیندا وەك ئایین بۆ خەڵکی باسیان دەکەن، لە دیدی خەڵکیدا بسڕێنەوە و بەهای عەقڵانیەتی ئایینی ڕەسەن لە شوێنیاندا بونیاد بنرێت.

نووسەری بەناوبانگی فەڕەنسی (گۆستاڤ لۆبۆن) لە پەرتووکی (سیكولوجية الجماهير)، ئاماژە بۆ بایەخی دابونەریت لەسەر دروستکردنی بیروباوەڕەکان دەکات و دەڵێت: "لە واقیعدا دوو گەورەترین کار و ئەرکی مرۆڤ لەوەتەی هاتووەتە سەر ئەم زەمینە، بریتین لە: دروستکردن و هێنانەکایەی تۆڕێك لە دابونەریت لە سەرەتادا، دواتر لەناوبردن و خاپووورکردنی ئەو دابونەریتانە کاتێك شوێنەوار و دەرئەنجامە ئیجابی و بەسوودەکانیان تەواو دەبێت، بەبێ هەبوونی دابونەریتی

چەسپاو و نەگۆڕیش ناکرێ شارستانیەت هەبێت، بەبێ لادانێکی لەسەرخۆ و پلەبەپلەی ئەو دابونەریتانەش پێشکەوتن بەدی نایەت[1]."

لەبری ئەوەی ڕووبەڕووی عەقڵانیەت ببینەوە، پێویستە هەوڵی لەناوبردنی ئەو نەریتە نائایینییانە بدەین کە بە ئایینەوە لکێنراون، بەر لەوەی ڕەوتی عەقڵاتیەت بە دژایەتیکردنی ئایین تۆمەتبار بکەین، دەبێ تۆمەتەکان لەسەر خۆمان لا ببەین. ئەوەی ئێمە دەیلێین، هەمان ئەو شتەیە کە پەیامبەری ئیسلام موحەممەدﷺ ئەنجامی دا، لە سەرەتادا بوونی خۆی بۆ خەڵکی سەلماند، ئینجا پەیامەکەی پێ ڕاگەیاندن، سەرەتا سەلماندی کە لێهاتووە، دەستپاکە، ڕاستگۆیە، میهرەبانە، دڵسۆزە... هتد، ئینجا هات بانگی گەل و هۆزی خۆی کرد و پێی ڕاگەیاندن کە ئەوەی ئەو هێناویەتی، ڕاستەقینەیە و ئەو نەریت و بەهایانەی ئێستا ئەوان لە کۆمەڵگەدا پەیڕەوی دەکەن، هەڵە و ناڕەوان.

ئەو دیمەنەش کە دەستپێکی ئەم پەیامە نوورانییەی بە ئێمەی مرۆڤ ڕاگەیاند، سەلمێنەری ئەم وتەیەی ئێمەیە. ئەوەتا کاتێك خوای گەورە فەرمانی پێ دەکات، پەیامی پاکی ئیسلام ڕابگەیەنێت و گەل و نەتەوەکەی خۆی بۆ لەباوەشگرتنی بانگهێشت بکات، ئەو زاتە نوورانییە دەچێتە سەر کێوی سەفا و ئاوازی پاکی و ڕاستگۆیی خۆی بۆ ئەوان دەچریکێنێت. ئینجا کاتێك ئەوان خۆشحاڵیی خۆیان بۆ ئەو نەغمەخوانیەی ئەو دەربڕی، ڕوویان تێ دەکات و پێیان دەڵێت: من نێردراوی خوای گەورەم بۆ ئێوە، ئەوەتا پڕ بە دەمی دەفەرموێت: "أَرَأَيْتَكُمْ لَوْ أَخْبَرْتُكُمْ أَنَّ خَيْلاً بِالْوَادِي تُرِيدُ أَنْ تُغِيرَ عَلَيْكُمْ أَكُنْتُمْ مُصَدِّقِيَّ قَالُوا نَعَمْ مَا جَرَّبْنَا عَلَيْكَ إِلاَّ صِدْقًا قَالَ فَإِنِّي نَذِيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ[2]."

---

(١) سیکولوجیة الجماهیر: گۆستاڤ لۆبۆن: (١٠١).

(٢) ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە: (٤٧٧٠).

واتە: "ئایا ئەگەر پێتان ڕابگەیەنم کە لەدواوەی ئەم کێوە کۆمەڵێك ئەسپسوار هەن دەیانەوێت بەسەرتاندا بدەن، ئایا ئێوە پێم بڕوا دەکەن؟ وتیان بەڵێ، هیچ کات جگە لە ڕاستی، شتی ترمان لە تۆ نەبینیوە. ئینجا فەرمووی: کەواتە بزانن من بۆ ئێوە ترسێنەرم و سزایەکی بەهێزم پێیە (بۆ ئەو کەسانەی کە بڕوام پێ ناکەن)."

تاکە چارە بۆ ڕێگەگرتن لەوەی چیتر ئایین بەهەڵە وەك نەیاری عەقڵ و لۆژیك و فەلسەفە هەژمار نەکرێت، تیشك خستنەسەر ئەو ڕەهەندە عەقڵانی و لۆژیکییانەیە کە لە ئاییندا بوونیان هەیە، پاشان ڕێگەنەدان بەو کەسانەی کە ئایین وەك میسۆلۆژیا و چیرۆك و ئەفسانە نیشانی خەڵك دەدەن، ئەمەش یان بەدوورخستنەوەیان لە کایە ئایینیەکان یان بە کردنەوەی خولی شیاندن و ئامادەکردنیان بۆ ئەو کارە.

ئەگەر ئەم کارەمان کرد، ئەوا ئایین و فەلسەفە بەیەکەوە ئەم شانۆی ژیانەمان بۆ وەجۆش دەهێنن و بەختەوەرمان دەکەن، بەپێچەوانەوە جەنگێکی هزری و ئایینی بەرەوڕوومان دەبێتەوە و تاکە قوربانییش تیایدا ئێمە دەبین، ئەمە وێڕای ئەوەی کە بەر نەفرەتی ئایین و ئاهی عەقڵ دەکەوین.

# بەشی شەشەم

# فەلسەفە و فەلسەفە

ئەفلاتون[1] لە کۆمارەکەی خۆیدا، بە جلۆکۆنی هاوڕێی دەڵێت: "لەمەودوا لەگەڵ من هاوڕا دەبیت کە ئەگەر خەڵکی لە فەلسەفە ڕابکەن، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسانەی بەناچاری هاتوونەتە ناوی و خۆیان خەریك کردووە بە ڕقوکینە و ململانێ لەناو خۆیاندا، وە تەنها کاریان بەخشینەوەی تۆمەت و سووکایەتی پێکردنی یەکترییە، ئەمانەش دوورترین کارن لە ڕەوشت و ڕێڕەوی فەیلەسووف[2]." فەلسەفە لەژێر هەڕەشەی بەکارهێنەرەکانیدا تووشی دوو جەنگی فیکری و ئایدۆلۆژی خەتەرناك بووە، کە هێز و توانای ڕەوتی عەقڵانیەتی دووچاری گومان و ڕەخنە و بێهێزی کردووە، بەم شێوەیەی خوارەوە:

---

(١) ئەفلاتون: فەیلەسووفێکی یۆنانییە، بە گەورەترین فەیلەسووفی فەلسەفەی کۆن هەژمار دەکرێت، ساڵی (٤٢٧پ.ز.) لەدایك بووە و ساڵی (٣٤٧پ.ز.) کۆچی دوایی کردووە. بەشێکی زۆری فەیلەسووف و قوتابخانە فەلسەفییەکانی ئیسلام کاریگەریی ئەم فەیلەسووفەیان بەسەرەوە هەیە و شوێنکەوتووەکانی لە ئیسلامدا پێیان دەگوترێ (ئیشراقییەکان/الإشراقیون)، بەشێك لە بەرهەمەکانی: (الجمهوریة، القوانین، محاورات أفلاطون،). بڕوانە: أعلام الفلاسفة: هێنری تۆماس: (٩٥). معجم الفلاسفة: جۆرج طرابیشي: (٧١).

(٢) الجمهوریة: ئەفلاتون: (٣٠٥).

## جەنگی ماسکدار

دیارترین جەنگ کە ئەمڕۆ بە عەقڵ دەکرێت، بریتییە لە بەکارهێنانی عەقڵ وەك ئامرازی جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوەی ئایین، کە لە واقیعدا بە خواست و ئارەزووی خۆی نییە، بەڵکو لەژێر فشار و دەسەڵاتی گرووپێکی دیاریکراوە کە بۆ مەبەستی تایبەت تووشی ئەم جەنگەی دەکەن.

گومان لەوەدا نییە ناکۆکی و تێکپڕژانی هزر و ئایدیا جیاوازەکان، تەوژم و شەپۆلێکی جیهانیی هاچەرخ و مۆدێرنێتەیە، بەردەوام وەك ئامرازی داگیرکردن و دەستەمۆکردنی گەلان بەکار دەهێنرێت، کە تیایدا وێرانکردنی ژێرخانی ئابووریی نەیاران و بەهێزکردنی هەژموون و هەیمەنەی خود، دیارترین لێکەوتە و فاکتەرە هەرە گرنگەکانی ئەم جەنگەن.

ئەم فۆرمەی جەنگ و دوژمنایەتیکردنە ئێستا لە جیهاندا شتێکی بەربڵاوە، بەتایبەت لە جیهانی ڕۆژئاوادا بەرامبەر بە جیهانی ئیسلامی، ئەمەش لە دەرئەنجامی کۆششی وڵاتانی ئەوروپا و ئەمەریکا بۆ قەتیسکردنی هێزی ئایین و ڕێگەگرتن لەو شەپۆل و تەوژمە ئایدۆلۆژییەی کە لەنێو وڵاتانی خۆرئاوادا سەری هەڵداوە و لە برەودایە.

هەڵبەت ئەم جەنگە لەژێر ماسکی تیرۆر و ڕووبەڕووبوونەوەی بیری توندوتیژی ئەنجام دەدرێت، تیایدا هەوڵ دەدرێت لە ڕێگەی هزر و لۆژیکەوە جەنگ دژی ئایین و بیریباوەڕداری بەرپا بکرێت.

ئەم جۆرە جەنگ و ململانێیە خاڵییە لە بوێری و ئازایەتی، چونکە وەك خۆی ئەنجام نادرێت و ماسکی تری دەخرێتە سەر، لەبری ئەوەی ڕاشکاوانە دژایەتی بۆ ئایین ڕابگەیەنرێت، بانگەشەی ئەوە دەکرێت کە ئامانج لەو جەنگە بەرەنگاربوونەوەی بیری توندڕەوییە، بۆ ئەوەی سیمای دژایەتیی ئایینی پێوە دیار نەبێت و وەك جەنگێکی فیکری هەژمار بکرێت.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە جەنگێکی چاوەڕوانکراوە، چونکە هەمیشە ئایدۆلۆژیا و ئایینەکان هێز و کاریگەرییان زیاتر بووە لە هزر و فەلسەفەکان، بە مەبەستی ڕێگەگرتن لە هەیمەنەی ئایین و بچووککردنەوەی مەودا و بواری کاردکرن و بڵاوبوونەوەشی، هەمیشە هەوڵ دراوە لە ڕێگەی عەقڵ و هزر و بۆچوونە مرۆڤایەتییەکانەوە بەرەوڕووی بوەستنەوە.

ئەم دژایەتیکردن و ڕێگەگرتنەی هزر و بۆچوونە مرۆڤایەتییەکانیش لە بڵاوبوونەوەی ئایدۆلۆژیا و بیروباوەڕە جیاوازەکان پەیوەندیی بە سروشتی عەقڵ و ئایینەوە نییە، بەڵکو پەیوەندیی بە بەرژەوەندیی ئەو کارەکتەرانەوە هەیە کە هەوڵ دەدەن لە ڕێگەی عەقڵ و هزری مرۆڤایەتییەوە جیهان ببەن بەڕێوە.

ئەم کارەکتەرانە کاتێك ئایین وەك لەمپەرێك دەبیینن لەبەردەم بەدیهاتنی ئەو خواستەیاندا، ناچارن بەرەوڕووی بوەستنەوە، جا بە هۆی ئەوەش کە بیروباوەڕی ئایینی لای زۆرینەی مرۆڤەکان بوونی هەیە و وەك شکۆمەندترین چەمك دێتە هەژمارکردن، ناتوانن بەئاشکرا و بەبێ بەکارهێنانی ماسکی ساختە ئەو کارە ئەنجام بدەن، بۆیە هەوڵ دەدەن لە ڕێگەی ترەوە ئەو دژایەتییەیان بۆ ئایین بخەنە ڕوو، تاوەکو بوار نەدەن زیاتر تەشەنە بکات، هەموو ئەمانەش لە سەردەمی مۆدێرنێتە و جیهانی هاوچەرخدا لەژێر پەردەی ڕووبەڕووبوونەوەی بیری توندڕەوی ئەنجام دەدرێت.

پێشتر لە بەشی سێیەمدا ئاماژەمان بەوەدا کە بەکارهێنانی فەلسەفە دژی ئایین، کارێکی نالۆژیکی و هەڵەیە، بۆیە لێرەدا زێتر باسی ناکەین، ئەوەی گرنگە لێرەدا زیادی بکەین ئەوەیە کە ئەم بەکارهێنانەی عەقڵ و فەلسەفە دژ بە ئایین، ئێستا لەژێر دەمامك و ماسکی ساختەدا ئەنجام دەترێت و ئامانج لێی پاراستنی بەرژەوەندیی گرووپێکی تایبەتە، هەروەك جۆرێکیشە لە بەکارهێنانی عەقڵ وەك ئامرازی جەنگ و بەرەنگاربوونەوەی نەیاران، بۆیە جەنگەکە جەنگێکی ماسکدارە.

## جەنگی خود

جگە لە بەکارهێنانی هزر و عەقڵ دژ بە ئایدۆلۆژیا و ئایینە جیاوازەکان کە ئێمە ناومان نا (جەنگی ماسکدار)، فۆڕمێکی تری ئەو بەکارهێنانەی عەقڵیش هەیە، ئەویش بریتییە لە بەکارهێنانی هزر و فەلسەفە دژ بە خۆی، کە ئێمە ناوی دەنێین (جەنگی خود). ئەم جۆرەش لە بەکارهێنانی عەقڵ دژ بە خۆی، لە دوو فۆڕم و شێوازی جیاوازدا بەدی دەکرێت، بەم شێوەیەی خوارەوە:

**یەکەم: جەنگی ئەرێنی (پۆزەتیڤ)**

ئەم جۆرە لە بەکارهێنان و شەڕکردنە بە عەقڵ، بریتییە لە بەکارهێنانی عەقڵ بەرامبەر بە عەقڵێکی تر کە ستایل و دەرکەوتنێکی جیاوازی هەیە، وەك ئەوەی لەنێوان قوتابخانە و ڕەوتە عەقڵانی و فەلسەفییە جیاوازەکانی جیهاندا بەدی دەکرێت.

بێگومان ئەم جۆرە لە بەکارهێنانی عەقڵ دژ بە عەقڵ، وێڕای ئەوەی دەبێتە مایەی بەدیارخستنی کەموکوڕییەکانی عەقڵ و کەمبوونەوەی ئاستی پشتپێبەستنی لای نەیارەکانی، بەڵام لە ڕاستیدا جەنگێکی تەواو سروشتی و ڕێگەپێدراوە، چونکە ئامانج لە عەقڵ و فەلسەفە، گەیشتنە بە کرۆکی شتەکان، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە عەقڵ و هزرە ڕاستەقینەکان لەبەرامبەر عەقڵ و لۆژیکە ساختەکاندا بەدیار بکەون و جەنگیان لەگەڵدا بکەن.

لەم فۆڕمەی جەنگی عەقڵ لەگەڵ خۆیدا، عەقڵ و لۆژیکە ڕاستەقینەکان مەبەستیان لەناوبردنی عەقڵانیەت نییە، بەڵکو تەنها دەیانەوێت ڕیشاڵە ئەستۆك و زیانبەخشەکانی عەقڵ لەناو ببەن و بیرۆکەی نوێ و تازە موتوربە بکەن، بۆیە مێژووش ئەم جەنگانە بە توراسێکی گرنگ و ئەزموونێکی باش هەژمار دەکات.

لە ڕاستیدا ئەم فۆڕمەی جەنگ تەنها بەڕواڵەت پێیان دەوترێت جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوە، بەڵام لە بنەڕەتدا بوونیادنانی ڕەوتی عەقڵانیەتە، هەروەها

هەوڵدانە بۆ تەواوکاریی مەعریفە و لۆژیکە مرۆڤایەتییەکان. کارەکتەرەکانی ئەم جەنگە نایانەوێت بیرمەند و فەیلەسووفە نەیارەکان بکوژن، تەنها دەیانەوێت لە هەڵە و کەموکوورییەکانی بیرکردنەوەیان ئاگاداریان بکەنەوە و ڕەوتی عەقڵانیەت بەرەو قۆناغی کامڵبوون ببەن.

بە هۆی ئەوەی کە ئامانجی ئەم دەبەریەکڕاچوونانە تەکامولی مەعریفەی مرۆڤایەتییە، بەردەوام ئەم جەنگە لە دۆخی تیۆریدا ماوەتەوە و نەچووەتە قۆناغی ڕووبەڕووبوونەوەی ماددی و مرۆیی.

دەشێت بوترێت هۆکاری چڕبوونەوەی ئەم جەنگە تەنها لە بواری تیۆریدا و نەگەیشتنی بە ئاستی ماددی، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بەردەوام کارەکتەرە سەرەکییەکانی ئەم جەنگە لە زەمەنێکی دیاریکراودا نەبوون، بەڵکو پانتاییەکی زەمەنی دوورودرێژ لەنێوانیاندا هەبووە، بۆیە جەنگەکان لە دوو زەمەنی جیاوازدا ڕوویان داوە، بۆ نموونە: ئەبو حامیدی غەزالی کاتێك هێرشێکی لۆژیکییانە و ئایینییانە دەکاتە سەر فەیلەسووفە یۆنانییەکانی وەك ئەفلاتون و ئەرستۆ و فەیلەسووفە ئیسلامییەکانی وەك فارابی و ئیبنو سینا لە دۆخێکدا بوو کە ئەوان لە ژیاندا نەمابوون، دواتریش کە ئیبنو ڕوشدی ئەندەلووسی هێرش دەکاتەوە سەر ئەبو حامیدی غەزالی و بەرگری لەوانی تر دەکات، ئەو کاتەش غەزالی لە ژیاندا نەمابوو، بۆیە جەنگەکە زێتر لە جەنگی کەلتوورێکی مردوو لەگەڵ کەلتوورێکی زیندوو دەچێت، نەك دوو کەلتوور و مەعریفەی زیندوو.

**بەڵام لە ڕاستیدا ئەم ئەگەرە زۆر لاوازە لەبەر دوو هۆکار:**

١- لە مێژووی ڕەوتی عەقڵانیەتدا نموونەی بەرچاو هەن کە کارەکتەرە سەرەکییەکان لە یەك سەردەمی دیاریکراودا بوون و ناکۆکیی فیکریشیان هەبووە، بەڵام ئەو ناکۆکییە تەنها تیۆری بووە و نەگەیشتووەتە ئاستی ڕووبەڕووبوونەوەی

ماددی و جەستەیی، وەك ئەوەی لەنێوان ئیمامی شافیعی و ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ئیمامی مالیك ڕووی داوە، کە هاوچەرخی یەکتر بوون و ناکۆکیی فیکری و تێگەیشتنی جیاوازیان بۆ دەقەکان هەبووە، بەڵام هیچ کات نەگەیشتووەتە ئەوەی ئەو ناکۆکییەیان پەل بکێشێت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی جەستەیی.

٢- ئەگەر فاکتەری زەمەن هۆکاری ڕوونەدانی جەنگی نێوانیان بووایە، پێویست بوو ئەو شەڕە لەنێوان هەوادارانی ئەو قوتابخانە جیاوازانە ڕووی دابا، بەڵام ئەوەی ئێستا دەبینرێت چ لەسەر ئاستی عەقڵانیەتی مرۆڤایەتی یان عەقڵانیەتی ئایین چەندین ڕێباز و ڕەوتی جیاواز بوونیان هەیە، بەڵام ناکۆکیی نێوانیان تەنها ناکۆکیی فیکرە و شۆڕنەبووەتەوە بۆ ناکۆکیی ماددی و جەستەیی.

دەشێ بوترێت لە ڕاستیدا جەنگی ماددی لەنێوان هەوادارانی ئەم قوتابخانە عەقڵانی و ئایینیانە ڕووی داوە، وەك ئەوەی لەنێوان بزوتنەوەی عەقڵانیەتی ئیسلامی هاتە کایەوە بەتایبەت لەنێوان موعتەزیلەکان و قوتابخانەی ئەشعەرییەکان و ئەهلی کەلام، بە هەمان شێوە ئەو جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوەیەی کە لەنێوان هەوادارانی قوتابخانە و ڕەوتە فیقهییەکانی ئایینی ئیسلام بەرپا بووە، یان ئەو دژایەتی و ناکۆکییەی لەنێوان قوتابخانە و ڕێبازە جیاوازەکانی بیروباوەڕی مەسیحیدا بوونی هەیە.

لە وەڵامدا دەگوترێت کە: لە ڕاستیدا ئەو جەنگانە کە ڕوویان داوە، لە بنەڕەتدا ڕیشاڵ و بنەمایەکی سیاسییان هەبووە نەك فیکری و لۆژیکی، بە بەڵگەی ئەوەی کە ڕووبەڕووبوونەوەکان بەردەوام لەلایەن دەسەڵاتی سیاسی سەرکردایەتی کراوە، نەك دەسەڵاتی هزری و مەعریفی، بۆیە دەسەڵات بەردەوام پشتگیری لەو ڕەوت و ڕێبازە کردووە کە خزمەت بە مانەوە و بەردەوامبوونی خۆی دەکات، بەمەش ناچار دژایەتیی ڕەوت و ڕێبازەکانی تری کردووە.

دوا جار پێویستە بزانین کە ئەم فۆڕمەی جەنگ لەپێناو عەقڵە و شێوەیەکی عەقڵانی ڕەهای هەیە و تا سەر ئێسقان ڕێگەپێدراوە، تەنها کارێك کە گەرەکە تیایدا ڕەچاو بکرێت، بریتییە لە سەروەربوونی عەقڵ و ڕێزگرتن لە کاراکتەری بەرامبەر وێڕای جیاوازی بیروبۆچوونەکان.

## دووەم: جەنگی نەرێنی (نێگەتیڤ)

بەڵام فۆڕمێکی تری جەنگی عەقڵ هەیە، ئەویش بریتییە لە شەڕی عەقڵ لەگەڵ ئەو کارەکتەرانەی کە لەناوەوەی بازنەی خۆیدا هەن، بەبێ ئەوەی پاساوێکی دیاریکراوی لۆژیکی و ڕێگەپێدراو هەبێت، کە ئێمە ئەم جەنگە ناو دەنێین جەنگی خۆبەخۆ (خۆکوژی).

بێگومان جەنگی عەقڵ لە هەموو بوارێکدا مایەی زیان و ئەشکەنجە و ئازارە، بەڵام بەشێك لە ئازارەکان مایەی لەدایکبوونی عەقڵی نوێ و بۆچوونی تازەن، وەك نموونەی فۆڕمی یەکەم، کە عەقڵ لە دەرئەنجامی ڕووبەڕووبوونەوە زیانی پێ دەگات و کەموکووڕییەکانی دەردەکەون، بەڵام دوا جار ئەم ئازارە دەبێتە مایەی لەدایکبوون و هاتنەدونیای عەقڵانیەتی ڕاستەقینە.

بەپێچەوانەوە، بەشێك لە جەنگەکان دەبنە مایەی مردن و لەپەلوپۆکەوتن، وەك فۆڕمی شەڕ و جەنگ کردنی عەقڵ لەگەڵ خۆی، کە لەسەر بنەمای برەودان بە ڕەوتی عەقڵانیەت و چارەسەرکردنی کەموکورتییەکانی نایەتە بەرپاکردن، بەڵکو لەپێناو بەرژەوەندیی نامەعریفی، و لەسەر حسابی بەها و پرەنسیپەکانی عەقڵ دێتە ئەنجامدان. لەم فۆڕمەی جەنگدا، عەقڵ خودی خۆی دەبێتە فاکتەر بۆ لەناوبردنی خۆی، بۆیە ئازاری عەقڵ لەم حاڵەتەدا ئێجگار زۆرترە، چونکە ئەو ئازار و زیانانەی لە توخم و خانەوادەی خۆی تووشی دەبێت، ناخهەژێنترە بە بەراورد لەگەڵ ئەو ئازار و مەینەتییانەی لەدەرەوەی خۆی بەرەوڕووی دەبنەوە.

سەرکەوتنی ڕەوتی عەقڵانیەت بەندە بە تەباییی عەقڵ لەنێو خۆیدا و کارکردن لەپێناو بونیادنانی کۆڕبەندێکی هزری بۆ کۆی مرۆڤایەتی، هاوشان لەگەڵ تەرخانکردنی هێز و تواناکانی خۆی بۆ بەرەنگاربوونەوەی نەیارەکانی.

بەڵام کاتێك عەقڵ و فەلسەفە دژ بە خۆیان وەگەڕ دەخرێن، هەم ڕەوتی عەقڵانیەت دووچاری شکست دەبێتەوە، هەم مرۆڤایەتیش دەکەوێتە بەر پرسیاری خودی عەقڵ، کە دەشێ لە هەر کاتێکدا لەپای ئەم جەنگپێکردنەی دووچاری ئاهی خۆیان بکاتەوە. لە جیهانی مۆدێرنێتە بەگشتی و کۆمەڵگەی خۆمان، بەتایبەتی عەقڵ زێتر بۆ فۆڕمی دووەم بەکار دەهێنرێت، کە ئەمەش پێچەوانەی خواستی فەلسەفە و عەقڵ خۆیەتی.

هەر لە کۆنەوە عەقڵ تەنها لە بەرژەوەندیی مرۆڤدا خراوەتە کار، تەنانەت دەستپێکی سەرهەڵدانی بەشێك لە زانستە فەلسەفییەکان دەگەڕێتەوە بۆ کارکردن لەپێناو داهێنان، داهێنانیش لەپێناو دۆزینەوەی چارەسەر بۆ گرفتەکانی مرۆڤ، بۆیە هەر بەکارهێنانێکی عەقڵ دژ بە عەقڵ، داهێنانێکی خراپ و نامرۆڤانەیە و هۆکارێکە بۆ شکستپێهێنانی پرۆژە و هەوڵە پۆزەتیڤەکانی هزر و لۆژیك.

لە دونیای هاوچەرخیشدا، سەرکەوتنی شارستانیەتەکان پەیوەستە بە ڕێژەی بەکارهێنانی عەقڵ لە خزمەت بەرژەوەندی و خواست و داواکارییەکانی مرۆڤایەتی.

وڵاتانی ڕۆژئاوا کە نموونەی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا و هزر و فەلسەفەن، سەرچاوەی سەرکەوتنەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ سوودبینین لە عەقڵ و زانست و دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی عەقڵ دژ بە خواست و بەهاکانی خۆی، بۆیە توانیویانە گەورەترین شارستانیەتی مۆدێرن و هاوچەرخ بۆ خۆیان دروست بکەن، کە تیایدا تاك زۆرترین ماف و خواست و خولیاکانی بۆ فەراهەم کراوە.

بەڵام ئەوانیش لە ئاست سوودبینین لە عەقڵ و زانست ڕێژەیین، بۆیە پێشکەوتن و مۆدێرنێتەی بەشێکیان باڵاترە لە هی بەشێکیان، کە بێگومان ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی پشتبەستنیان بە عەقڵ و بەها مرۆڤایەتییەکان.

ئەوەی جێی بایەخە، وڵاتە پێشکەوتووەکان تەنانەت لە کاتی هێرشکردنە سەر ئایینیش، هەوڵ دەدەن سوود لە عەقڵ و هزر و فەلسەفە ببینن، بۆیە توانیویانە مۆرکێکی مرۆڤایەتی بەسەر ئەو جەنگە فیکری و ئایدۆلۆژییەدا بدەن، کە بەرامبەر بە ئیسلام و موسڵمانان ئەنجامی دەدەن.

لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا، ئەرکی عەقڵ بریتییە لە کارکردن دژ بە دوژمن و زیادکردنی هەژموون و پانتاییی دەسەڵاتەکانی خۆی، کەچی بەپێچەوانەوە لە کۆمەڵگەی ئێمەدا کاری عەقڵ بریتییە لە ناشیرینکردنی خۆی و بەرتەسککردنەوەی مەودای دەسەڵاتەکانی.

کۆمەڵگەی ئێمە بە شێوەیەکە، خەڵکە سادە و هەژارەکە دژی نەیاران و دوژمنان دەجەنگن، تەنانەت پارێزگاری لە عەقڵمەند و ڕۆشنبیرانی وڵاتیش دەکەن و سەرچاوەی ژیانێکی ئاسوودەی کاربەدەستان و ڕەوتی ڕۆشنگەرین، کەچی لەبەرامبەردا ڕەوتە ڕۆشنگەر و بیرمەندەکە لەبری دانانی نەخشەڕێگای ڕزگاریی وڵات، خەریکی جەنگ و دژایەتیی یەکترن، ئیدی عەقڵ لەبری ئەوەی ڕزگارکەر بێت، وێرانکەرە، عەقڵانیەت لەبری ئەوەی ئامرازی جەنگی دوژمنان بێت، ئامرازی خۆکوژی و جەنگی ناوخۆیە.

ئەوەی زێتر هزر و عەقڵ و فەلسەفەی لای خەڵك ناشیرین کردووە، ئەو دیمەنە ناشارستانی و نالۆژیکییەی کارەکتەرە هزرییەکانە، کە لەسەر سەکۆ و شاشەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن نیشانی مرۆڤایەتی دەدەن، کە بوونەتە مایەی پێکەنین و خەجاڵەت بۆ خودی هزر و فەلسەفە و بزاڤی عەقڵانیەت.

ئەوەی لە جیهانی ئیسلامی و کۆمەڵگەی خۆماندا ڕوو دەدات و بەدی دەکەین، شانۆیەکی نەبڕاوەی نیشاندانی عەقڵ و ڕۆشنبیرییە بە سیمایەکی شێواو و جەستەیەکی شەکەت، کە نەك توانای ئەوەی نییە مرۆڤایەتی ڕزگار بکات، بەڵکو توانای خۆڕزگارکردنیشی نییە.

هێندەی بیرمەندەکانمان دژ بە یەکتر ئاڵای نەبەردی و بەرخودان و شۆڕشیان بەرز کردووەتەوە، هێندە نەیانتوانیوە هزری خۆیان بۆ بەرژەوەندیی هاونیشتیمانیان بەکار بهێنن، ئەمەش وای کردووە مرۆڤی ئێمە ڕقی لە هەرچی کۆڕ و دیبەیت و کۆڕبەندی هزری و ڕۆشنگەرییە ببێتەوە، چونکە دوا جار دەزانن ئەو کۆبوونەوانە لەپێناو ڕەوتی عەقڵانیەتدا نین، بەڵکو هەمووی لەپێناو شکاندنی عەقڵ و بەگژداچوونەوەی یەکترییە.

سەرئەنجام کۆمەڵگەی ئێمە وەك تەواوی کۆمەڵگە ئیسلامییەکان دووچاری چەقبەستوویی و دواکەوتن بووە، ئۆباڵی هەموو ئەو دواکەوتنەش لە ئەستۆی ئەم شێوازەی بەکارهێنانی توانا عەقڵی و لۆژیکییەکانی مرۆڤدایە، کە لەجیاتی ئەوەی گەشە بەو توانایانە بدرێت لەپێناو داهێنان و بووژاندنەوەی وڵات، تۆوی ڕقەبەرایەتی و یەکتر سڕینەوە لەنێو کۆمەڵگەدا دەچێنرێت، بۆ بەرەنگاربوونەوەی یەکتری و بڵاوکردنەوەی شەڕ و نەهامەتی لەنێو هاوڵاتیاندا.

هەرچۆنێك بێت جەنگی عەقڵ لەگەڵ ئایدۆلۆژیا و عەقڵە جیاوازەکانی تر مایەی ئەرگۆمێنت و قبوڵکردنە، چونکە وێڕای زیانگەیاندن بە ڕەوتی ڕۆشنگەری، دەتوانێت مرۆڤ لە ڕووی ناخ و ویژدانەوە بگەیەنێتە ئامانج.

بەڵام جەنگی عەقڵ لەگەڵ خودی عەقڵ یان بەکارهێنانی عەقڵ بەرامبەر بە خودی خۆی، لە هەموو بارێکدا جگە لە زیانگەیاندن بە عەقڵانیەت و دوورخستنەوەی مرۆڤایەتی لە کایە و پرس و بەها فیکرییەکان، هیچ بایەخ و

ئەنجامێکی تری نابێت، ئەمە وێڕای ئەوەی خۆیشی دژ بە کارەکتەرەکانی دەوەستێتەوە و نەفرینبارانیان دەکات.

عەقڵ و ئایدۆلۆژیا تەنها ئەو کاتانە لەناو دەچن کە خۆیان ببنە دوژمنی خۆیان، هەرگیز شۆڕشی چەکداری توانای کپکردنەوەی شۆڕشی ئایین و عەقڵ و فەلسەفەی نییە، دەشێ بۆ ماوەیەك بێدەنگیان بکات، بەڵام لە هەر کاتێکدا دەتوانن دەنگی عەقڵانیەت و ئیمانی خۆیان بگەیەنن، ئەگەر نەمری لە جیهاندا بۆ شتێك هەبێت، ئەوا بۆ ئایدۆلۆژیا و هزرو فەلسەفەکان دەبێت، کۆن دەبن، بەڵام لەناو ناچن، دەکوژرێن، بەڵام نامرن، بەخاك دەسپێردرێن، بەڵام ڕۆحیان هەمیشە لەنێو کۆمەڵگەدا دەبێت.

بەڵام کاتێك مرۆڤ بەهەڵە یا بۆ ئامانجێکی دیاریکراو عەقڵ دژی عەقڵ بەکار دەهێنێت، ئەوا لە یەك کاتدا هەردووکیان تووشی کەمئەندامبوون دەبن، دەشێ هەمیشە لە دنیادا بوونیان هەبێت، بەڵام بەردەوام بێبایەخ و بێ هاندەر و پاڵپشت دەمێننەوە، تەنانەت نەبوونیان باشتر دەبێت بۆ خۆیان و بۆ هەوادارەکانیان.

ئەوەی ئێمە لەم بەشەدا ویستمان بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بیخەینە ڕوو، بریتییە لە ئاماژەدان بەو ڕەوتەی ئێستا هەیە بە ناوی عەقڵانیەت، عەقڵی خستووەتە مەترسی، بە هۆی بەکارهێنانی عەقڵ دژی خواست و سروشتی خۆی، بەمەش هەم عەقڵ هەم عەقڵانییەکان دووچاری کێشە و ڕەخنە هاتوون، کە ئەگەر ئەم ڕەوشە بەم شێوەیە بەردەوام بێت، تەواوی مرۆڤایەتی دەکەوێتە ژێر ئاهی عەقڵ و فەلسەفە و لۆژیك.

# بەشی حەوتەم

# ئایین و ئایین

ئایین چەمکێکی شێوە موگناتیسییە بەرامبەر بە مرۆڤایەتی، لە کۆمەڵگەدا هەرچی توخمی مرۆڤ بێت، هەوڵ دەدات بۆ خۆی ڕابکێشێت و لە چێوارچێوە و سنووری خۆیدا کۆی بکاتەوە.

هێزی ئایین وەك هێزی موگناتیس جەزاب و ڕاکێشەرە، ئەگەر موگناتیس هێزی ڕاکێشان و کۆکردنەوەی توخمە ئاسنینەکانی نەبێت، سیفەت و نیشانەی موگناتیسی لێ دەسەنرێتەوە. بە هەمان شێوە، هەر کاتێکیش ئایین توانای کۆکردنەوەی مرۆڤایەتیی نەبوو، یان لەبری کۆکردنەوە، فاکتەری دوورخستنەوەی مرۆڤایەتی بوو لە یەکتری، ئەوا سیفەت و نیشانەی ئایینبوونی لێ دەسەنرێتەوە.

بۆ ئەوەی بتوانین ئامانجی ئەم بەشەمان بەڕوونی بگەیەنین، پێویستە لە سەرەتادا ئامانجی ئایینەکان بخەینە ڕوو، دواتر دەست بخەینە سەر ئەو نموونانەی کە تیایدا ئایین وەك نەیار و دوژمنی ئایین بەکار دەهێنرێت.

**پەیامی ئایینەکان:**

ئایینەکان لە بنەڕەتدا هەڵقوڵاوی یەك سەرچاوەن، هەموویان یەك پەیام و خواستیان هەیە، ئەویش یەکتاپەرستیی خودا و یەکپارچەییی مرۆڤایەتی، ئەمە جگە لە ئایینە دەستکردەکانی مرۆڤ کە پەیامێکی فرە خودایی، بەڵام یەکپارچەییی مرۆڤایەتیان هەیە.

هیچ ئایینێکی ئاسمانی ڕێگەی بە هاوبەشدانان بۆ خودا نەداوە، هیچ ئایینێکیش بۆی ڕەوا نەبووە دژایەتیی ئایینی پێش خۆی بکات، یان هەوڵ بدات یەکپارچەییی مرۆڤایەتی تێك بشکێنێت، مەگەر لە کاروباری ڕۆژانەدا هەمواری بەشێك لە دەق و تێکست و یاسا و بڕیارەکانی ئایینی پێش خۆی بکاتەوە، کە ئەمەش لە شەریعەتی پێغەمبەراندا (سڵاوی خوایان لێ بێت) ڕۆشن و نمایانە.

ئایینی ئیسلامیش وەك دواهەمین پەیام و ڕێنوماهی خوای گەورە بۆ مرۆڤایەتی، هەمان ئەو ئەرکەی هەیە، لە دەق و تێکستەکانیدا دووپاتی یەکتاپەرستی خودا دەکاتەوە و یەکپارچەییی موسوڵمانانیش دەکاتە کاری لەپێشینەی خۆی، ئایینیەکانی پێش خۆیشی تەواو دەکات، لە هەمان کاتدا بەشێك لە کاروباری ڕۆژانە و پەرستشە ئایینییەکان هەموار دەکاتەوە و نوێکارییش لە هەندێکیاندا دەکات، ئەمە بەبێ ئەوەی هیچ توانج و ڕەخنەیەك ئاڕاستەی خودی دەق و تێکست و کارەکتەرە ڕاستەقینەکانی ئایینەکانی تر بکات، یان هەوڵ بدات هێز و توانای خۆی بۆ دژایەتیکردنی ئەوان بەکار بهێنێت.

ئەوەتا خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ﴾[1].

(١) سوورەتی (المائدة)، ئایەتی: (٤٨).

واتە: "ئێمە قورئانمان هاوڕێ لەگەڵ هەموو حەقیقەت و ڕاستییەکدا بۆ تۆ دابەزاندووە، ڕاستی و دروستیی کتێبەکانی پێش خۆیشی دیاری دەکات و چاودێرە بەسەر هەموویاندا."

دوا جار ئایینی ئیسلام هیچ کات خۆی وەك نەیار و دوژمنی ئایینەکانی تر نمایش ناکات، تەنها کارێك کە دەیکات تەواوکردنی پەیامی ئەوان و تێرکردنی لایەنی ڕۆحی و مەعریفیی مرۆڤایەتییە بەگشتی.

پەیامبەری ئیسلام موحەممەدﷺ، کە بەرجەستەکەری ڕەسەن و فەرمیی ئایینەکەیەتی جگە لە دژایەتیکردنی ئەو کەلتوورە نامرۆڤانەی کە لە کۆمەڵگەدا بوونیان هەبوو، هەرگیز نەکەوتە بەکارهێنانی ئایینەکەی خۆی وەك نەیار و دژمنی ئایینە ئاسمانییەکانی تر، بەڵکو بەپێچەوانەوە بە ڕێز و حورمەتەوە باسی پەیامبەرانی پێش خۆی دەکرد و کاملبوونی بڕوای شوێنکەوتووەکانی خۆی دەبەستەوە بە بڕوابوون بە پەیام و بەرنامەی ئەوانیش. ئەوەتا قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ﴾(١).

واتە: "پێغەمبەر و ئیمانداران باوەڕیان هەیە بەوەی لەلایەن پەروەردگاریانەوە هاتووەتە خوارەوە، هەموویان باوەڕیان هەیە بە خوا و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی، دەڵێن: هیچ جیاوازییەك ناکەین لەنێوان هیچ پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرەکانی خودا، هەروەها وتیان گوێڕایەڵ و ملکەچین بۆ بەدیهێنەرمان، پەروەردگارا لێخۆشبوونی تۆمان دەوێت و سەرئەنجام هەر بۆ لای تۆیە گەڕانەوە."

---

(١) سوورەتی (البقرة)، ئایەتی: (٢٨٥).

ئامانجی ئەو زاتە ﷺ لە ئایینەکەیدا، کۆکردنەوەی مرۆڤایەتی بوو لەسەر خوانی یەکپارچەیی و یەکتاپەرستی، بۆیە ئەمەی وەك بەخشش و خەڵاتێکی خودایی بۆ شوێنکەوتووەکانی باس دەکرد. ئەوەتا خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْۚ وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ كُنتُمۡ أَعۡدَآءٗ فَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِكُمۡ فَأَصۡبَحۡتُم بِنِعۡمَتِهِۦٓ إِخۡوَٰنٗا وَكُنتُمۡ عَلَىٰ شَفَا حُفۡرَةٖ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنۡهَا ﴾[1].

واتە: "هەر هەمووتان بەتوندی دەست بگرن بە ئایینی خواوە و پەرتوبڵاو مەبن، یادی ناز و نیعمەتی خوا بکەنەوە بەسەرتان، چونکە کاتی خۆی دوژمنی یەکتر بوون، ئەوە بوو دڵەکانتانی بە هۆی نیعمەتی ئیسلامەوە پەیوەست کرد بە یەکەوە و هەموو بوونە برای یەکتر، هەروەها ئەو کاتە ئێوە لەسەر لێواری چاڵێکی ئاگر وەستابوون و خەریك بوو بکەونە ناوی، بەڵام خوا بە ڕەحم و میهرەبانیی خۆی لەو ئاگرە ڕزگاری کردن."

بە درێژاییی سەردەمی ژیانی سەروەری مرۆڤایەتی ﷺ و جێنیشین و هاوەڵانیش‌رضي الله عنهم – تا ئەو ساتەی ئەو لەناویاندا بوو– هیچ کات ئایین دژ بە ئایین بەکار نەهێنراوە، چونکە ئەوان دەیانزانی خواست و ئامانجەکانی ئایین نانەوەی شەڕ و دژایەتی نییە لەنێو ئایینەکان و هەر هەوڵ و بڕیارێکی لەو جۆرەش، لە شکۆی ئایین دێنێتە خوارەوە و موسوڵمانانیش بێهێز دەکات.

ئەوەتا جوولەکەکان لە مەدینەی مونەوەرەدا خاوەن ئایدۆلۆژیا و ئایینی تایبەت بە خۆیان بوون، بەبێ ئەوەی هیچ کات ناچار بکرێن واز لە ئایین و

---

(١) سوورەتی (آل عمران)، ئایەتی: (١٠٣)

پەرستشەکانیان بهێنن، وەك لە دەستووری مەدینەدا هاتووە: "وإنّ يهود بني عوف أمّة مع المؤمنين، لليهود دينهم، وللمسلمين دينهم[1]."

واتە: "جوولەکەکانی نەوەی عەوف گەلێکن لەگەڵ موسڵمانان، جوولەکەکان ئایینی خۆیان هەیە و موسڵمانانیش ئایینی خۆیان هەیە."

ئەگەر لە سەردەمی ئەو زاتەدا ﷺ ئایین دژی ئایینەکانی تر بەکار نەهاتبێت، ئەوا بە بێگومان بەکارهێنانی ئایین– مەبەستمانە ئیسلامە– دژی خۆی، هەر بوونی نەبووە، تەنانەت ڕۆژێك لە ڕۆژان هاوەڵان ﵃ تا ئەو ساتەی ئەو لەناویاندا بوو، بە هۆی ئایینەوە دژایەتیی یەکیان نەکردووە، هیچ کامیان ئایینی دژ بەوەی تر بەکار نەهێناوە، بەرژەوەندیی تاکەکان نەبووە مایەی ئەوەی ئایین بکەن بە ئامرازێك بۆ دوژمنایەتیی هاوئایینەکانیان، ئەوان ئەو کارەیان ئەنجام نەدەدا نەك لەبەر ئەوەی نەیاندەتوانی و پێویستیان پێی نەبوو، بەڵکو لەبەر ئەوەی دەیانزانی ئەو کارەیان پێچەوانەی سروشت و بەها و پڕەنسیپەکانی ئایینەکەیانە، هەر بۆیە بەم شێوازە پیادەکردنەی ئایین، توانییان خۆشترین ژیانی ڕۆحی و پتەوترین بیروباوەڕی ئایینی بۆ خۆیان بەرجەستە بکەن و ببنە نموونەیەکی پرشنگداری تەبایەتی ئایین و ئایینەکان. تەنها ئەوەی لێرەدا پێویستە بوترێت ئەوەیە، کە ئیسلام وەك دواهەمین ئایینی خودا دژی گۆڕین و دەستکاریکردنی دەقەکانی ئایینە ئاسمانییەکان و شێواندنیان لەلایەن پەیڕەوانیان دەوەستایەوە و دژایەتیی خۆی بۆ هەموو جۆرە هاوبەشدانان و لادانێك لە ڕێبازی پێغەمبەران (دروودی خوایان لەسەر بێت) ڕاگەیاند.

---

(١) السيرة النبوية: ابن هشام: (٢/ ٣٢١)

## دەستپێکی کەوتن

کاتێك ئایین بووە ئامرازێك بۆ دژایەتیکردنی ئایین و بڕواداران دەق و تێکستە ئایینییەکانیان لە مانا و ئامانجە ڕاستەقینەکان وەلا دا و بۆ مەبەستی زاڵکردنی بیروبۆچوونە تایبەتەکانی خۆیان بەسەر لایەنی بەرامبەر بەکاریان هێنا، ئەوکات ئارامی و تەبایی و یەکپارچەیی لەنێو بڕواداران درزی تێ کەوت و دەلاقەی ئاژاوە و شەڕانگێزی و ناکۆکی بەڕوویاندا بوویەوە.

سەرەتای بەکارهێنانی ئایین دژ بە خۆی لە مێژووی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا، لە جەنگی خەواریجەکان دژ بە ئیمامی عەلی ﵁ و هاوەڵانی تری پێغەمبەر ﷺ دەست پێ دەکات، ئیدی هەر ئەوکات نەفرەتی ئایین ڕووی تێ کردن و یەکپارچەییی نێوانیان کەوتە مەترسی، دوا جار سەری کێشا بۆ کوشتار و خوێنڕێژی.

ئەم دژایەتیکردنەی نێوان بڕوادارانی ئایینە جیاوازەکان بە درێژاییی مێژوو، وای لە بەشێك لە توێژەران و نووسەران کردووە کە بگەنە ئەو ئەنجامەی ئایینەکان لەبری دوژمنایەتیکردنی بێباوەڕی، دژایەتیی یەکتر دەکەن، بڕوادارانیش لەبری دژایەتیکردنی بێباوەڕان، دژایەتیی مرۆڤە باوەڕدارەکان دەکەن. نووسەری بەناوبانگی ئێرانی دکتۆر عەلی شەریعەتی[1]، لە دەستپێکی پەرتووکی (دین ضد الدین) ئاماژە بۆ ئەو بۆچوونە دەکات، ئەو وای بۆ دەچێت کە قەناعەتێك لای زۆرینەی خەڵکی هەیە، پێیان وایە ئایین هەمیشە دژی کوفر و بێباوەڕی بووە و ئەو جەنگەی بە درێژاییی مێژوو بەردەوام بووە، هەمیشە لەنێوان ئایین و نائایین (الدين واللآدين)دا بووە، بەڵام ئەو پێی وایە کە ڕاستییە مێژووییەکان پاڵپشتیی

(١) عەلی شەریعەتی: ناوی عەلی کوڕی موحەممەدی کوڕی تەقێی شەریعەتییە، نووسەر و بیرمەند و توێژەرێکی ئێرانییە، پسپۆڕیی لە زانستی کۆمەڵناسی و ئایینەکاندا هەبووە، ساڵی (١٩٣٣ز) لە خوراسان لەدایك بووە و ساڵی (١٩٧٧ز) لە لەندەن کوژراوە، دوو بڕوانامەی دکتۆرای لە مێژووی ئیسلام و زانستی کۆمەڵناسیدا بەدەست هێناوە. بڕوانە: هكذا تكلم علي شريعتي: فاضل رسول: (٧).

پێچەوانەی ئەو بۆچوونە دەکەن کە ئێستا باسمان کرد، بە شێوەك کە ئایین تەنها بە ئایین بەرهەڵستی کراوە و ئایین تەنها دژی ئایین وەستاوەتەوە.

ئینجا دواتر ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لە هەر کات و شوێنێکدا ئایینێکی نوێ سەری هەڵدابێت، دوو پرس بوونیان دەبێت:

**یەکەم:** ئەو ئایینە نوێیە لەسەرپشت و حسابی ئایینەکەی پێش خۆی بەدیار دەکەوێت، تەنانەت بۆ ئەو ئامانجە بەدەر دەکەوێت کە ڕووبەڕووی ببێتەوە.

**دووەم:** ئایینە کۆنەکە و خەڵکەکەشی یەکەمین کەس دەبن کە جەنگ دژی ئایینە نوێیەکە بەرپا دەکەن و ئیعلانی ڕووبەڕووبوونەوەی دەکەن[1].

لە ڕاستیدا ئەم بۆچوونەی شەریعەتی دەکرێت لە دوو ڕەهەند و گۆشەنیگای جیاوازەوە سەیر بکرێت و لێکدانەوەی بۆ بکرێت، بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- دەشێ مەبەست لێی دژایەتیکردنی دەق و تێکستە ئایینییەکان بێت بۆ یەکتر، بێگومان ئەم بۆچوونەشی وێڕای ئەوەی پێچەوانەی دەق و تێکستە قورئانییەکانە، زۆر دوورە لەو ئامانج و خواستەی کە نووسەر دەیەوێت بیگەیەنێت.

پێچەوانەی دەقە ئایینییەکانە، چونکە ئایینە ئاسمانییەکان وەك دەق و تێکستی نووسراو بە هیچ شێوەیەك بۆ دژایەتیکردنی یەکتر نەهاتوون، بەڵکو بۆ تەواوکردنی یەکتر هاتوون وەك پێشتر ئاماژەمان پێی دا و دووریشە لە ئامانجی نووسەر، چونکە ئەو دەیەوێت لە ڕووی مێژووەوە ئەو بابەتە بخاتە ڕوو، بێگومان مێژووش مرۆڤەکان دەینووسنەوە و بەرجەستەی دەکەن نەك دەق و تێکستی ئایینەکان.

٢- هەروەها دەشێ مەبەست لێی دژایەتیکردنی پەیڕەوکارانی ئایینەکان بێت بۆ یەکتری، کە ئەمەیان هەم مێژوو بۆمانی دەسەلمێنێت، هەم نزیکترە لە خواست و مەبەستی نووسەر.

---

(١) بڕوانە: دین ضد الدین: دکتۆر علی شەریعەتی: (٢٣-٢٧).

بەڵام لای ئێمە گرنگ نییە نووسەر کام ئەگەری لا مەبەستە، بەڵکو ئەوەی لای ئێمە گرنگە ئەوەیە کە لە مێژوودا ئەوەی بینراوە ئاییندارەکان دژی یەکتر بوون نەك ئایینەکان، دوا جار جەنگی نێوان ئایینەکان لە دەرئەنجامی ڕاڤە و هەڵوێستی شوێنکەوتووەکانیان سەری هەڵداوە، بەڵام ئەو جەنگە کاریگەریی خراپی هەبووە بۆ سەر خودی ئایینەکان و ڕووبەڕووی ڕەخنە و کێشەی کردوونەتەوە.

ئەگەر گریمان نووسەر ئەگەری یەکەمی لا مەبەستە و بۆچوونەکەشی ڕاستبێت، تەنها تا ئەو ئاستە ڕاستە کە بڵێین ئایینێك دژی ئایینێکی تری جیاواز لە خۆی جووڵاوەتەوە، وەك ئەوەی بڵێین: ئایینی مەسیحی بۆ دژایەتیکردنی ئایینی یەهودی هاتووە، دواتر ئایینی ئیسلامیش بۆ دژایەتیکردنی ئایینی مەسیحیەت هاتووە، سەرئەنجام ئەو ناکۆکییەی نێوان بڕواداران پەیوەستە بە دژایەتیی خۆڕسکی نێوان ئایینە جیاوازەکان خۆیان.

ئەم گریمانەیە ئەگەرچی بەپێی دەقەکان دوورە لە ڕاستی، بەڵام ئەگەر دانی پێدا بنێین لە ڕووی لۆژیك و عەقڵەوە جێگەی ئەرگۆمێنت و قبوڵکردنە، چونکە هەموو ئایدۆلۆژیا و بیروباوەڕێکی ئایینی دەیەوێت سەرمەدی و نەمری بۆ خۆی دەستەبەر بکات، ئینجا کاتێك لەمپەرێك دێتە بەردەم ئەو خواستەی، ئاساییە هەموو هەوڵێك بدات بۆ لادان و لەناوبردنی ئەو لەمپەرە.

بەم لێکدانەوەیەش بێت، شەڕی نێوان ئایینە جیاوازەکان کارێکی ئاساییە و لێکەوتەی ئەو سروشتەیە کە ئایینەکان هەیانە سەبارەت بە خواست و خەونی نەمری و بەردەوامبوونیان.

بەڵام ئەوەی ناسروشتییە لە دژایەتیکردن و شەڕی ئایینەکان بریتییە لە شەڕکردن دژی خۆیان، ئەمەش کاتێك ئایینێکی تایبەت دژی خۆی دەخرێتە کار و هەوڵ دەدرێت هێز و توانا و دەقەکانی دژی هۆگران و شوێنکەوتوانی خۆی بخرێنە

کار، ئەوکات ناسروشتی ئایین هەستی پێ دەکرێت و نەفرەتی ئایین دژی بڕوادارەکان سەر دەردەکات.

تا ئێرە ڕوونە کە ئایین ناکرێت نە دژی ئایینێکی تر بێت نە دژی خۆی، هەر بۆچوونێکیش لەم بارەوە هۆکارەکەی مێژووی بڕوادارەکانە کە لە ڕێگەی بەهەڵە بەکارهێنانی ئایین بوونەتە هۆی ئەوەی وا دەربکەوێت کە خودی ئایینەکان دژی یەکترن.

## ئایین لە ئاست نەیارانیدا:

ئەوەی لەم ڕۆژگارەدا لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکان بەدی دەکرێت بریتییە لەوەی کە ئایین دژی خۆی بەکار دەهێنرێت نەك دژی ئایدۆلۆژیا و ئایینێکی جیاواز، بە جۆرێك کە هێندەی موسڵمانان ئایینەکەیان بۆ دژایەتیکردنی یەکتری و شکاندنەوەی هاوئایینەکانیان کردووەتە ئامراز، هێندە نەیانکردووەتە ئامرازی بڵاوکردنەوەی ئایینەکەیان و زاڵکردنی بە سەر ئایدۆلۆژیا و هزرە نائایینییەکان.

بیری شیوعیەت و سیکۆلاریزم و ئیلحاد دیارترین ئەو هزر و تەوژمانەن کە لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا ڕەچەتەیان کردووە، بەڵام ئەوەی دەبینرێت لەسەر ئاستی باڵای کارەکتەرە ئایینییەکان، کەمترین کاردانەوە و هەڵوێستیان بەرامبەر ئەنجام دەدرێت.

زۆربەی کارەکتەرە دیارەکانی ئایین، زۆرترین دەرکەوتنیان دژ بە ڕەوت و تەوژمە ئایینییەکانە، کە بەردەوام هەوڵ دەدەن لە ڕێگەی بەکارهێنانی دەقی ئایینی بەرهەڵستی خۆیان بۆ پارتێك یان بۆچوونێکی دیاریکراوی ئایینی بخەنە ڕوو، کە زۆر جار ئامانجی بەناوبانگ بوون و پۆست و پارە لەپشت ئەم کارەیان بوونی هەیە.

بەکارهێنانی ئایین دژی خۆی لە کۆی کایە و ئاستەکانی جیهانی ئیسلامیدا بەدی دەکرێت، سەرەتا لە ئاستی بالاّ کە خۆی لە کۆمەڵگە و وڵاتە جیاوازەکاندا دەبینێتەوە، بە جۆرێك کە چەندین جار جیاوازیی بیروبۆچوونی ئایینی کاریگەریی هەبووە لەسەر ئاستی تەبایی و پەیوەندییەکانیان.

دواتر لە ئاستی ڕێباز و ڕەوتە ئیسلامییەکان، هێندەی ئەهلی تەسەوف و عیرفان بانگەشە بۆ دژایەتیکردنی ڕەوتی سەلەفیەت دەکات، هێندە ئاماژە بە دەق و تێکستە جوانەکانی ئایین ناکات، بەپێچەوانەوە هێندەی ڕەوتی سەلەفیەت دژایەتی ئەهلی عیرفان و تەسەوف دەکات هێندە دژایەتی ڕەوتە سیکۆلاریزم و ئەنتی ئایینییەکان ناکات، ئیدی هەموو ڕێبازەکان بەم فۆڕمە خۆیان نمایش دەکەن، موعتەزیلە دژی ئەهلی سوننە، ئەوان دژی ئەهلی کەلام و ئەشعەری ...هتد، هەڵبەتە دووبارە دەڵێین ئەم کردارانە دوورن لە خواستی ڕاستەقینەی ئایین و هەڵوێستی ڕاستەقینەی زانا و بانگخواز و بیرمەندە ڕەسەنەکان.

خوێندنەوەی توراسی ڕێبازە فیکرییە جیاوازەکانی ئایینی ئیسلام پێمان دەڵێت کە کەم زانا و بیرمەندی ئیسلامی هەن لەلایەن نەیارە فیکرییەکانیانەوە ڕووبەڕووی کافرکردن و جنێودان نەبووبنەوە، هەر لە ئەبو حەسەنی ئەشعەری[1] و

(١) ئەبو حەسەنی ئەشعەری: ناوی عەلی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی ئیسحاقە، ساڵی (٢٦٠ك.) لەدایك بووە، ساڵی (٣٢٤ك.) کۆچی دوایی کردووە، لە نەوەکانی ئەبو موسای ئەشعەرییە، دامەزرێنەری مەزهەبی ئەشعەرییەکانە، بۆ ماوەی (٤٠) ساڵ موعتەزیلە بووە، دواتر وازی لێهێنان. بڕوانە: الأعلام: الزركلي: (٢٦٣/٤).

ئەبو هوزەیلی حەلاف[1] و قازی عەبدول جەباری موعتەزیلە[2] و ئیبنو تەیمیەی حەڕانی و فەخری ڕازی[3] و ئیبن عەرەبی[4].. بگرە تا دەگاتە شەیخی ئەلبانی[5]، سەید قوتب[6]، ئیبن باز[7]،

---

(١) ئەبو هوزەیل: ناوی موحەممەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی هوزەیلی حەللافە، ساڵی (١٣٥ک.) لەدایك بووە، ساڵی (٢٣٥ک.) کۆچی دوایی کردووە، یەکێکە لە گەورەزانایانی ڕەوتی موعتەزیلە. بڕوانە: الأعلام: الزركلي: (١٣١/٧).

(٢) قازی عەبدول جەبار: ناوی عەبدولجەباری کوڕی ئەحمەدی کوڕی عەبدولجەباری هەمەدانییە، ساڵی (٣٥٩ک.) لەدایك بووە، ساڵی (٤١٥ک.) کۆچی دوایی کردووە، شەیخی موعتەزیلەکانە و یەکێکە لە فیقهزانەکانی مەزهەبی شافیعی. بڕوانە: سير أعلام النبلاء: الذهبي: (٢٤٤/١٧)

(٣) ڕازی: ناوی موحەممەدی کوڕی حەسەنی کوڕی حوسەینی ڕازییە، ساڵی (٥٤٤ک.) لەدایك بووە، ساڵی (٦٠٦ک.) کۆچی دوایی کردووە. یەکێکە لە گەورەترین زانایانی مەزهەبی ئیمامی شافیعی و پێی دەڵێن (وتاربێژی ڕەی– خطيب الريّ)، هەندێك لە بەرهەمەکانی: (مفاتيح الغيب، المباحث المشرقية)، بڕوانە: الأعلام: الزركلي: (٣١٣/٦).

(٤) ئیبن عەرەبی: ناوی موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی موحەممەدی کوڕی عەرەبی ئەندەلووسییە، ساڵی(٥٥٨ک.) لەدایك بووە، ساڵی (٦٣٨ک.) کۆچی دوایی کردووە، یەکێکە لە کەسایەتییە هەرە گەورەکانی ڕەوتی عیرفان و تەسەوف. بڕوانە: سير أعلام النبلاء: (٤٨/٢٣).

(٥) ئەلبانی: ناوی موحەممەد ناصر الدين ئەلبانییە، ساڵی (١٩١٤ز.) لەدایك بووە، ساڵی (١٩٩٩ز.) کۆچی دوایی کردووە، یەکێکە لە کەسایەتییە دیارەکانی زانستی فەرموودە لە سەردەمی نوێدا، بەرهەمی زۆری هەیە لەم بوارەدا، لەوانە: (سلسلة الأحاديث الصحيحة، سلسلة الأحاديث الضعيفة، صحيح الأدب المفرد). بڕوانە: (ویکیپیدیا– Wikipedia.org).

(٦) سەید قوتب: ناوی سەید قوتبی کوڕی ئیبراهیمە، ساڵی (١٩٠٦ز.) لەدایك بووە، ساڵی (١٩٦٧ز.) کۆچی دوایی کردووە، بیریارێکی میسرییە، یەکێك بوو لە ڕێبەرانی (ئیخوان موسلیمین)، ساڵی (١٩٦٧ز.) لەسێدارە درا، لە بەرهەمەکانی: ( في ظلال القرآن، التصوير الفني في القرآن، معالم في الطريق). بڕوانە: الأعلام: الزركلي: (١٤٧/٣). معجم أعلام المورد: منير البعلبكي: (٢٤٩).

(٧) ئیبن باز: ناوی عەبدولعەزیزی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی بازە، ساڵی (١٩١٠ز.) لەدایك بووە، ساڵی (١٩٩٩ز.) کۆچی دوایی کردووە، زانایێکی گەورە و دیاری سعودییە و جیهانی ئیسلامییە، بە یەکێك لە ئیمام و ڕێبەرانی ڕەوتی سەلەفیەت هەژمار دەکرێت. بڕوانە: (ویکیپیدیا– Wikipedia.org).

قەڕزاوی[1] و شێخ عوسمانی بیارە... هتد، کە هەموو ئەمانە لەلایەن نەیارە فیکرییەکانیان ڕووبەڕووی جۆرەها سووکایەتیپێکردن و جنێودان بوونەتەوە، کە دوورە لە پایە و پێگەی ئەم زانا و عاریف و شێخە خواناس و ڕاستەقینانە.

تەنانەت ئەم بەکارهێنانەی ئایین دژی خۆی چڕ بووەتەوە بۆ نێو کایە سیاسی و مەعریفییەکانیش، بۆیە دوو پارتی سیاسی ئایینی نابینیتەوە هاوئاواز بن، نەك تەنانەت هاوپەیمان نین، بەڵکو دژایەتیی یەکتریش دەکەن و هەردووکیان ئایین دەکەن بە پاساوی هەقیقەت و ڕاستی بیروبۆچوونەکانی خۆیان و بە هەڵە دانانی ئەوانی تر.

بێگومان دەشێ ڕای جیاواز و بۆچوون و تێگەیشتنی جیاواز بۆ ئایین و دەقەکانی هەبێت، بەڵام هیچ کات ناشێت ئەم ڕاجیاییە ببێتە مایەی ناکۆکی و دژایەتی و یەکتر ناشیرینکردنی ڕەوتە ئیسلامییەکان.

ئەم مۆدێلەی نیشاندان و بەکارهێنانی ئایین دژ بە خۆی، بۆتە فاکتەرێکی بەهێز لای نەیارانی ئایین تا لە ڕێگەیەوە ئایین لەکەدار بکەن و ڕەخنەی لێ بگرن، بە جۆرێك کە هەمیشە ئایین بە هۆکاری لێکترازان و موسوڵمانان بە فاکتەری دووبەرەکی و ناتەبایی وەسف دەکەن.

بێگومان هەموو ئەوانەش لە دەرئەنجامی ئەو ڕاستییە تاڵەیە کە کارەکتەرە ئاییندارەکان دروستیان کردووە، هەڵبەتە ئەمەش بە هۆی بەکارهێنانی ئایین بۆ ڕقەبەرایەتیی یەکتری و لەکەدارکردنی هاوئایینەکانیان، کە ئەم فۆڕمەی بەرجەستەکردن و مومارەسەکردنی ئایینیش دژی بنەما و دەقە ئایینەکانە و تەواو جیاوازە لەگەڵ سروشتی ڕاستەقینەی ئایین.

---

(١) قەرزاوی: زانایێکی ناوداری جیهانی ئیسلامییە، تا ئێستاش لە ژیاندا ماوە و سەرۆکی یەکێتیی زانایانی جیهانی ئیسلامە.

دوا جار ئەو زەرەر و زیانەی کە بڕواداران بەم هۆیەوە بە ئایینیان گەیاندووە، هیچی کەمتر نییە لەو زەرەر و زیانەی دوژمنان بە ئایینیان گەیاندووە.

بۆیە ئەگەر هەرچی زووە پێش بەم شەپۆلەی بەکارهێنانی ئایین دژی ئایین نەگرین، ئەوا نەك ڕەوشی ئایین چاك نابێت، بەڵکو تەبایی و لێبوردەیی دەبێتە خەونێك کە هەموومان بە ئاواتی بین، ئەوکات دەکەوینە بەر نەفرەتی ئایین و بەختەوەری لە ژیان و کۆمەڵگەدا بوونی نامینێت و بار دەکات.

هەڵبەتە دووبارە ئەرکی ئەم کارە دەکەوێتە ئەستۆی زانایان و بانگخوازان و ئیماندارانی ڕاستەقینە، ئەمەش بە هەوڵدان بۆ یەکڕیزی و وەگەڕخستنی هێز و توانا و کۆششی خۆیان دژ بەو گرووپانەی لە ڕێگەی کردەوەکانیانەوە ئایین وەك دوژمنی ئایین بەکار دێنن.

# بەشی هەشتەم
# فەلسەفە و دراو

تاڵیسی[1] گەورەفەیلەسووفی یۆنانی بەوە ناوبانگی دەرکردبوو کە هەستی پێشبینیکردنی زۆر بەهێزە، ئەوەش بە هۆی ئاشنابوونی بە زانستی فەلەکناسی، لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە دەکەوتە بەر هێرش و توانجی خەڵکی بە هۆی هەژارییەوە، ساڵێکیان پێشبینیی ئەوە دەکات کە بەروبوومی زەیتوون خێری زۆری دەبێت، بۆیە هەموو کێڵگە و بەرهەمەکانی زەیتوون بە نرخێکی کەم دەکرێتەوە، دواتر کە بەرهەمەکان پێ دەگەن بە نرخێکی بەرز و بەو نرخە کە خۆی حەزی دەکرد دەیفرۆشتەوە، سەرئەنجام قازانجێکی زۆری دەستکەوت، تاڵیس ئەو کارەی بۆ ئەوە نەکرد تا دەوڵەمەند بێت، یان لەبەر ئەوەی حەزی لە پارە و سامان بێت، بەڵکو ویستی ئەوە بە خەڵکی بڵێت کە فەیلەسووفەکان لە توانایاندا هەیە دەوڵەمەند بن و سامان خڕ بکەنەوە، بەڵام ئەو کارە ئەنجام نادەن، چونکە پیشەی ئەوان کۆکردنەوەی مەعریفە و فەلسەفەیە نەك سەروەت و سامان[2].

---

(١) تاڵیس: فەیلەسووفێکی یۆنانییە، لە سەدەی (٧ پ.ز.) لەدایك بووە و لە سەدەی (٦ پ.ز.) کۆچی دوایی کردووە، یەکەم فەیلەسووف بووە زانستی هەندەسەی لە میسرەوە بردووە بۆ یۆنان، شارەزاییەکی زۆری لە زانستی فەلەکناسیدا هەبووە، بە شێوەیەك کە زۆربەی پێشبینییەکانی وەڕاست دەگەڕان، ئەم فەیلەسووفە بڕوای وا بووە کە ئاو پێکهاتەی یەکەمی گەردوونە. بڕوانە: معجم الفلاسفة: جۆرج طرابیشي: (٤١٤).

(٢) بڕوانە: الفلسفة القدیمة: دکتۆر حربی عباس عطیتو: (٧٥).

بێگومان له هەر شوێنێك ئایین هەبێت فەلسەفە و عەقڵ و هزریش بوونی هەیە، پێچەوانەکەشی هەر ڕاستە، واتە له هەر شوێنێکدا عەقڵ و فەلسەفە بوونی هەبوو، ئایین کاڵایەکی نامۆ نابێت لەو شوێنەدا.

بە ئاوڕدانەوە له مێژووی فەلسەفە و ئایین له سەدەکانی پێش لەدایکبوونی مەسیح پێغەمبەر ﷺ، دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە ئایین زیاتر لەنێو ئەو کۆمەڵگا و ناوچانەدا بوونی هەبووە کە کەوتبوونە کیشوەری ئاسیا و ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەتایبەت میسرییە کۆنەکان و چین وبابلی و ئاشووری و فارس و هیندییەکان.

لەبەرامبەردا کۆمەڵگە یۆنانی و ڕۆمانییەکان کەمتر ئاشنای ئایینەکان بوون، لەو دوو کۆمەڵگەیەدا زیاتر لۆژیك و فەلسەفە بەربڵاو بوو، ئەو دووانە– فەلسەفە و لۆژیك– بە شێوەیەك بەهێز بوون کە تەنانەت ڕۆڵی ئایینیشیان بینیوە، ئەمەش له ڕێگای میسیۆلۆژیا و داستانە ئەفسووناوی و خەیاڵییەکانیان بەدی دەکرێت.

بەگشتی سێ بۆچوونی جیاواز لەمەڕ سەرەتاکانی سەرهەڵدانی هزر و فەلسەفە بوونیان هەیە، بەم شێوەی خوارەوە[1]:

**بۆچوونی یەکەم:** ڕیشاڵی فیکر و فەلسەفە وابەستەی زەمەنێکی دیاریکراو نییە، وەك بەشێکی مێژوونووسانی بواری فەلسەفە ئاماژەی پێ دەکەن[2].

**بۆچوونی دووەم:** ئەم بۆچوونە بەرەو ئەو ئاڕاستەیە دەڕوات کە فەلسەفە بە مانا تایبەت و بەناوبانگەکەی زادەی هزر و ئەندێشەی یۆنانییەکانە[3].

---

(١) بۆ ئاشنابوون بەم سێ بۆچوونە بەگشتی و ئەم بەشە بەتایبەتی بڕوانە ئەم سەرچاوانە: آراء نقدية في مشكلات الدين والفلسفة والمنطق: دكتۆر مهدي فضل الله: (١٠١–١١٤). أسس الفلسفة: دكتۆر توفيق طويل: (٢٥–٣٣).

(٢) بڕوانە: مشكلة الفلسفة: دكتۆر زكريا إبراهيم: (٢٧).

(٣) بڕوانە: مبادئ الفلسفة: ڕاپۆپرت: (٦١). أسس الفلسفة: ڕاكيتوف: (٧).

**بۆچوونی سێیەم:** بۆچوونێکیش هەیە کە سەرەتاکانی فیکر و فەلسەفە دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەو کۆمەڵگایانەی کە سەرەتا ئایین و ئایدۆلۆژیا تیایاندا هەبووە، بەتایبەت میسری و بابلی و فارسەکان، واتە بۆ ڕۆژهەڵاتییەکان[1].

ئێمە نامانەوێت لێرەدا بەڵگە و بۆچوونی هەریەك لەو سێ ڕا جیاوازە باس بکەین، یان ئەو بۆچوونە بخەینە ڕوو کە بە دید و تێڕوانینی ئێمە لە هەموویان بەهێزترە، چونکە ئەم کارە خزمەت بە مەبەست و خواستی ئێمە ناکات لەم توێژینەوەیەدا، بەڵکو ئێمە تەنها تیشك دەخەینە سەر ئەو خاڵانەی کە پەیوەندییان بە سەرهەڵدان و بوونی فەلسەفەوە هەیە لەنێو گۆمەڵگە ئاییندارەکانی وەك میسر و بابل و فارس، چونکە تەنها ئەمەیان خزمەت بەو ئامانجە دەکات کە مەبەستمانە بیگەیەنین.

لە ڕاستیدا بۆچوونێکی تا ڕادەیەك بەهێز هەیە پێی وایە کە هزر و فەلسەفە سەرەتا لە میسر و چین و بابل و وڵاتی هیند و فارسدا سەری هەڵداوە، بۆ ئەو مەبەستەش چەندین بەڵگە و ئاماژەی بەهێز دەخەنە ڕوو، کە گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

### ١- هەبوونی پرس و بابەتە فەلسەفییەکان

کۆمەڵێك بابەتی فەلسەفی سەرەتا لەم شوێنانەدا سەریان هەڵداوە، وەك پرسی زیندووبوونەوە و هەمیشەیی یان لەناوچوونی ڕۆح (الخلود والفناء)، ئەمە وێڕای بوونی شاکاری ئەندازیاری وەك ئەهرامەکانی میسر و مۆمیاکردنی لاشەی مردووەکان و زانستی فەلەکناسی لای بابلییەکان، کە هەموو ئەمانە ئەوکات بەگشتی بەشێك بوون لە فەلسەفە، بەڵام دواتر بوونە زانستی تایبەت و سەربەخۆ.

---

(١) بڕوانە: محاضرات في تاريخ الفلسفة: هيگڵ: (٢٢٦).

### ٢- هەبوونی شارستانیەت

بێگومان ڕۆژهەڵاتییەکان بەر لە یۆنانییەکان توانیبوویان ببنە خاوەنی شارستانیەتی تایبەت بە خۆیان، کە ئەمەش ئەو بۆچوونە بەهێز دەکات کە سەرەتای فەلسەفە و هزری مرۆڤایەتی هەڵقوڵاوی ئەم ناوچانە بێت، چونکە بەپێی سەرچاوەکان ڕۆژهەڵاتییەکان لە سەدەی (٤٠)ی پێش زایین و یۆنانییەکان لە سەدەی (١٠)ی پێش زایین شارسانیەتیان دروست کردووە، بەو پێیەش بێت یۆنانییەکان (٣٠) سەدە دوای ڕۆژهەڵاتییەکان بوونەتە خاوەنی ژیار و شارستانیەتی تایبەت بە خۆیان.

### ٣- هەبوونی ئایین و ئایدۆلۆژیای جیاواز

لەم ناوچانەدا چەندین ئایین و ئایدۆلۆژیا بوونیان هەبووە، وەك ئایینی زەردەشتی لە وڵاتی فارس و ئایینی یەکخوداناسی (ئاخناتون) لە میسر[١]، بێگومان ئەم خاڵەش ڕەسەنایەتیی فەلسەفەی ڕۆژهەڵاتی زیاتر بەهێز دەکات، چونکە بەشێکی فەیلەسووفەکان ڕایان وایە کە فەلسەفە لە ئایینەوە سەرچاوەی گرتووە، وەك ئەمیل بوترو[٢] دەڵێت: "بێگومان فەلسەفە لە هەندێك لایەنیدا لە خودی ئایینەوە سەرچاوەی گرتووە[٣]."

---

(١) بڕوانە: الفلسفة القديمة: دکتۆر حربی عباس عطیتو: (١٧-٤٠).

(٢) ئەمیل بوترو Emile Botroux: فەیلەسووفێکی فەرەنسییە، ساڵی (١٨٤٥ز.) لەدایك بووە، ساڵی (١٩٢١ز.) کۆچی دوایی کردووە، لە بەرهەمەکانی: (الأخلاق والدين، الطبيعة والروح، العلم والدين في الفلسفة المعاصرة). بڕوانە: معجم الفلاسفة: جۆرج طرابیشي: (١٩٦).

(٣) بڕوانە: العلم والدين في الفلسفة المعاصرة: أميل بوترو: (١٠).

### ٤- دانپیادانانی فەیلەسووفە ڕۆژئاواییەکان

کۆمەڵێك فەیلەسووفی ناوداری ئەورووپی هەڵگری ئەم بۆچوونەن و دان بەوەدا دەنێن کە ڕۆژهەڵاتییەکان پێش یۆنانییەکان خاوەنی هزری ڕۆشنگەری و فەلسەفە بوون، وەك: هیگڵ، ویل دیورانت[1]، گۆستاف لۆبۆن، ئەمەی دواییان دەڵێت: "ئەمڕۆ ئێمە دەزانین لە سەردەمێکدا کە یۆنانییەکان گەلێکی نەزان و خێڵەکی بوون، چەندین شارستانیەتی درەوشاوە و جوان و قەشەنگ لە کەناراوەکانی ڕووباری نیل و دەشتەکانی کلدانییەکان بوونیان هەبوو[2]."

### ٥- کاریگەربوونی یۆنانییەکان بە فەلسەفەی ڕۆهەڵاتی

بێگومان فەلسەفەی یۆنانی و فەیلەسووفە ناودارەکانی یۆنان کاریگەری و هەژموونی فەلسەفەی ڕۆژهەڵاتییان بەسەرەوە هەبووە، بە بەڵگەی ئەوەی کە فیساگۆرس و ئەفلاتوون و ئەرستۆ کە لە فەیلەسووفە هەرە ناودارەکانی یۆنانن هەموویان چوونەتە میسر و لەوێوە فێری ماتماتیك و فەلەکناسی و زانستە ئایینییەکان بوون، کە ئەمانە پێشتر بەشێك بوون لە فەلسەفە، وەك ئاماژەمان پێ دا. ئەم خاڵانە و چەندین خاڵی تر ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە لە سەرەتادا فەلسەفە و هزری ڕاستەقینەی لەنێو کۆمەڵگە ئایینداراکانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بوونی هەبووە، دواتر یۆنانییەکان لە ڕێگەی ئاشنابوون بەو شارستانیەتانە فێری بوون و پەرەیان پێ داوە.

---

(١) ویل دیورانت Will Durant: مێژوونووس و فەیلەسووف و نووسەرێکی ئەمریکییە، ساڵی (١٨٨٥ز.) لەدایك بووە و ساڵی (١٩٨١ز.) کۆچی دوایی کردووە، بەرهەمی زۆری هەیە، گرنگترینیان: (قصة الحضارة، قصة الفلسفة، مباهج الفلسفة). بڕوانە: معجم أعلام المورد: منير البعلبكي: (١٩٨).

(٢) بڕوانە: آراء نقدية في مشكلات الدين والفلسفة والمنطق: دكتۆر مهدى فضل الله: (١١١)، ئەویش لە (les premières civilisations) گۆستاڤ لۆبۆن وەریگرتووە.

له ڕاستیدا ئامانجی ئێمە لەم چەند خاڵەدا ئەوە نییە بیسەلمێنین کە فەلسەفە سەرەتا لەم ناوچە ئایین دۆستانەدا سەری هەڵداوە، بەڵکو ئەوەی خستمانە ڕوو تەنها لەپێناو ورووژاندنی پرسیارێکی لۆژیکی و مێژووییە کە خزمەت بە لێکۆڵینەوەکەی ئێمە دەکات، ئەویش بریتییە لەوەی: بەگوێرەی ئەم بۆچوونە بێت سەرەتا فەلسەفە لەناو کۆمەڵگە ڕۆژهەڵاتییە خاوەن ئایینەکاندا بوونی هەبووە و لە یۆنان بوونی نەبووە، بەڵام ئاخۆ بۆچی دواتر و ئێستاشی لەگەڵدا بێت ڕەوتی هزر و فەلسەفە لەم ناوچانەدا شکستی هێناوە؟ بەپێچەوانەوە لە یۆنان و ناوچەکانی تر فەلسەفە و عەقڵ و ڕۆشنگەری گەورەترین بووژانەوە و سەرکەوتنیان بەدەست هێنا؟ کە ئەگەر بەپێی لۆژیك و مەزەندەی مرۆڤەکان بێت ئەبووایە فەلسەفە لەم ناوچانە بەهێزتر بێت نەك لە یۆنان، چونکە ئەم ناوچانە خاوەنی ئایینی تایبەت بە خۆیان بوون کە هاوبەش و پاڵپشتێکی باش و دیاری ڕەوتی هزر و فەلسەفەیە، بەڵام ئەوەی کە مێژوو تۆماری کردووە فەلسەفە لەم ناوچە فرە ئایینییانەدا نەك هەر بەهێز نەبوو، بەڵکو بەپێچەوانەوە تەنانەت ناو و ناوبانگیشی نەماوە.

دەشێ مرۆڤە ئەنتی ئایینییەکان هەر زوو لە گۆشەنیگای دژەئایینی خۆیان ئەم پووکانەوەیەی هزر و فەلسەفە بۆ ڕەهەندە ئایینییەکە بگێڕنەوە و بڵێن: بێگومان بوونی هزر و ئەندێشەی ئایینی بەربەست بووە لەبەردەم گەشەسەندنی فەلسەفە لەم ناوچانەدا، چونکە ئایین پێچەوانەی عەقڵ کار دەکات و هزری مرۆڤایەتی پشتگوێ دەخات، ئەمەش وەك ئاماژەیەك بۆ خستنەڕووی تیۆرای ناتەبایی و دژایەتیی نێوان ئایین و فەلسەفە.

دەشێ بەشێکیش ئەم دەرنەکەوتنەی هزر و فەلسەفە لەم ناوچانەدا بۆ دۆخی ڕۆشنبیری و عەقڵانیەتی تاکی ئەو سەردەمە بگەڕێنێتەوە، بەتایبەت کە ئەوکات میسۆلۆژیا و داستانی خەیاڵی و جادووگەری باڵی بەسەر مرۆڤایەتیدا کێشابوو، بە

شێوەیەك كە مرۆڤەكان بۆ ڕاڤەی ئەو شتانەی لە دەوروبەریاندا دەگوزەرا پەنایان دەبردە بەر میسۆلۆژیا و جادووگەری نەك عەقڵ و هزری خۆیان.

بەڵام بە بڕوای ئێمە ئەم دوو گریمانەیە دەمارگیری و كورتبینییان پێوە دیارە، چونكە لە ڕاستیدا تەنها وجودی فەلسەفە لەم ناوچانەدا گەواهی دەدەن كە ئەگەر هێزی ئایین و بەربڵاوی میسۆلۆژیاش زیاتر بووبێ ئەوا ئەم دواونە –ئایین و میسۆلۆژیا– بە هیچ جۆرێك بەربەست نەبوون لەبەردەم گەشەنەسەندنی هزر و فەلسەفە، تەنانەت ئەگەر هۆكاریش بووبن هۆكاری ڕاستەقینە نەبوون.

بۆیە ئەگەر بمانەوێت هۆكاری ڕاستەقینە و ڕاستەوخۆی دەرنەكەوتن و پووكانەوەی فەلسەفە لەم ناوچانەدا بزانین، پێویستە لە سەرەتادا ئەو هۆكارانە بخەینە ڕوو كە مایەی بووژانەوە و دەركەوتنی ڕۆشنگەری و فەلسەفە بوون لە یۆنان و ناوچەكانی تر، ئینجا دواتر بەراوردێك لەنێوان هەردوو ناوچەدا بكەین و ڕەوشی فەلسەفە هەڵبسەنگێنین، ئەوكات بێگومان دەگەینە هۆكاری ڕاستەقینەی بڵاونەبوونەوەی فەلسەفە و شكستهێنانی لەم ناوچانەدا.

لە ڕاستیدا بەپێی ئەو بەدواداچوونانەی كە ئێمە كردوومانە سەبارەت بەم پرسە پسپۆڕانی بواری فەلسەفە ئاماژە بەوە دەكەن كە هۆكاری گەشەسەندنی عەقڵ و لۆژیك و فەلسەفە لەلای یۆنانییەكان و پاڵدانی فەلسەفە و ئەپستمۆلۆژیا بۆ مێژووی هزر و ڕۆشنگەریی ئەوان، هۆكارەكەی بۆ دوو خاڵی سەرەكی دەگەڕێتەوە:

**یەكەم: پەیوەندیی بە پاشخانی هزری ئەوانەوە هەیە**

چونكە ئەوان فەلسەفەیان بەكار هێنا لەپێناو خودی مەعریفە و هزر و زانیاریدا، وەك خۆشییەكی عەقڵی توێژینەوەیان دەربارەی بابەتە فەلسەفی و لۆژیكی و عەقڵییەكان ئەنجام دەدا.

یۆنانییەكان كاتێك سەیری دەوروبەری خۆیان كرد ویستیان ئاشنای لوغز و شتە شاراوەكانی گەردوون و سروشت و دەروونی خۆیان بن، ئەو هەوڵ و كۆششەیان

جۆرێك لە خۆیشی پێ بەخشین، تاوەکو گەیشتنە ئەو بڕوایەی دەبێ توێژینەوەی فەلسەفی و لۆژیکی ئەنجام بدەن بۆ ئەوەی فێر بن و شت بزانن، دەبێ عەقڵ بەکار بهێنن بۆ ئەوەی لە داوی نەزانین ڕزگاریان بێت، تەنها ئەو هۆکارە وای لێ کردن پەرە بە زانست و لۆژیك و فەلسەفەکەیان بدەن.

دوا جار بە هۆی ئەو خۆشەویستیەیان بۆ هزر و مەعریفە توانییان سەرکەوتوو بن و شەرەفی پاڵدانی گەورەترین بەرهەم و نیتاجی هزری مرۆڤایەتی کە فەلسەفە و لۆژیکە بۆ مێژوو و توراسی خۆیان مسۆگەر بکەن.

**دووەم: دوورکەوتنەوە لە میسۆلۆژیا**

هاوشانی خاڵی یەکەم کە بەکارهێنانی عەقڵ بوو لەپێناو زانین، ئەوان پشتیان لە بەکارهێنانی میسۆلۆژیا و جادووگەری و ئەفسانە کرد و تەنها و تەنها پشتیان بە عەقڵ و ئەزموونی خودی خۆیان بەست. هەڵبەتە ئێمە لەو بڕوایەداین خاڵی دووەم هۆکارێکی گرنگ و سەرەکی نییە، چونکە لە ڕاستیدا هزری میسۆلۆژیا و ئەستورە و خورافە و جادووگەری بە جۆرێك لەناو یۆنانییەکاندا بڵاو بووە کە ئەگەر ڕێژەکەی لە ڕێژەی ناوچەکانی تر زیاتر نەبووبێت کەمتر نەبووە، داستانی ئەلیادە و ئۆدیسەی هۆمیرۆسیش گەورەترین گەواهی ئەم قسەیەن، کە زۆرینەی هەرە زۆری فەیلەسووف و بیرمەندە یۆنانییەکان پێوەی کاریگەر بوون، لە کاتێکدا توراس و کەلەپوورێکی تەواو میسۆلۆژی و خەیاڵین.

بێگومان ئەوەی خزمەت بە بواری توێژینەوەکەی ئێمە دەکات خاڵی یەکەمە، کە تیایدا یۆنانییەکان چانسی ئەوەیان هەبوو عەقڵ و فەلسەفەیان لەپێناو خودی عەقڵ و زانست و زانیاریدا خستە کار. ئەی ڕۆژهەڵاتییەکان کە فەلسەفە و عەقڵ سەرەتا لەناو ئەواندا سەری هەڵداوە بەپێی بۆچوونی هەندێك کەس کە پێشتر

ئاماژەمان پێ دا، ئایا ئەوانیش فەلسەفەیان بۆ فەلسەفە و چێژی زانست و مەعریفە بەکار هێنا یان لەپێناو شتی تر؟

وەڵامی ئەم پرسیارە دەمانگەیێنێتە ئامانج و پایانی ئەوەی کە ئێمە دەمانەوێت لەم بەشەدا بیخەینە ڕوو، بۆ وەڵامدانەوەشی دەچینە لای فەیلەسووفی بەناوبانگی یۆنانی ئەفلاتون.

ئەفلاتون وەك چەندین فەیلەسووفی تر سوودی لە فەلسەفە و زانستی میسرییەکان بینیبوو، ئەمەش کاتێك سەفەری ئەو وڵاتەی کرد و توانیی لە زانستی گەورەپیاوانی میسر خۆی بەهرەمەند بکات، بەڵام ئەوەی کە جێی تێبینی بوو لای ئەفلاتون، بریتی بوو لەوەی کە میسرییەکان و خەڵکی ئاسیا بەگشتی عەقڵ و فەلسەفە و زانست لەپێناو پارە و ئیشوکاردا بەکار دەهێنن، یان ڕوونتر بڵێین، گرنگترین شت لای ئەوان کار و پارەیە نەك زانست و توێژینەوە، بەپێچەوانەی یۆنانییەکان کە تەنها لەپێناو عەقڵ و زانیندا ئەو پرۆسەیان ئەنجام دەدا و خۆشترین شت لای ئەوان هزر و لۆژیك و لێکۆڵینەوە بوو، هەر بۆیە لە وتەیەکیدا تایبەتمەندیی میسری و یۆنانییەکان دەخاتە ڕوو، وەك ئاماژەیەك بۆ جیاوازیی نێوانیان، کاتێك دەڵێت: "تایبەتمەندیی یۆنانییەکان خۆشویستنی بە دواداگەڕان و توێژینەوەیە، بەڵام تایبەتمەندیی میسری و فەینەقییەکان، خۆشویستنی ئیشوکارو پارە پەیداکردنە[1]."

بە بۆچوونی ئێمە، ئەمە ئەو هۆکارەیە کە وای کردووە عەقڵ و فەلسەفە لای ڕۆژهەڵاتییەکان بایەخی نەمێنێت و پەرە نەسەنێت، چونکە ئەوان هەمیشە لەدوای پوڵ و دراو بوون، تەنانەت ئامادەن عەقڵ و مەعریفە و کەسایەتیی خۆیشیان لەپێناو پارە و سامانەدا بخەنە گرەو، هەر بۆیە بەم دەردی دواکەوتوویی و نەزانییە دەناڵێنن کە گیرۆدەی بوون، کە سەرتاپای نەهامەتییەکانیان بۆ پشتکردن لە عەقڵ

---

(١) مبادئ الفلسفة: ڕاپوپرت: (٩١).

و به گرنگتر دانانی پاره و سەروەت و سامان له عەقڵ و فەلسەفە و ڕۆشنگەری دەگەڕێتەوە.

به دووری نازانین ئەفلاتون که سوپاسی خوای گەورەی کردووه له یۆنان لەدایك بووه هەر له بەر ئەو هۆکاره بووبێت، کاتێك بینیویەتی له یۆنان پاره و سامان دەخرێته خزمەت عەقڵ و فەلسەفە، بەڵام له شوێنی تر –ڕۆژهەڵات– عەقڵ و فەلسەفە بۆ پاره و داهات بەکار دەهێنرێن، چونکه دەڵێن ئەفلاتون وتوویەتی لەسەر سێ شت سوپاسی خودا دەکەم:

١– که به پیاو دروستی کردووم نەك به ئافرەت –هەڵبەت ئێمه لەگەڵ ئەم جۆره بیرکردنەوەیەی ئەفلاتوندا نین–.

٢– که بەئازادی دروستی کردووم، نەك بەکۆیلەیی.

٣– که کردوومی به هاوڵاتییەکی یۆنانی –ئەسینا– نەك هاوڵاتی شوێنێکی تر[1].

ئێستاش کێشەی مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی ئەوەیه که عەقڵ و هزری خۆی لەپێناو داهات و دەستکەوتی ژیان دەفرۆشێت، بۆیه له هەموو بوارەکانی ژیاندا تووشی دواکەوتن بووەتەوە، بەپێچەوانەوە ئێستاش ئەوروپییەکان ئاماده نین عەقڵ و هزر و فەلسەفەی خۆیان لەپێناو پارەدا بفرۆشن، بۆیه بەردەوام له گەشەسەندن و پێشکەوتندان، تاکه جیاوازیی نێوان ئێمه و ئەوان بریتییه له دوو خاڵی سەرەکی:

**خاڵی یەکەم:** ئێمه فرۆشیاری عەقڵ و فەلسەفەین، ئەوانیش کڕیاری ئەو کاڵایەی ئێمەن.

**خاڵی دووەم:** ئێمه سوود لەو نرخه دەبینین که له فرۆشتنی عەقڵ و فەلسەفەدا بەدەستی دەهێنین، ئەوان سوود له بەرهەمی عەقڵ و فەلسەفە دەبینن و هەرگیز ئاماده نین خودی عەقڵ و هزری خۆیان لەپێناو پارەوپوڵدا بفرۆشن.

---

(١) بڕوانه: شموخ الفلسفة وتهافت التهافت: دکتۆر ڕاشد موبارەك: (٣٥).

دوا جار ئەوان بەرهەمی هەمان ئەو عەقڵ و فەلسەفەیەی کە بەبێ بەرامبەر لە ئێمەیان کڕیوە، بە نرخ و بەهایەکی ئێجگار گەورەتر پێمانی دەفرۆشنەوە.

ئێستا لە جیهانی ئیسلامیدا کێشەیەك سەری هەڵداوە، پێی دەوترێت کێشەی کۆچکردنی عەقڵەکان (هجرة العقول)، تیایدا هەموو ئەو بلیمەت و عەقڵمەندانەی کە لە وڵات و کۆمەڵگەی خۆیان ڕێز بۆ کەسایەتی و پێگە زانستی و مەعریفییەکەیان دانانرێت هەوڵ دەدەن وڵات جێ بهێڵن و ڕوو بکەنە کۆمەڵگایەك کە تیایدا عەقڵ و زانست و فەلسەفە پایە و بایەخی خۆی هەبێت، کە ئێمە ئەوە ناو دەنێین: (فرۆشتی بەکۆمەڵ).

هەروەك ئەمە جۆرێکە لە بەکارهێنانی عەقڵ وەك دەرچەی نان پەیداکردن، نەك بەکارهێنانی عەقڵ و فەلسەفە وەك ئامرازێك بۆ بڵاوکردنەوەی بەختەوەری و تێرکردنی ڕۆحی مرۆڤەکان بە خۆراکی فەلسەفە و لۆژیك و زانست و زانیاری.

ئەمەش جارێکی تر هۆکارە بۆ بووژاندنەوە و گەشەسەندنی کۆمەڵگاکانی ئەوان و پێشکەوتنیان لە ڕووی زانست و زانیاری و ژیار و شارستانیەت، ئێمەش زیاتر هەنگاو بەرەو دواوە دەنێین و تا دێت وا خەریکە گیرۆدەی دەستی نەزانی و بڵاوبوونەوەی گەندەڵی و دۆگما بوونی عەقڵ و ئەستۆکبوونی هزر و هۆشمان دەبین.

فەلسەفە و ڕەوتی ڕۆشنگەری لە سەرەتادا –وەك پێشتر وتمان– لەناو کۆمەڵگا ئایینییەکان سەری هەڵداوە، بەڵام هیچ پێشکەوتنی بەخۆوە نەبینیوە، چونکە لەمپەرێك هەبووە لەبەردەم دەرکەوتنی سروشت و هەقیقەتی عەقڵ و فەلسەفەدا، ئەویش –بە دید و بۆچوونی ئێمە– بەکارهێنانیان بووە لەپێناو دراو و سەروەت و سامان و دەستخستنی قازانجی ماددیدا.

لەبەرامبەردا هەمان ئەو ڕیشاڵی هزر و فەلسەفەیە لە یۆنان سەر هەڵدەدات و سەرکەوتوو دەبێت، چونکە ئەو لەمپەرە نەبوو کە دژی سروشت و کەشوهەوای هزر و فەلسەفە بوەستێتەوە.

بەشێك لە بیرمەندان کە ڕێبەرایەتیی ڕەوتی عەقلانیەت و هزر و مەعریفە دەکەن، تاکە شتێك کە تیایدا چاوەڕێی بکەن هزر و لۆژیك پێیان ببەخشێت، دابینکردنی بژێوی ژیانیانە، ڕێك وەك ئەو تایبەتمەندییەی کە ئەفلاتون بۆ میسرییەکان خستبوویە ڕوو، ئەوان وا تێگەیشتوون کە عەقڵ و فەلسەفە تەنها بۆ پارە و خۆدەوڵەمەندکردنە، درکیان بەوە نەکردووە کە عەقڵ بەر لەوەی دەرگای پڕکردنی گیرفانیان بێت، ئامرازی تێرکردنی ڕۆحیانە، بەر لەوەی مایەی ئاسوودەکردنی جەستە بێت، ئاسوودەکردن و چێژبەخشینە بە دڵ و دەروون، بەر لەوەی زاڵبوون بێت بەسەر هەژاریدا زاڵبوونە بەسەر نەزانیدا.

ئەگەر بڕیار بێت پرۆسەی ڕۆشنگەری هزر و فەلسەفە جارێکی تر لەم کۆمەڵگەیەدا ببووژێنرێتەوە و هەوڵی بۆ بدرێت، دەبێ وەك یۆنانییەکان دژی ئەو ڕەوتە بوەستینەوە کە ئێستا بە ناوی فەلسەفە و مەعریفە و ڕۆشنگەری خەریکی گیرفان پڕکردنن و لەپێناو پارەوپوڵدا خۆیان و زانستەکەیان دەفرۆشن.

لە سەدەی شەشەمی پێش زاییندا، گرووپێك لە بیرمەند و فەیلەسووفە یۆنانییەکان لەپێناو پارە و سەروەت و ساماندا زانستەکەی خۆیان بڵاو دەکردەوە، لەژێر پەردەی لۆژیك و فەلسەفەدا خەریکی ڕووتاندنەوەی خەڵکی بوون، بەڵام هەر زوو یۆنانییەکان درکیان بەو کارە ناسروشتییەی ئەوان کرد و نازناوێکیان لێنان کە هەقی خۆیەتی ئەمڕۆ ئێمەش بەسەر ئەو کەسانەدا بیسەپێنین کە هەمان ئەو کارەی ئەوان ئەنجام دەدەن، یۆنانییەکان ئەو گرووپەیان ناو نا (سەوفەستاییەکان) واتە فەلسەفەی شێوێنراو (الحكمة المموهة)، کە گوزارشت بوو لە فەلسەفەیەك کە

لەپێناوی پارە و سەروەت و ساماندا وەك خۆی بەکار ناهێنرێت و مەبەست لێی سەر لێ شێواندنی خەڵك و خۆدەوڵەمەندکردنە.

ڕەوتی ڕۆشنگەری و بەهاری هزر و لۆژیك کە هەموومان ئاواتی بۆ دەخوازین، کاتێك دێتە کایەوە کە تاکەکانی کۆمەڵگە تێبگەن کە عەقڵ و فەلسەفە و زانست لە داهات و پارە گرنگترن، پێویستە ئەو بۆچوونە هەڵە و ناسروشتییە لە هزری لاوەکانمان دەربهێنین کە پێی وایە تەنها کاری عەقڵ و فەلسەفە و لۆژیك خستنەڕووی دەرگای دامەزراندن و بوون بە کارمەندە لە دەزگایەکی حکومی یان ئەهلیدا.

پێویستە شۆڕشێکی دەستەویەخە دژ بەو کەسانە هەڵبگیرسێنین کە لە ڕێگەی فرۆشتنی هزر و عەقڵیانەوە ئەم چەمکانە لای تاکەکانی کۆمەڵگە ناشیرین دەکەن، ئیدی دەبێ شکۆی فەلسەفە و لۆژیك بەرز بکەینەوە بە شێوەیەك کە هیچ کات پارە نەتوانێت لەشکۆیان بهێنێتە خوارەوە، لەبەرامبەردا پێویستە پێگە و زەرووەرەتی پارەوپوڵ لە دیدی ڕۆشنبیرەکاندا لاواز بکەین، تەنها بەم شێوازە دەتوانین پێش بەوە بگرین کە بەر ئاهی عەقڵ و فەلسەفە نەکەوین.

هەمیشە قسەی مامۆستایەکی خۆم لە سەردەمی زانکۆدا کردووەتە پێوەری ئەم بابەتە، کاتێك لە وەڵامی پرسیارێکدا کە بەرەوڕووم کردەوە و پێم گوت: مامۆستای بەڕێز، بۆچی تۆش وەك هاوکارەکانت ناچیت بە پارە بخوێنیت؟ ئەو لە وەڵامدا شتێکی گوت کە ئەوکات من زۆر لام گرنگ نەبوو، بەڵام ئێستا کە خەریکی نووسینی ئەم بابەتەم هەست بە قورسایی و بەهێزیی وەڵامەکەی دەکەم، کاتێك پێی گوتم: ئەگەر پارە بدەم بە عەقڵ و عیلم و زانست، ئەوا تەنها بەقەد ئەو پارەیە فێر دەبم، کە من پێشکەشی دەکەم.

لەم وتەیە فێری ئەوە بووم کە هەر کات زانست و عەقڵ و فەلسەفە خرانە گرەوی پارەوپوڵ، مرۆڤ تەنها بەقەد ئەو ڕێژەیە لێیان سوودمەند دەبێت کە

دەیبەخشێت، بەڵام ئەگەر بە پارە بەراورد نەکران ئەوا نرخ و بەهایان بەقەد هەموو پارە و سامانەکانی دونیا دەبێت.

هەڵبەتە ئێستا خەتەرناکترین جۆری بەکارهێنانی فەلسەفە و لۆژیك لەپێناو پارەوپوڵدا، بریتییە لە فرۆشتنی ویژدان و کەسایەتی لەلایەن بەشێك لەو کارەکتەرە هزری و فەلسەفییانەی کە ڕێبەرایەتی و پێشەوایەتیی ڕەوتی عەقڵانیەت و بزوتنەوەی ڕۆشنگەری دەکەن، کە ئەمەش تەواو پێچەوانەی پرەنسیپ و ڕێساکانی هزر و فەلسەفەیە، کە کۆی هەوڵ و کۆششەکانیان لەپێناو ئازادی کەسایەتی و کۆیلەنەبوونە بۆ کەسانی تر، بەڵام ئەو ڕەوتە ڕۆشنگەرانە لەپێناو پارە و ساماندا بە جۆرێك هزر و مەعریفەی خۆیان فرۆشتووە، کە کۆیلەبوونیان گەیشتووەتە ئاستێك نەتوانن بە خواست و ئازادیی خۆیان ئەوەی لە ناخ و ویژدانیاندا هەیە دەریببڕن، کە ئەمەش دوا جار بە خراپ بەسەر بزوتنەوەی ڕۆشنگەری و فەلسەفە و لۆژیکدا شکاوەتەوە.

دوا جار چۆن ئایین لەلایەن هەندێك لە باوەڕداران و هەندێك لە کارەکتەرانی ئایینی بووەتە ئامرازێك بۆ دەستخستنی سەروەت و سامان و خەڵك ڕووتاندنەوە – وەك لە بەشی داهاتوودا ئاماژەی پێ دەکەین– بە هەمان شێوە عەقڵ و فەلسەفەش بووەتە هۆکاری خۆ دەوڵەمەندکردن و بڕینی باخەڵی خەڵکی هەژار لەلایەن هەندێك کەس کە خۆیان بە ڕۆشنبیر و نووسەر هەژمار دەکەن بەڵام لە بنەڕەتدا وا نین.

ئەگەر ئێمە لەم دوو گرووپە نەیەینە دەنگ کە ئایین و فەلسەفە بۆ دراو و پارە بەکار دێنن، بەزووترین کات ڕێگەیان لێ نەگرین، دڵنیاین کە داهاتوویەکی نادیار چاوەڕێمان دەکات، چونکە ئەگەر ئایین فرۆشرا قیامەت و دواڕۆژمان لەدەست دەچێت، ئەگەر عەقڵ و فەلسەفەش فرۆشران ژین و ژیارمان لە دەست دەڕوات، ئەوکات دەکەوینە بەر ئەو ئاە و نەفرینەی کە ئێمە باسی دەکەین.

# بەشی نۆیەم
# ئایین و دراو

کاتێك پێغەمبەری ئیسلام موحەممەد ﷺ ئایینەکەی خۆی ئاشکرا کرد، مەترسییەکی گەورەی خستە نێو دڵی نەیارەکانی خۆی، چونکە دەیانزانی ئیتر ئەو ڕەوشەی کە پێشتر بۆیان ئەلوا ئەستەمە چیتر بتوانن بەردەوامی پێ بدەن، بۆیە ناچار پیاوە دانا و لێهاتووەکانی خۆیان دەنارده لای ئەو زاتە، سا بەڵکو بتوانن بە بیر تیژی و کارامەییەکانیان ڕێ لە پەیامەکەی بگرن و لە ئایینەکەی پاشگەزی بکەنەوە، بەڵام سەرجەم پیتۆڵ و فەیلەسووفانی ئەو سەردەمە نەیانتوانی بەرامبەر دانایی و وتە پڕشنگدارەکانی ئەو خۆڕاگر بن.

هەر مامۆستا و حەکیمێك دەچووە بەرامبەری ئیتر دەبووایە وەك قوتابی ببێتە گوێگری ئەو زاتە، ئەوان هەموویان هۆگری وتەکانی ئەو دەبوون، یان دەبووایە بڕوای پێ بکەن یان دەستبەجێ شوێنەکە جێ بهێڵن. ئیتر نەیارانی ئەو زاتە بێهیوا بوون لەوەی بتوانن لە ڕێگەی هزر و عەقڵ و فەلسەفەوە ڕێی لێ بگرن و پاشگەزی بکەنەوە، سەرئەنجام گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە لە ڕێگەی سامان و حەز و ئارەزووییەوە فریوی بدەن و لە پەیام و بانگەوازەکەی دووری بخەنەوە.

بۆیە پیاوماقووڵانی قوڕەیش لای کەعبەی پیرۆز کۆ بوونەوە و بڕیاریان دا قسە لەگەڵ موحەممەدی پەیامبەردا ﷺ بکەن، بەو هیوایەی ئیتر بتوانن کۆتایی بە پرشنگ و درەوشانەوەی ئایینە نوێیەکەی بهێنن.

بۆ ئەو مەبەستەش چەندین بژاردەیان خستە بەردەمی، کە هەریەك لەو بژاردانە توانای ئەوەی هەیە گەورەترینی مرۆڤەکان بخاتە سەرچۆك، ئەوان ڕوویان کردە ئەو زاتە و پێیان گوت: ئایا پارەت دەوێت؟ ئەگەر سەروەت و سامانت دەوێت، بە شێوەیەك سامان و دارایيت پێ دەدەین کە ببیتە دەوڵەمەندترین کەس.

ئایا ناوبانگت دەوێت؟ ئەگەر گەورەیی و ناوداریشت دەوێت، دەتکەین بە گەورە و سەرداری خۆمان.

ئایا پۆست و پادشاییت دەوێت؟ ئەگەر دەسەڵات و پلەوپایەشت دەوێت، دەتکەین بە سەرکردە و پادشای خۆمان.

ئایا نەخۆشیت؟ خۆ ئەگەر تووشی نەخۆشیش بوویت و بۆیە ئەم قسانە دەکەیت، ئەوا باشترین پزیشکت بۆ دەدۆزینەوە و تیماری ئەو دەردەت دەکەین.

بێگومان ئەو پێشنیازانە هێندە گەورەن دەشێ مرۆڤ لەپێناویاندا هەرچی پرەنسیپ و بەهای مرۆڤایەتیی هەیە پشتگوێیان بخات، چونکە تەواوی کۆششی

مرۆڤایەتی دەشێ هەر لەپێناوی یەکێك لەمانەدا بێت چ جای ئەوەی هەموویان بەیەکەوە بخرێنە بەردەم مرۆڤ.

ئەوەی زێتر ئەم پێشنیازانەی بەبایەخ کردبوو، ئەوە بوو کە تێکڕای گەورە پیاوانی قوڕەیش لەبەرامبەریدا بە ئەژنۆدا کەوتبوون و ئەو پێشنیازانەیان خستبووە ڕوو، نەك سادە و هەژارەکانی نێو قوڕەیش، گەورەپیاوەکان هەموویان بەیەکەوە دەستیان لەسەر دڵیان بوو، تەنها چاوەڕوانییەك کە ئەوان لە ناخی خۆیان هیوایان بۆ دەخواست ئەوە بوو کە زۆر بەئاسانی موحەممەد ﷺ بەڵێ بۆ پێشنیازەکانیان بکات و ئەمانیش خێرا بۆی جێبەجێ بکەن و لەو گرێ دەروونییە ڕزگاریان بێت کە بە هۆی موحەممەد ﷺ و پەیامەکەیەوە بۆیان دروست ببوو.

بەڵام ئەو زاتە هەموویانی تووشی شۆك کرد، کاتێك لە وەڵامی هەموو ئەو پێشنیازانەدا پێی گوتن: من ئەم پەیامەم لەپێناو دەستخستنی سامان و پلەوپایەی دونیادا نەهێناوە[1].

دەبێ چ نهێنییەك هەبێت کە ئەم زاتە هەموو ئەو سەروەت و سامانە ڕەت بکاتەوە؟ دەبێ چ پەیامێك هەبێت کە پێغەمبەر ﷺ بیەوێت بیگەیەنێت بە بڕواداران و هەڵگرانی مەشخەڵی ئیسلامەتی؟

خۆ دەکرا ئەم زاتە بچێتە ژێر باری ئەو پێشنیازەی گەورەپیاوانی قوڕەیش، خۆ دەکرا تەواوی سامان و پارەکانیان لێ بسەنێت، دواتریش هەر بەردەوام بێت لە بانگەوازەکەی خۆی و زیاتر گەشە بە ئایینەکەی بدات!

بەڵام ئەم زاتە هیچ کام لە مانەی قبوڵ نەکرد، هەڵبەت ئەم زاتە حەکیم و لێهاتووە بۆیە قبوڵی نەکرد، چونکە ئاشنای سروشت و نرخ و بەهای ئایینەکەی بوو، ئەو دەیزانی سروشتی ئایین چۆنە، بۆیە ئەو پێشنیازە گرنگە ڕەت دەکاتەوە.

---

(١) بۆ تەواوی ئەم چیرۆکە, بڕوانە: السيرة النبوية: ئیبن هشام: (١/١٨١-١٨٤).

ئەم زاتە ویستی ئەوە فێری قوتابیانی قوتابخانەی ئایین بکات، کە هیچ کات لەبەرامبەر سامان و پوڵی دونیادا دەستبەرداری ئایین و ئایدۆلۆژیای خۆیان نەبن، ویستی پێیان بڵێت: ئایین لەوە گەورەترە بە سەروەت و سامانی دونیا بگۆڕدرێتەوە، لەوە دەچوو ئەم زاتە بزانێت ڕۆژگارێك ئوممەتەکەی لەپێناو پارەدا دەستبەرداری ئایین و پەیامەکەی خۆیان دەبن، بۆیە وەك موعجیزەیەکی پێشوەختە ئەم دیمەنە نایابەی نیشان داین.

هیچ پەیوەندییەك ئایین و دراو بەیەکەوە کۆ ناکاتەوە، بۆیە هیچ کات ئایدۆلۆژیا لە ڕێگەی پارە و سامان ڕێگەی لێ ناگیرێت، هەرگیز پارە بەربەست نییە لەبەردەم گەشەسەندن و بڵاوبوونەوەی هیچ بیروباوەڕ و ئایدۆلۆژیایەك. بە هەمان شێوە، هیچ کات پارەوپوڵ نابێتە هۆکاری ڕاستەقینەی دەستگرتن بە ئایینێکی دیاریکراو، چونکە هێزی ئایین پەیوەندیی بە ناخی مرۆڤەکانەوە هەیە، بەڵام پارە و سامان پەیوەندیی بە جەستە و ڕواڵەتی مرۆڤایەتییەوە هەیە.

بۆیە ئەستەمە بتوانرێت لە ڕێگەی پارەوە ڕێگە لە دڵ بگیرێت پەیوەندی لەگەڵ ئایین و بیروباوەڕدا ببەستێت یان ڕازیی بکات تا ئەو پەیوەندییە دروست بکات، هەڵبەت کاتێك پارە و سامان ویستوویەتی هێزی ماددی و ڕووکەشی خۆی زاڵ بکات بەسەر هێز و توانای ڕۆحی ئایین، تەنها بۆ ماوەیەکی کەم توانیویەتی ئەو کارە بکات، ئەگینا هیچ کات ئایین و ئایدۆلۆژیای ڕاستەقینە چۆك بۆ هێز و کاریگەرییەکانی دراو و پارە دانادەن، بۆیە هەر بەکارهێنانێکی ئایین لەپێناو دراودا کارێکی ناسروشتییە و پێچەوانەی خواستی ئایینە.

ئەم نەگۆڕینەوەی ئایین و بیروباوەڕ بە پوڵ و دراو و بەکارنەهێنانی ئایین وەك دەرچە و دەروازەیەك بۆ دەوڵەمەندبوون و بازرگانیکردن، ئەو میتۆدە ئایینییە بوو کە پێغەمبەرﷺ ویستی بۆ شوێنکەوتووانی ئایینەکەی بەرجەستەی بکات.

ئەو میتۆدەی کە پێغەمبەر ﷺ لەسەر پرەنسیپ و بنەمای بەکارنەهێنانی ئایین و پیشەی ئاییندارى لەپێناو دەستخستنی سامان و داهاتی دونیا هێنایە کایەوە، دوای بڵاوبوونەوە و فراوانبوونی ئایینی ئیسلام بە شێوەیەکی تر دووبارەی کردەوە، هەڵبەت ئەم جارە دیمەنەکە لەگەڵ نەیارانیدا دووبارە نابێتەوە، بەڵکو ئەم جارە لەنێو قوتابی و هاوەڵانیدا ئەم نەریتە دووبارە و بۆ هەمیشە زیندوو دەکاتەوە.

ئەم جارە بڕواداران پێویستە لەسەریان دەستی یارمەتی و سۆز و میهرەبانی بۆ هەژارانی ئوممەت درێژ بکەن، کە موحەممەد ﷺ خۆی و خانەوادەکەی سەرقافڵەی بێنەوا و هەژاران بوون، دەوڵەمەندانی ئوممەت پێویست بوو ساڵانە زەکات لە داهات و سەروەت و سامانیان دەربکەن و بەشی هەژارانی لێ بدەن، ئیدی هەمووان ئاواتەخواز بوون دەستی یارمەتی و میهرەبانی سەرەتا بۆ ئەو زاتە پیرۆزە ڕابخەن و زەکاتی پێ بدەن.

بەڵام ئەوەتا ئەم زاتە جارێکی تر پێگەی ئایینی و سەروەری خۆی بۆ دەستکەوتنی سامان و پارەوپوڵ بەکار ناهێنێت، ئەو کە دەزانێت پایەی پێغەمبەرایەتی و ئایین فاکتەری هەرە بەهێزن کە موسوڵمانان هان بدات پێش هەموو کەسێك دەستی هاوکاری بۆ ئەو ڕابکێشن، هەر زوو ئەو بۆچوونەیان لەبار دەبات و پێیان دەڵێت: من کە لە سەردەمی بێهێزی و بێتوانایی خۆم و ئایینەکەم سامانی دوژمن و نەیارەکانم قبوڵ نەکرد، چۆن لە سەردەمی بەهێزی و ترۆپکی بەرزی ئایینەکەم سەروەت و سامان لە دۆست و ئازیز و هاوەڵانم وەردەگرم.

هەر بۆیە بە فەرمایشتێکی زێڕین، دەستخستن و سوودوەرگرتن لە داهاتی زەکات نەك تەنها لەسەر خۆی، بەڵکو لەسەر خانەوادە و خزم و کەسە نزیکەکانی

خۆیشی یاساغ دەکات و پێیان دەفەرموێت: "ألا إن الصدقة لا تنبغي لمحمد ولا لآل محمد[(١)]."

واتە: "ئاگادار بن زەکات نە بۆ موحەممەد ﷺ و نە بۆ خانەوادە و خزم و کەسی موحەمەد ﷺ ناشێت."

ئەو بەم پەیامەی بە شێوەیەك ڕیشاڵی ماڵ و سامان و وەرگرتنی زەکاتی لەنێو بنەماڵەی خۆیدا هێنابوویە دەر، کە هیچ کەسێك لەدوای مەرگی ئەو زاتە نەتوانێت دەست بۆ ئەو بابەتە بەرێت و مەقام و پێگەی ئالی نبوەت بۆ خۆدەوڵەمەندکردن و بە مەبەستی بازرگانیکردن بەکار بهێنێت.

ئایا ئەم بابەتە هێندە گرنگە، کە ئەم زاتە بەم چەشنە قسەی تیادا بکات؟ بێگومان دەبێ هۆکارێك هەبێت لەپشت ئەم وتە و بڕیارانەی پەیامبەری ئیسلام ﷺ، ئەگینا خۆی و ماڵباتی خۆی شیاوترین کەس بوون کە پشکی زەکات وەربگرن، چونکە ئەم زاتە تەواوی ژیانی خۆی لە هەژاریدا بەسەر بردووە.

بێگومان ئەو دەیویست هەموو ئەو دەنگۆ و گومانانە بەدرۆ بخاتەوە کە پێیان وایە ئاییندارى و پلەوپایەی ئایینی سەرچاوەی داهات و سامانی مرۆڤن. ئەو دەیویست بڵێت: نەخێر، پێویستە مرۆڤ دەوڵەمەندی خۆی لەپێناو ئاییندا بەخەرج بدات، ئیدی پێویستە دەوڵەمەندەکان لە ترۆپکی هەبوونیدا بهێنە خوارەوە و خزمەت بە ئایین بکەن، دەیویست هەمووان تێبگەیەنێت کە ئەو وەك کەسی یەکەمی ئایین نایەوێت بە هۆی ئایینەوە دەوڵەمەند بێت، بۆ ئەو مەبەستەش جگە لە داهاتی دەستی خۆی، پەنای بۆ هیچ دەوڵەمەندێك نەدەبرد، مەگەر لەپێناو ژیانی هەژاراندا کە تەنانەت ئەوکاتیش خۆی لە ڕیزی هەژاران هەژمار نەدەکرد، بۆ ئەوەی نەیارانی نەڵێن ئایین و پەیامەکەی لەپای سەروەت و سامانی دونیا بوو.

---

(١) ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە, بە ژمارە: (١٧٥١٩).

ئیتر بڕیاری سوودنەبینین لە ئایین و پلەوپایەی پێغەمبەرایەتی زێتر دەنگی دابوویەوە، بە شێوەیەك نەك تەنها پێغەمبەر ﷺ خۆی، بەڵکو پەروەردگاریشی هاتە سەرخەت و پێی ڕاگەیاند: نەکەی هیچ کات پلەوپایەی ئایینی و پێغەمبەرایەتیت بۆ مەرامی تایبەتی بخەیتە کار، نەکەیت لەپاڵ بڵاوکردنەوەی ئایین و ڕێنیشاندانی مرۆڤایەتیدا، داوای سەروەت و سامانیان لێ بکەی، پێی فەرموو: نەك نابێ هەر داوای بکەی، تەنانەت لە ئەگەری وەها پێشنیازێك کە لەلایەن ئەوان بخرێتە ڕوو، نابێت هەرگیز بچیتە ژێر باری ئەو داوایەیان، پێویستە لەسەرت ئەو پێشنیازە ڕەت بکەیتەوە، نەك تەنها ئەوە، بەڵکو دەبێ ئەو دەنگۆیانەش بەدرۆ بخەیتەوە کە دەیانەوێت وا نیشان بدەن کە ئایین لەپێناو دەستخستنی سەروەت و ساماندا هاتووە، ئەوەتا پێی دەفەرموێت: ﴿ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ﴾(١).

واتە: "بە بێباوەڕان ڕابگەیەنە کە لەبەرامبەر گەیاندنی ئاییندا، داوای هیچتان لێ ناکەم، من لەو کەسانە نیم کە ببم بە بارگرانی بەسەر خەڵکانی تردا."

ئیدی ئەم پەیامە ڕاشکاو و بڕیارە هەمیشەییەی پەیامبەری ئیسلام ﷺ کە ناوەڕۆکەکەی بریتیبوو لەوەی نابێت ئایین و پۆست و پلەی ئایینی لە پێناو بەرژەوەندی دارایی تایبەتدا بە کار بهێنرێن، وەك هێماو نیشانەیەك وابوو بۆ نەیارەکانی تا ئەو زاتەی پێ بناسنەوە، تەنانەت لە دوورگەکانی دەورووبەری مەدینەش دەنگی دابوویەوە، بە شێوەیەك کە ئەگەر کەسێك بیویستایە ئاشنای موحەممەد ﷺ بێت، ئەوەندە بەس بوو کە لە ڕێگەی وەرنەگرتنی زەکات و مشەخۆری نەکردن بە سەر هاوەڵانیدا بیناسێتەوە.

سەلمانی فارسی رضي الله عنه کە هاوەڵێکی ئازیزی پەیامبەرە ﷺ، بۆمان دەگێڕێتەوە کە لە سەفەری گەڕانی بەدوای هەقیقەت و ڕاستیدا ڕێی دەکەوێتە لای پیاوچاکێکی ئایینی، دواتر لە سەرەمەرگیدا داوای لێ دەکات کە ڕێنموونی بکات بۆ لای

---

(١) سوورەتی (ص)، ئایەتی: (٨٦).

پیاوچاکێك، ئەو پیاوچاکە ئایینییەش ڕێنموونی دەکات بۆ ئەوەی بچێتە دیداری فەخری کائینات حەزرەتی موحەممەدﷺ، بۆ ئەو مەبەستەش ئاکار و نیشانەکانی بۆ وێنا دەکات، تا بە هۆیانەوە بیناسێتەوە و پێی دەڵێت: بڕۆ بۆ لای ئەم زاتە و بەوە بیناسەوە کە یەکێك لە ئاکار و نیشانەکانی ئەوەیە، هیچ کات زەکات لە شوێنکەوتووەکانی وەرناگرێت[1].

ئەم خۆدوورگرتنەی پەیامبەری ئیسلام ﷺ لە بەکارهێنانی ئایین وەك سەرچاوەی داهات، نەك تەنها خۆی وماڵباتی ئەوی گرتووەتەوە، بەڵکو ئاگادارکردنەوەکە گەیشتووەتە تێکڕای هەڵگرانی بیروباوەڕی ئیسلام. ئەوەتا قورئانی پیرۆز کۆی موسڵمانان و مرۆڤایەتی ئاگادار دەکاتەوە کە هیچ کات ئایین بە پارە و سامان نەفرۆشن. ڕوونتر بڵێین، پێیان دەڵێت نەکەن ئایین بکەنە دەروازەی وەدیهێنانی ئامانجە داراییەکانتان و ئایین لەبەرامبەر کاڵا و دراوێکی کەمدا بفرۆشن، قورئان فەرمووی: ﴿وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِى ثَمَنًا قَلِيلًا﴾[2].

واتە: "نەکەن بەڵگە و نیشان و ئایەتەکانی من لەبەرامبەر دەستکەوت و پارەیەکی کەمدا بفرۆشن."

هەموو ئەم دەق و تێکستە ئایینییانە بۆ ئەوە بوون کە موسڵمانان بزانن بەکارهێنانی ئایین بۆ مەرامی دارایی، پێچەوانەی سروشت و پرەنسیپەکانی خودی ئایینە.

ئەم جارە ئیسلام بەناڕاستەوخۆ ڕوو لە زانایانی ئایینی دەکات و پێیان دەڵێت: نەکەن پێگەی ئایینیتان بۆ چەوساندنەوەی خەڵکی و پڕکردنی باخەڵتان بەکار بێنن و فەتوا و ئامۆژگارییەکانتان بکەنە ئامرازی خواردنی پارەی خەڵکی بە شێوەیەکی ناڕەوا، وەك ئەوەی ئاگادار بێت کە بەڵێ گرووپێکیش لەناو ئیسلامدا سەر

---

(١) بڕوانە: السيرة النبوية: ئیبن هشام: (١٣٨/١).

(٢) سوورەتی (البقرة)، ئایەتی: (٤١).

هەڵدەدەن و لەژێر سایە و بەیداخی زانای ئایینی خەڵکی دەڕووتێننەوە و خۆیان دەوڵەمەند دەکەن، بەمەش نموونەیەکی خراپی ئایین بۆ مرۆڤایەتی بەرجەستە دەکەن، بۆ ئەو مەبەستەش قورئانی پیرۆز نموونەی پیاوانی ئایینی مەسیحی و ئایینی جوولەکە دەخاتە بەر دیدی زانایانی ئایینی ئیسلام و تێکڕای موسڵمانان، وەك نیگایەك کە هیچ کات ئەم کردارە ناشیرینەی ئەوان دووبارە نەکەنەوە، کاتێك ئەوان لەپێناو دەستکەوتنی نرخێکی کەم و سەروەت و سامانێکی کاتیی دونیادا، ئایینیان بەکار هێنا و بە ناوی کەنیسە و پاراستن و بڵاوکردنەوەی ئایین خەڵکیان دەڕووتاندەوە، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْأَحْبَارِ وَٱلرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَـٰطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾[1]. واتە: "ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، چاك بزانن کە زۆربەی حاخام و مالومەکانی جوو و قەشەی گاوران، ماڵ و سامانی خەڵکی بەناحەق دەخۆن و بەرهەڵستی ڕێباز و ئایینی خوا دەکەن."

ئەم دەستپێکە میتۆدێکی ئایینیمان نیشان دەدات، سەبارەت بە بەکارهێنانی ئایین وەك ئامرازی پەید کردنی سامان و دابینکردنی بژێویی ژیان، دەشێ بڵێین ئەم میتۆدە سەرچاوەکەی لە دەق و تێکستەکانی قورئانی پیرۆز و فەرمایشتەکانی پەیامبەر ﷺ هەڵدەقوڵێت، ئەم میتۆدە چەند خاڵێکمان نیشان دەدات، کە هەر بەکارهێنانێکی ئایین بەپێچەوانەی ئەم خاڵانە مرۆڤایەتی دەخاتە بەر نەفرەتی ئایین، خاڵەکانیش بریتین لەمانەی خوارەوە:

١- سەرکردەی ئایینی و ڕێبەرانی ڕابوونی ئیسلامی، ناشێت بە هیچ جۆرێك و لەژێر هیچ پاساوێکی دارایی و ئابووریدا دەستبەرداری ئایین و پەیامەکەیان بن.

---

(١) سوورەتی (التوبة)، ئایەتی: (٣٤).

٢- ئايين لەبری ئەوەی سەرچاوەی داهات و دەستکەوتنی سامان بێت، دەرگای بەخشین و هاریکارییە.

٣- ئەوانەی لەپێناو سەروەت و ساماندا دەستبەرداری ئایین دەبن، یان ئایین وەك ئامرازی مشەخۆری و خۆدەوڵەمەندکردن بەکار دەهێنن، دوا جار بەر نەفرەتی خودا و ئایین دەکەون.

٤- بەکارهێنانی هێزی ئایین وەك چەکی پەیداکردنی پارەوپوڵ، کاری پیاوانی ئایینی مەسیحی و جوولەکەیە و پێویستە بڕواداران و زانایانی ئەم ئایینەش خۆی لێ دوورەپەرێز بگرن، بەپێچەوانەوە هەمان ئاکامی ئەوانیان دەبێت.

خودای گەورە لە ڕێگەی ئایینەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە ئایدۆلۆژیا و ئایین پێویستە خزمەت بکرێت، نەك ئایدۆلۆژیا خزمەتی مرۆڤایەتی بکات، هەڵبەتە ئەگەر کەمێك لەسەر ئەم دەستەواژەیە نەوەستین، دەشێت کەسانێك هەر زوو لێکدانەوەیەکی هەڵەی بۆ بکەن و بڵێن:

ئاخر لە بنەڕەتدا ئایین بۆ ئەوە هاتووە ڕێنیشاندەر و چاوساغی مرۆڤ بێت، بۆ ئەوە هاتووە نەنگی و خراپەکانی بەردەمی لا بدات، بۆ ئەوە هاتووە لە شەوەزەنگ و نەهامەتییەکانی ئەم بوونە دەربازی بکات و بەرەو کەناری ئارامی و ڕووناکیی بەرێت، بۆ ئەوە هاتووە هەم لە دونیادا هەم لە دواڕۆژدا فریادڕەس و قیبلەنمای مرۆڤایەتی بێت، هەموو ئەمانەش گەواهی ئەوە دەدەن کە ئایین بۆ خزمەتی مرۆڤ هاتووە و پێچەوانەی قسەی تۆ دەسەلمێنێت.

بەڵێ، بێگومان هەموو ئەوانە ڕاستن ئەگەر ئایین وەك فۆڕم و میتۆدێکی خودایی هەژمار بکەین بۆ ڕێکخستنی ژیانی مرۆڤایەتی و پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکان و پەیوەندیی نێوان مرۆڤ لەگەڵ بەدیهێنەرەکەیدا، بەم شێوە تێگەیشتن لە ئایین و بنەما و دەق و تێکستەکانی، بێگومان سەرتاپای ئایین لە خزمەت دۆز و بەها باڵاکانی مرۆڤدایە.

بەڵام ئەگەر ئایین وەك ئامرازێك بەكار بهێنرێت بۆ خزمەتكردنی مرۆڤ لە ڕووە ماددییەكەوە، ئەگەر وا لە ئایین بگەین كە سەرچاوەی داهات و بازرگانی ئێمەیە، ئەوا بە هیچ شێوەیەك ئەم جۆرە لێكدانەوەیە جێگەی قبوڵكردن نییە و ئایینیش دوورە لە هەموو جۆرە پرەنسیپ و بنەمایەكی لەم شێوەیە.

هەر كاتێك ئایین لە هەر كۆمەڵگایەك خرایە خزمەت بەرژەوەندییە داراییەكانی تاك، ئەوا بێگومان نرخ و بەهای ئایین لە دیدی نەیارەكانیدا دێتە خوارەوە، هاوكات خودی ئەو كارەكتەرانەی كە بەم كارەش هەڵدەستن، لە بەها و ئەرزشی كەسایەتیی خۆیان كەم دەكەنەوە.

بەپێچەوانەوە، هەر كاتێكیش ئایین دوور خرایەوە لە بەرژەوەندییە داراییەكانی تاك، ئەوا بەهای ئایین و كارەكتەرانی نەك تەنها لە دیدی شوێنكەوتووەكانیان، بەڵكو لە دیدی نەیار و دوژمنەكانیشیان بەرز دەبێتەوە و دەبێتە دەروازەیەك لەبەردەم والاكردنی دڵیان بۆ قبوڵكردنی ئایین.

هەر بۆیەش نەیارانی ئایینی ئیسلام و دوژمنانی كەسایەتیی موحەممەدﷺ، كاتێك بینییان ئایین بۆ بازرگانی و خۆدەوڵەمەندكردن بەكار ناهێنێت، هێندەی تر خۆی و پەیامەكەیان لا گەورە و بەنرخ بوو، كە دوا جار خۆیان ڕادەستی كرد و بۆی كەوتنە سەر چۆك.

ئەگەرچی لە بنەڕەتدا –بە بۆچوونی ئێمە– هیچ ئایینێكی ئاسمانی ڕاستەقینە، خۆی وەك ئامرازێكی دارایی نەخستووەتە بەردەم نەیارەكانی بۆ ئەوەی ڕازییان بكات بێنە ناویەوە، بەڵام دەشێ ئایینی مەسیحیەت و پیاوانی كڵێسا وەك نموونەیەكی زیندوو بێنینەوە، كە چۆن لە دەرئەنجامی خستنەگەڕی ئایین وەك سەرچاوەی داهات، هەم مەسیحیەت وەك ئایین هەم پیاوانی ئایینی كڵێساش وەك كارەكتەری ئایینی لە بەها و ئەرزشی ئەخلاقی و مەعنەویی خۆیان كەم كردەوە و كەوتنە بەر نەفرەتی ئایین.

له سەدەکانی ناوەڕاستدا، ئایینی مەسیحیەت ئامرازێك بوو بەدەست پیاوانی ئایینی بۆ کۆکردنەوەی داهات و تێرکردنی غەریزەی ئارەزووبازی، پیاوانی کڵێسا دەق و تێکستەکانی ئایینیان وەك قەڵغانێك بۆ خۆیان بەکار دەهێنا، بە جۆرێك خەڵکیان دەستەمۆی دەق و تێکست و بڕیارەکانی خۆیان کردبوو کە ئیتر کڵێسا و پیاوانی ئایینی بە هۆی دەوڵەمەندییەوە هێزێکی وایان دروست کردبوو کە ئەگەر نەفرەتی ئایین نەبووایە، هەرگیز چاوەڕێ نەدەکرا بەم شێوەیە لەسەر سەکۆی دەسەڵات و لە پلە و شکۆی کەسایەتیدا بهێنرێنە خوارەوە و ڕیسوای زەمانە بکرێن.

یاسایەکی گەردوونییە کە هەر شتێك دژی سروشت و پەیامی خۆی خرایە ڕوو، سەرەنجامەکەی کپبوونەوە و لەناوچوونە، هەر ئەمەش وای کرد ئایینی مەسیحیەت تووشی داڕمان و پیاوانی ئایینی مەسیحیش ڕووبەڕووی شکانی کەسایەتی ببنەوە.

کاتێك بینرا تاکە ئاڕاستەی ئایین، سەندنەوەی ئازادیی مرۆڤەکان و ڕووتاندنەوەی شوێنکەوتووانی خۆیەتی لە ڕووی داراییەوە، هەروەها کاتێك بینرا پیاوانی ئایینی کڵێسا تەنها حەز و خولیا و ئامانجیان لەپاڵ بەکارهێنانی ئاییندا، کۆکردنەوەی سەروەت و سامانە، ئەو کاتە شۆڕشی ڕۆشنگەراکانی ئایینی دژی ئایینێك کە بەناڕەوا و بە فۆڕمێکی هەڵە نیشانی خەڵکی درابوو دەستی پێ کرد، هاوکات ئەو شۆڕشە دژی ئەو کارەکتەرە ئایینییانەش بوو کە هۆکاری ئەو خراپ بەکارهێنانەی ئایین بوون، سەرئەنجام کڵێسا لە داهات و دەسەڵات دوور خرایەوە و ئایین و کەسایەتییە ئایینییەکانیش لە ترۆپکی ئەرزش و پێگەی بەرزی خۆیان هێنرانە خوارەوە.

هەڵبەتە ئێمە بەوە دەڵێین (نەفرەتی ئایین)، چونکە ئەگەر ئایین وەك خۆی خرابایە ڕوو، ئەوا پیاوانی ئایینی مەسیحی نەیاندەتوانی لە ڕێگەی دەق و تێکستە ئایینییەکانەوە ئەو خەزێنە داراییانە کۆ بکەنەوە، چونکە هیچ کات ئایین خۆی بە

هۆکاری دەوڵەمەندی نیشان نەداوە تا ئەوان بتوانن ئەو کارە ئەنجام بدەن، ئەوکات ئەگەر ئەمانیش بەم شێوەیە خەڵکیان نەخەڵەتاندبا و بەم جۆرە و لەژێر پەردەی ئایین ئەو هەموو پارە و سامانەیان گل نەدابایەوە، ئەوکات خەڵکیش بەم شێوەیە نەفرەتی لە ئایین و پیاوانی ئایینی مەسیحی نەدەکرد، دوا جار ئاکامیان بەم شێوەیە نەدەبوو کە پێی گەیشتن.

ئێمە هەمان ئەو نەفرەتەی ئایین لە کۆمەڵگەی کوردیدا هەست پێ دەکەین، کە ئەگەر هەر زوو لایەنی پەیوەندیدار و دڵسۆزانی ئایین فریای نەکەون، لەوانەیە ئیسلام و بانگخوازانی ئیسلامیش هەمان ئاکامی مەسیحیەت و پیاوانی ئایینی مەسیحیەتیان هەبێت و نەفرەتی خراپ سوودبینین لە ئایین دووچاری ئەوانیش ببێتەوە، هەڵبەتە ئەمە بە ڕەچاوکردنی جیاوازیی نێوان هەردوو ئایین و سروشت و تایبەتمەندییەکانیان.

ئێستا ئایین چاکترین سەرچاوەی داهاتی تاکەکانە، هەڵبەتە ئەگەر تاکەکان بەپێچەوانەی پیاوانی ئایینی مەسیحی بیانتوانیبایە خزمەتێك بە ئایین بکەن، ئەوکات دەکرا چاوەڕوانی هەمان ئاکامی ئەوانیان لێ نەکەین، بەڵام سەیر لەوەدایە هەمان ئەو هەڵانە دووبارە دەکەنەوە کە ئەوان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا تێی کەوتن.

بە ناوی ئایین و مزگەوت و تەکیە و خانەقا، بە ناوی بانگخواز و شێخ و مەلا، بە ناوی پسپۆڕی ئایینی و پزیشکی نەبەوی، بە ناوی عیرفان و تەسەوفی ئیسلامی، بە ناوی سەلەفیەت و ئوسوڵیەت، بە هەموو ئەم ناوانە سوود لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام وەردەگیرێت، کە هەمان ئەم شتانە ئایینی مەسیحیەت و کڵێسا و پیاوانی ئایینی دووچاری شکست و کپکردنەوە کردن، کە تا ئێستاش نەیانتوانیوە پێگەی خۆیان بدۆزنەوە و هیچ پرشنگ و ئاسۆیەکیش بۆ بەدیهاتنی ئەو کارە بەدی ناکرێت.

لەم ڕۆژگارەدا سادەترین پیشە خۆی لە سێ بواردا دەبینێتەوە، کە بوونەتە سەرچاوەی داهات و بژێویی بەشێکی بەرچاوی کۆمەڵگە، کە لە ڕاستیدا ئێمە پێمان وایە ئەم سێ بوارە قورسترین سێ کار و پیشەن کە مرۆڤ بتوانێت مومارەسەیان بکات، ئەوانیش:

١- کارەکتەری ئایینی

٢- کارەکتەری سیاسی

٣- کارەکتەری هونەری

ئەم سێ بوارە -ئایین و سیاسەت و هونەر- بە بڕوای ئێمە، پێویستە تەنها کەسی پسپۆڕ قسەیان تیادا بکات، چونکە:

هەرچی بواری ئایینە دواڕۆژی مرۆڤایەتی لەدەست ئەودایە و بوارێکی هەستیارە، دەشێت هەر جۆرە بەکارهێنانێکی هەڵە ببێتە مایەی تیاچوونی مرۆڤ لە دواڕۆژدا. ئەمە وێڕای کاریگەریی ئایین لەسەر تاك، کە ئەگەر وەك خۆی پێشکەش بە مرۆڤایەتی نەکرێت، ئەوا مرۆڤەکان بەرەو وەحشیگەری و نامرۆڤبوون ئاڕاستە دەکات.

بواری سیاسەتیش دونیا و ژینی مرۆڤایەتی لەدەست دایە، بۆیە دەگونجێ هەر کەموکوڕییەك لە خراپ بەکارهێنانی سیاسەت، ببێتە مایەی کۆیلەبوونی هاوڵاتیان و دەستەمۆبوونی وڵات و کەوتنە ژێر هەیمەنە و هەژموونی وڵاتێکی تر.

هەرچی پەیوەستە بە بوارە هونەرییەکەش- هونەر بە هەموو بەشەکانیەوە- پێمان وایە بەشێکی زۆری ناساندنی نەتەوەکان و تێکەڵاوبوونیان لەگەڵ یەکتر دەکەوێتە ئەستۆی هونەر، کە ئەگەر ئەم لایەنەش کارەکتەری پسپۆڕ و کارامە و لێهاتوو سەرکردایەتیی نەکات، کۆمەڵگە ناتوانێت وەك پێویست گەشە بکات و خۆی بە کۆمەڵگە و کەلتوورە جیاوازەکانی تری مرۆڤایەتی بناسێنێت.

بەڵام ئەوەی جێی داخە، تەنها ئەم سێ بوارە کەسی پسپۆڕ و تایبەتمەند قسەی تیادا ناکات، بۆیە هەمیشە وتوومانە لەم کۆمەڵگەیەدا سادەترین و ئاسانترین پیشە، پۆشینی جلی ئایینی و بەستنی بۆینباغی سیاسی و خۆڕووتکردنەوەی هونەرییە. ڕوونتر بڵێین، ئاسانترین شت بەرجەستەکردنی کاری (بانگخوازی و سیاسەتمەداری و گۆرانیبێژییە).

ئیدی ئایین بووەتە قوتابخانەیەك کە هەموو کەسێك لە تەمەنی شەشساڵیدا – بگرە بچووکتریش– ناوی خۆی تێدا تۆمار دەکات، هەر زوو پلەی باڵا بەدەست دەهێنێت و بە ویست و ئارەزووی خۆی قسەی تێدا دەکات، ئەستەمە کەسێك بدۆزیتەوە قسەی تایبەت بە خۆی نەبێت سەبارەت بە پرس و بابەتە ئایینییەکان. ئەوەی سەیرە، زۆرینەیان پسپۆڕی و بوونی زانیاری لەبارەی ئایین و پرسە ئایینییەکاندا زۆر بەکەمی لێ بەدی دەکرێت.

بێگومان دۆخی سیاسەت و هونەریش لە دۆخی ئایین زۆر خراپترە، زۆرینەمان شیکەرەوەی سیاسی و کاراکتەری بواری کۆمیدیا و نواندنین، بابەت و ڕووداوێکی ڕۆژانە نییە کە لێکدانەوەی سیاسی و تەنزی هونەری و کۆمیدیمان لەبارەیەوە نەبێت، هەڵبەتە هەموو ئەمانە بێ ئەوەی هیچ بەهرەیەکی سیاسی یان هونەریمان تێدا بەرجەستە بووبێت، یان قسە و کارەکانمان لەسەر بنەمای پسپۆڕی و شارەزایی بێت.

بۆیە دۆخی ئایینیمان بە شێوەیەك شێواوە، کە زیاتر لە کۆمەڵگەیەکی نائایینی دەچێت، خەریکە هەمان ئەو ڕووداوانەمان تووش دەبن کە بەسەر کۆمەڵگە مەسیحییەکاندا هاتن. دۆخی سیاسی و هونەریشمان بە شێوەیەك شپرزەیە، کە تەنانەت دوژمنەکانیشمان ئاوات و خۆزگەمان پێ ناخوازن.

چیتر نابێ ئایین و بڵاوکردنەوەی ئایین وەك پیشە هەژمار بکرێن و تاکەکان وەك سەرچاوەی ڕزق و ژیانیان پشتیان پێ ببەستن، ناکرێ چیتر زاناکان پەنا بەرنە بەر

لادێ و شوێنە سەختەکانی ئەم وڵاتە، لەپێناو وەرگرتنی زەکات و مەڕومالآت، ناشێ چیتر قورئان و زانستە شەرعییەکان وەك کەرەستەیەك بەکار بهێنرێن بۆ خۆدەوڵەمەندکردن و ڕووتاندنەوەی تاکەکان، پێویستە ئیتر ڕێگە نەدرێت دەیان کەس بە ناوی مزگەوت و تەکیە و خانەقاکانەوە زگ و لاشەیان تێر بکەن، بێ ئەوەی بەقەد زەڕەیەك سوود و قازانجی ئەم دینەیان هەبێت[(١)].

ئەوەی ئێمە لە ئاییندا پیشانمان دەدرێت لەلایەن بەشێك لە کارەکتەرە ئایینییەکان، بریتییە لە بەکارهێنانی ئایین لەپێناو خۆدەوڵەمەندکردن، ڕێك بەپێچەوانەی ئەو میتۆد و فۆڕمە ئایینییەی کە پەیامبەری ئیسلام ﷺ لە ژیانیدا بەرجەستەی کرد.

هەڵبەتە مەترسییەکە لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە سەرمەشقی ئەم خراپ سوودبینینە لە ئایین کەسانێکن کە ناوی زانای ئایینی و بانگخواز و مامۆستای ئایینییان لەخۆ ناوە، کە لە ڕاستیدا هیچ پەیوەندییەکیان بە ئیسلامی ڕاستەقینە و بانگخوازانی ڕاستەقینەوە نییە، جگە لە ڕووکەش و قەد و بالآیان، ناخ و دڵ و دەروونیان هیچ پەیوەندییەکی بە میراتگرانی سەروەتی پێغەبەرانەوە نییە.

ئەوان دیمەنەکانی ئایینمان بە شێوەیەك بۆ نمایش دەکەن، وەك بڵێی بوونی مامۆستا و بانگخوازی ئایینی تەنها گوزراشت بێت لە خواردن و خواردنەوە و وەرگرتنی زەکات و سەرفیترە، بەشێك لە مزگەوتەکان بوونەتە خانەی ئەو واعیزانەی کە لەپاڵ هەڵدان بە شانوباڵی دەوڵەمەند و دەسەڵاتداران، خەریکی بونیادنانی کۆشکی زێڕین و پڕکردنی خەزێنەی قاڕونین، ئایین کراوەتە جەژن و

(١) هەڵبەتە ئەمەش بەوە دەکرێت کە ژیانی زانایان و بانگخوازانی بەڕێزی ئایینی بە جۆرێك دابین بکرێت, کە پێویستیان بەوە نەبێت لەپێناو دەستەبەرکردنی بژێویی ژیانیان ئاتاجی دەستی خەڵکی بن و ناچار بن پەنا ببەن بۆ بازرگانیکردن بە ناوی ئایین، کە دوا جار ئەم کارە بە زەرەری خۆیان و ئایین و کۆمەڵگە تەواو دەبێت.

بۆنەی ئەو واعیزە هەرزەکارانەی کە لەپاڵ سوککردنی خۆیان و ئایینیان، خەریکی کۆکردنەوەی سەروەت و سامانن.

ئەم نموونانە، ئەو ڕاستییە تاڵ و دزێوانەن کە خەریکە کۆمەڵگە ئیسلامییەکان هاوشێوەی کۆمەڵگە مەسیحییەکان دووچاری ئابڕووچوون و بێئەرزشبوون دەکەن لە دید و هزری شوێنکەوتووەکانیاندا.

تەنها لە دۆخێکدا ئەشێ ئایین ببێتە یارمەتیدەری دارایی مرۆڤەکان، بە دەربڕینێکی تر تەنها لە یەك کاتدا مرۆڤ دەتوانێت ئایین وەك دەرچەیەك بۆ ڕزگار بوون لە هەژاری و خۆدەوڵەمەندکردن بەکار بهێنێت، ئەویش لەو ساتەدا کە تاکی هەژار ئاتاجی بەخشندەییی تاکی دەوڵەمەندە، تەنها لەو بارەدا ئایین خۆی وەك سەرچاوەی داهاتی مرۆڤ نیشان داوە، ئەمەش کاتێك دەبینین قورئانی پیرۆز لە دووتوێی ئایەتێکدا هەشت جۆری مرۆڤمان بۆ دەستنیشان دەکات، کە دەشێت ئایین لە ڕێگەی بونیادی زەکات ببێتە فریادڕەس و یارمەتیدەریان، قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ﴾[1].

واتە: "زەکات تەنها بۆ ئەو کەسانەیە کە هەژارن، یان نەدارن، یان زەکات کۆ دەکەنەوە، یان ئەوانەی تازە موسڵمان بوون و ئیمان جێگیر نەبووە لە دڵیاندا، یان ئەوانەی کۆیلەن، یان ئەوانەی قەرزارن، یان ئەوانەی جیهاد لەپێناوی خوادا دەکەن، یان ئەوانەی کە ڕێبوارن، دابەشکردنی زەکات بەم شێوەیە فەرزە لەلایەن خوداوە لە گەردنی ئیمانداران، خواش زانا و دانایە."

---

(١) سوورەتی (التوبة)، ئایەتی: (٦٠).

بێگومان لەم بارودۆخەشدا وێڕای ئەوەی کە ئایین بووەتە هۆکاری دەوڵەمەندی بۆ ئەو جۆرە کەسانە، بەڵام لە هەمان کاتدا ئاماژەی بەو میتۆدە داوە کە لەگەڵ سروشتی خۆیدا دەگونجێت، بۆیە ئەوەی خستووەتە یادی مرۆڤەکان کە ڕاستە تۆ بە هۆی سوودبینین لەم دەقە کەوتوویتە بەر ڕەحمەت و دەستی میهرەبانیی کەسانی دەوڵەمەند، بەڵام ئاگادار بە کە تاکی بەخشەر باشترە لە تۆی وەرگر، چونکە ئەو خۆی بۆ خزمەتی ئایین بەکار دەهێنێت، بەڵام تۆ ئایین بۆ خزمەتی خۆت دەخەیتە گەڕ. (اليدُ العُليا خَيْرٌ مِنَ اليَدِ السُّفْلى)[1]، واتە: بێگومان ئەو دەستەش کە دەبەخشێت باشترە لەو دەستەی کە وەردەگرێت، ئەمەش وەك چەسپاندنی ئەو ڕاستییەی کە ئایین لە بنەڕەتدا نابێت ببێتە سەرچاوەی داهاتی شوێنکەوتووەکانی، ئەگینا داهاتوویەکی نادیار و مەترسیدار چاوەڕێیان دەکات.

گەورەییی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ و بەهێزیی کەسایەتیی ئەو زاتەش لەوەدا بوو کە فەرمووی: من ئایینی خۆم بە پارەی ئێوە ناگۆڕمەوە، ناتوانم هێز و کاریگەریی پەیام و بانگەوازی خۆم لەبەرامبەر توانا و زۆری سامانی ئێوەدا بخەمە گرەو.

پێشتر وتمان، دەکرا پێغەمبەر ﷺ بچێتە ژێر باری داواکەی ئەوان و سەروەت و سامانەکەیان قبوڵ بکات، بەڵام ئەو کارەی ئەنجام نەدا بۆ ئەوەی ببێتە پەند و ئامۆژگاری بۆ نەوەکانی دوای خۆی، کە هیچ کات بیرو باوەڕی خۆیان نەخەنە گرەوی سامان و داراییی دونیا، چونکە بێگومان ئەو کارەیان کەسایەتییان دەڕووشێنێت و لە گەیشتن بە ئامانج دووریان دەخاتەوە.

سەرئەنجام، هەموو سامان و هێز و توانای موشریکانی قوڕەیش نەیانتوانی بەسەر دەنگ و سەدای زوڵاڵی ئەو پەیامەدا سەر بکەون کە لەبری هێزی پارە، هێزی باوەڕ و متمانەبەخۆبوونی هێنایە کایەوە، بەپێچەوانەوە بێهێزی و کەمتوانایی بانگخوازان –کە لە بنەڕەتدا جێگری پێغەمبەرانن– بە بڕوای ئێمە بۆ نەبوونی ئەم

---

(١) بڕوانە: دلائل النبوة ومعرفة أحوال صاحب الشريعة : البيهقي: (٣٨١/٥).

خاڵە دەگەڕێتەوە، بەتایبەت کە بەشێکی زۆریان لەبەرامبەر سەروەت و سامانێکی کاتی پشتیان لە پرەنسیپ و بنەما سەرەکییەکانی ئایینەکەیان کردووە.

دوا جار ئەو میتۆد و فۆرمە ئایینییەی کە ئێمەمانان و بەشێك لە زانایانی ئایینی بەرجەستەی دەکەین، فۆرمێکە کە تیایدا ئایین لەبری ئەوەی ئامانج بێت لەلامان، کردوومانە بە ئامرازێك بۆ گەیشتن بە پارە و دەسەڵات.

ئیدی بە شێوەیەك ئازاری ئایین دەدەین، کە ئایین لەدەست ئەم کردارانەی ئێمە خەریکی نوزەو ناڵەیە، ئەگەر بە زووترین کات فریای خۆمان نەکەوین و ئەم وێنە شێواوە ڕاست نەکەینەوە، بەدڵنیاییەوە بەر نەفرەت و ناڵەی ئایین دەکەوین و زبڵدانی مێژووش جێگەمان دەبێت.

# بەشی دەیەم
# فەلسەفە و جەهالەت

ئارچ لاستبێرگ، خاوەنی پەرتووکی (چۆن خۆت دەفرۆشیت -How To Sell Yourself)، سێ بنەمای سەرەکی دەخاتە ڕوو بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێت لە گەیاندنی ئایدۆلۆژیا و بیروبۆچوونەکانیان سەرکەوتوو بن، کە بریتین لەمانەی خوارەوە[1]:

١- **توانا و لێهاتوویی** (Competence)

٢- **بەرپرسیارێتی** (Likability)

٣- **بەخت** (Luck)

بۆ ئەوەی خاڵی پەیوەندیی ئەم سێ بنەمایە بە باسەکەی ئێمە ڕوون بێتەوە، بەکورتی تیشك دەخەینە سەریان، دواتر نموونەیان بۆ دەهێنینەوە، پاشان دەچینە ناواخنی بابەتەکەمان.

---

(١) بڕوانە: Arch Lustberg :How To Sell Yourself: (١٥)

### یەکەم: توانا و لێهاتوویی

ئەگەر مرۆڤێك پێی وا بێت ئەو ئایدۆلۆژیا و هزرەی هەیەتی ڕاستەقینەیە، هەوڵ دەدات زۆرترین کەسانی دەوروبەری قەناعەت پێ بکات، بڕوا بەو ئایدۆلۆژیا و ئایینەی ئەو بکەن، بۆ ئەو مەبەستەش یەکەمین هەنگاو پێویستە لەسەری، کەسێکی زرنگ و لێهاتوو بێت و عەقڵ و مەعریفەیەکی تەواوی هەبێت، تاکو بتوانێت مەیلی ئەوان بۆ خۆی ڕابکێشێت و بە عەقڵ و زیرەکییەکەی دەستەمۆیان بکات.

### دووەم: بەرپرسیارێتی

بەرپرسیارێتی بەو مانایەی کە تەنها لێهاتوویی و هێز و توانا بەس نییە تا خەڵکی بڕوا بەو بۆچوونانە بکەن کە تۆ هەتن، بەڵکو وێڕای لێهاتوویی و دانایی، پێویستە لەسەرت هەوڵ بدەی لە ئاست ئەو ئایدۆلۆژیا و بۆچوونەی کە پێت وایە ڕاستەقینەیە، هەست بە بەرپرسیارێتی بکەی، بە جۆرێك هەوڵ بدەی کە ئەم بۆچوونە تەنها بۆ خۆت نەبێت، بەڵکو هەوڵ بدەی خەڵکی تریش سوودی لێ ببینن، بێگومان ئەوەش بەوە دەکرێت کە تۆ هەمیشە ئەم ئایدۆلۆژیا و بۆچوونە بڵاو بکەیتەوە و بیگەیەنیت بە زۆرترین مرۆڤ، تا زۆرترینیان بەهرەمەند بن لێی.

### سێیەم: بەخت

بێگومان ئەم خاڵە لە ئەدەبیاتی ئایینەکان بەتایبەت –ئایینی ئیسلام– دەچێتە نێو چوارچێوەی ئەو بابەتەی کە پێی دەڵێن چارەنووس (قەزاوقەدەر)، بە واتای ئەوەی تەنها زیرەکی و لێهاتوویی و بڵاوکردنەوەی ئەو بیروباوەڕەی کە تۆ پێت وایە ڕاستە، تەنها ئەم دووانە بەس نین تا خەڵکی دوات بکەون، بەڵکو وێڕای ئەم دوو بنەمایە، پێویستە هەندێك بەختت هەبێت بۆ ئەوەی خەڵکی بڕوات پێ بکەن، هەرچەندە لە ڕاستیدا زۆربەی کات لێهاتوویی و بەهرەمەندی و هەوڵدان و هەست بە

بەرپرسیارێتیکردن لەبەرامبەر ئەو کارەی کە بڕوات پێی هەیە، سەر دەکێشن بۆ ئەوەی تۆ بەختێکی باشت هەبێت[١].

هەر کاتێك مرۆڤ ئایدۆلۆژیا و هزر و بۆچوونێکی هەبوو، خواست و ئارەزووی ئەوەشی لەلا بوو کە خەڵکی بڕوای پێ بکەن، پێویستە ئەم سێ بنەمایە لە کەسایەتییەکەیدا هەبێت، ئینجا دەتوانێ سەرکەوتوو بێت، وەك نموونەیەکیش، دەتوانین ژیانی پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ بکەینە بەڵگە، بەم شێوەیەی خوارەوە:

پەیامبەری ئیسلام موحەممەد ﷺ، لەلایەن پەروەردگار ئایینێکی بۆ هاتە خوارەوە، کە دەبووایە هەموو خەڵکی بانگ بکات بۆ ئەوەی بێنە نێو ئەو ئایینە، بۆ ئەو مەبەستەش دەبووایە کەسێکی بەهرەمەند و ژیر و لێهاتوو بێت، تا بتوانێت ژیرانە مامەڵە لەگەڵ قوڕەیشدا بکات کە لە ترۆپکی زیرەکی و ڕەوانبێژیدا بوون، بێگومان کەسایەتیی موحەممەدﷺ هەڵگری ئەم خەسڵەت و بنەمایە بوو، چونکە لە شێوازی مامەڵەکردنیدا لەگەڵ دۆخی پەیامەکەی هەمووانی تووشی سەرسوڕمان کردبوو.

بەڵام تەنها لێهاتوویی و دانایی ئەو زاتە بەس نەبوو تا پەیامەکەی بگاتە ئەنجام، بەڵکو پێویست بوو لەسەری کە هەوڵ بدات ئەم پەیامەی بە خەڵکی ڕابگەیەنیت، بۆیە لە ڕێگەی عەقڵ و لێهاتوویی خۆی و بە فەرمانی پەروەردگاری بڕیاری دا پەیامەکەی ئاشکرا بکات، ئەوە بوو لەپێناو ئەم پەیامەیدا هەرچی ناخۆشی و دەردەسەری هەیە تووشی بوو، خۆشەویستانی شەهید کران، لە شار و وڵاتی خۆی دەرکرا، ئابلۆقەی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی خرایە سەر، بەڵام

---

(١) بەدڵنیاییەوە ئێمە وەك موسڵمان, پێمان وایە کە هەموو شتێك پەیوەستە بەو چارەنووسەی کە پەروەردگار بۆی نووسیوین، بۆیە هەموو ئەو پرسانەی لەژێر ناونیشانی بەخت و شانس دەخرێنە ڕوو, ئێمە دەیگێڕینەوە بۆ ئەو چارەنووسەی کە خودای باڵادەست بۆ ئێمەی بڕیار داوە.

ئەو لەپێناو پەیامەکەیدا هەستی بە بەرپرسیارێتی کرد و کۆڵی نەدا، سەرئەنجام خوای گەورە دەسەڵات و سەرکەوتنی پێ بەخشی.

بەڵام لە ڕاستیدا ئەم دوو خاڵەی ڕابردوو پێویستی بە بەخت (چارەنووس)ێکی باش هەبوو، بۆیە خوای گەورە ئەم چارەنووس و بەختە باشەشی بۆ ئەم زاتە بەرزە بڕیار دابوو، کاتێك پێی فەرموو: ﴿ هُوَ ٱلَّذِیٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِینِ ٱلۡحَقِّ لِیُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّینِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ ﴾[1].

واتە: "هەر ئەو زاتە بوو پێغەمبەرەکەی، هاوڕێ لەگەڵ هیدایەت و ڕێنموونی و ئایینی ڕاست و دروست ڕەوانە کردووە، تا سەری بخات بەسەر هەموو بەرنامە و ئایینەکانی تردا، هەرچەندە موشریك و هاوەڵگەران پێی سەغڵەت و دڵتەنگ بن."

هەروەها فەرمووی: ﴿ وَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعۡیُنِنَاۖ ﴾[2].

واتە: "ئەی موحەممەد ﷺ، خۆگر بە لەبەرامبەر بەدیهێنانی فەرمانی پەروەردگارتەوە، دڵنیا بە کە تۆ لەژێر چاودێریی ئێمەدایت."

هەروەها فەرمووی: ﴿ وَیَنصُرَكَ ٱللَّهُ نَصۡرًا عَزِیزًا ﴾[3].

واتە: "خوا سەرکەوتنێکی بەهێز و باڵات پێ ببەخشێت."

بەڵام هەر ئایدۆلۆژیا و بیروباوەڕێك یەکێك لەم سێ بنەمایانەی تێدا نەبوون، مرۆڤ لە گەیاندن و بڵاوکردنەوەیاندا تووشی شکست دەبێت، دوا جار خۆی و ئایدۆلۆژیا و بیروبۆچوونەکەی دەکاتە جێی گاڵتە و سووکایەتیپێکردنی نەیارەکانی.

ئەوەی دەمانەوێ لەم تەوەرەدا تیشکی بخەینە سەر، خاڵی یەکەمی ئەم سێ بنەمایانەیە، کە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە ڕەوتی فەلسەفە و ڕۆشنگەری و

---

(١) سوورەتی (التوبة)، ئایەتی: (٣٣).

(٢) سوورەتی (الطور)، ئایەتی: (٤٨).

(٣) سوورەتی (الفتح)، ئایەتی: (٣).

بیروباوەڕی ئایینی هەیە و پێمان وایە هەم ئاین هەم فەلسەفە بوونەتە قوربانیی دەستی ئەم خاڵە، ئەمەش بە هۆی ئەوەی زۆرینەی ئەوانەی لاف ئایینپەروەری و پسپۆری ئایینی لێ دەدەن، ئەم خاڵەیان تێدا نییە.

بە هەمان شێوە، زۆرینەی ئەوانەی بانگەشەی بیرمەندی و ڕۆشنگەری دەکەن، لە بنەڕەتدا خۆیان وێڵن بەدوایدا و زیاتر لە ئێمە پێویستیان پێیەتی. سەرئەنجام، لەبری ئەوەی ببنە مایەی بڵاوبوونەوەی ئاین و فەلسەفە، بوونەتە هۆی کپبوونەوە و بە سووك سەیرکردنی ئاین و عەقڵ لەلایەن نەیاران و دوژمنانیان.

هەڵبەتە سەرەتا لەم بەشەدا میتۆدی فەلسەفە و ڕۆشنگەری سەبارەت بەم بابەتە ڕوون دەکەینەوە، دواتر دەست دەخەینە سەر ئەو برینانەی کە عەقڵانیەت لە دەرئەنجامی نەبوونی ئەم خاڵەدا دووچاری بووەوە، ئینجا لە بەشی دواتردا تیشك دەخەینە سەر میتۆد و فۆڕمی ئاین سەبارەت بەم بابەتە، پاشان نەهامەتییەکانی ئاین لە غیابی ئەم خاڵەدا دەخەینە ڕوو.

## فەلسەفە و جەهالەت

فەیلەسووفی بەناوبانگی یۆنانی (ئەفلاتون)، لە کۆمارەکەیدا (کۆماری ئەفلاتون) ئاماژە بەو کۆمارە نموونەییە دەکات کە خەونی بەدیهێنانی هەیە، بۆ ئەو مەبەستەش ئەو پێی وایە تەنها دەبێ فەیلەسووف و بیرمەندەکان سەرکردایەتیی وڵات بگرنە ئەستۆ، یان دەبێ دەسەڵاتدارەکان ببنە فەیلەسووف، چونکە ئەو پێی وایە تەنها کاتێك وڵات پێش دەکەوێت کە هزرو دەسەڵات بەیەکەوە کۆ ببنەوە، ئەم کارەش نایەتە دی مەگەر ئەوەی تەنها فەیلەسووفەکان سەرکردایەتی بگرنە دەست، ئەوکات هەم دەسەڵاتیان هەیە و هەم مەعریفە و لۆژیك و فەلسەفە، بەمەش

دەسەڵات و مەعریفە لە یەك كەسدا كۆ دەبنەوە و كۆمارێكی نموونەیی لەسەر بنەمای عەدالەت دێتە كایەوە[1].

دواتر گلەیی لە ڕەوشی فەلسەفە و ڕۆشنگەری دەكات و هۆكاری نەهامەتییەكانی دەخاتە ڕوو، ئەفلاتون سەبارەت بەم بابەتە دەڵێت:

"بەهەرحاڵ ئەمە ئەو هەڵەیەمان بۆ ڕوون دەكاتەوە كە ئێستا ئەنجام دەدرێت، كە بووەتە مایەی لاوازبوون و لەناوچوونی فەلسەفە، كە بریتییە لەوەی كەسانی ناشایستە و نەگونجاو بۆ فەلسەفە خۆیان بە فەلسەفە خەریك كردووە، هەروەك پێشتریش ئاماژەم بۆ كرد، ئەمە لە كاتێكدا پێویستە، تەنها ڕۆڵە چاكەكانی فەلسەفە لە دەرگای فەلسەفە بدەن، نەك خاوەن دەروونە نزم و لاوازەكان[2]."

ئەو گلەیییەی كە ئەفلاتون دوو هەزار و دوو سەد ساڵ زیاتر پێش ئێستا لەبارەی ڕەوشی فەلسەفە كردوویەتی، لە كاتێكدا بووە كە ڕەوتی فەلسەفە و لۆژیك و ڕۆشنگەری لە ترۆپكی گەشەسەندن و بەرزیدا بووە، دەشێ ئەگەر دەرفەتی هەبووایە تا ئەم سەردەمەی ئێستا لە ژیاندا بێت، لەبری ئەوەی بڵێت كەسی نەشیاو خەریكی هزر و فەلسەفەن، بیگوتبایە تەنها كاڵفام و كەودەن و گەمژەكان ئالوودەی فەلسەفەن و ڕێبەرایەتیی تەوژمی عەقڵانیەت دەكەن، چونكە بەشێك لەوانەی ئەمڕۆ قسە لە بواری عەقڵانیەت دەكەن و خۆیان كردووەتە سەرمەشقی ڕەوتی ڕۆشنگەری، نەك تەنها مایەی لەكەداركردنی عەقڵ و فەلسەفەن، بەڵكو بوونەتە خاڵی وەرچەرخان لای نەیارانی تەوژمی عەقڵانیەت و وەك نموونەیەكی سووك و پێكەنیناوی سەیریان دەكەن و پڕ بە دەمیان هاوار دەكەن و دەڵێن: ئەگەر فەیلەسووف و بیرمەندەكانتان ئەمانە بن، ئەی دەبێ گەمژە و نەزانەكانتان چۆن بن!

---

(١) بڕوانە: الجمهورية: ئەفلاتون: (٢٦٩).

(٢) الجمهورية: ئەفلاتون: (٣٥٤).

فەلسەفە لە هەموو ڕەهەندەکانیەوە شاکارێکی مەزنی مرۆڤایەتییە، تەنها کەسە لێهاتووەکان دەتوانن قسەی تیادا بکەن، هەڵبەتە قسەکردنیش لە پرس و بابەتە فەلسەڤی و لۆژیکییەکان کاتێکی باشی پێویستە، واتە مرۆڤ ناتوانێت لە ماوەیەکی زەمەنیی کورتدا وەڵامی پرسیارە فەلسەفیەکان بداتەوە. فەلسەفە خۆیشی زانستێکی هێندە ساکار و سادە نییە، مرۆڤ بەئاسانی بتوانێت قسەی خۆی تێدا بکات، بەڵکو پێویستی بە خوێندنەوە و نووسین و شەونخوونیی زۆر هەیە.

دەڵێن یەکێك لە پیاوانی کڵێسا داوای لێ کرا ئایینی مەسیحیەت لە یەك ڕستەدا پێناسە بکات، ئەویش لە وەڵامدا گوتی: "أن تحب الخير لجارك كما تحبه لنفسك."

واتە "ئەوەی بۆ خۆت پێت خۆشە لە خێر و چاکە، بۆ دراوسێکەشت پێت خۆش بێت."

پیاوێکی فەرەنسیش هەمان ئەو پرسیارە ئاڕاستەی فەیلەسووفی ناوداری ئەڵمانی (هیگڵ) دەکات، بەڵام داوای لێ دەکات ئەو لەبری ئایین، فەلسەفە لە یەك ڕستەدا پێناسە بکات.

بەڵام هیگڵ ناتوانێت وەك پیاوە ئایینیەیکە پێناسەی فەلسەفە لە یەك ڕستەدا کورت بکاتەوە، ناچار بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە دە کتێب دەنووسێت، دوای بڵاوکردنەوەی کتێبەکانیش گلەیی دەکرد و دەیگوت: "تەنها یەك کەس توانی لێم تێبگات، تەنانەت ئەو کەسەش نەیتوانی بەباشی لێم تێبگات[1]."

ئەم بۆچوونەی هیگڵ ئەو میتۆدە ڕاستەقینەیە بەرجەستە دەکات کە عەقڵ و فەلسەفە و بزاڤی ڕۆشنگەری هەیانە، میتۆدێك کە هاوشانی میتۆدی ئایین پێمان دەڵێت: ئەو پرسانەی پەیوەستن بە عەقڵ و لۆژیکەوە، جۆرێك لە هەستیارییان هەیە، مرۆڤ زۆر بەچڕی کاریان لەسەر بکات، ئینجا دەتوانێت چارەیان بکات.

---

(١) بڕوانە: قصة الفلسفة: ول ديورانت: (٢٣١).

له هەمان کاتدا پێمان دەڵێت، بە هیچ جۆرێك قسەکردن لە کایە مەعریفی و فەلسەفییەکان کارێکی سادە و سانا نییە، بەڵکو پێویستی بە ئەزموون و پشوودرێژی هەیە و لەغیابی ئەم میتۆدەدا فەلسەفە و ڕەوتی عەقڵانیەت دووچاری شکست و ڕەخنە و لەکەدار بوون دەبنەوە.

بەداخەوە، بەشێك لە کارەکتەرە فەلسەفی و هزرییەکانی کۆمەڵگەی ئێمە هەندێك کار ئەنجام دەدەن، کە تەواو پێچەوانەی ئەم میتۆدە سروشتی و مەعریفییەی فەلسەفەیە، بەم کارەشیان سیمای فەلسەفە و بیرمەندە ڕاستەقینەکانیان شێواندووە، کە ئێمە لە پەیوەست بەم بابەتە بەکورتی چەند خاڵێك باس دەکەین.

## ١- فەلسەفە و خۆ پێوە خەریککردن

کارەکتەری فەلسەفی کەسێکی تەواو ئالوودەیە، بە شێوەیەك کە عەقڵانیەت و پابەندبوون بە ڕێگەچارە عەقڵییەکان ئاوێتەی هەموو توخمێکی دەبێت، ئیدی ناتوانێت لە غیابی ئەوەدا ژیان بباتە سەر. سادەتر بڵێین، فەیلەسووفەکان شەرابی عەقڵ و مەعریفە نۆش دەکەن و خوویان بە لۆژیك و کایە فەلسەفییەکان گرتووە.

فەلسەفە لە سەرەتاکانی دەرکەوتنیدا چەمکێکی ڕەها بووە، بە شێوەیەك بەشی هەرە زۆری زانستەکانی ئێستا لەژێر چەتری فەلسەفەدا خۆیان دۆزیوەتەوە، کارەکتەری فەلسەفیش ئەو کاتە توانیویەتی بانگەشەی ڕۆشنگەریی خۆی بکات کە لەناو کۆی زانستەکاندا کوڵابێت تا ئاستی توانەوە، شارەزابوون لە مۆسیقا و پزیشکی و ئەندازیاری و گەردووناسی و ماتماتیك... هتد، مەرجی هەرە سەرەکیی کەسی فەلسەفی و لۆژیکزان بوون.

ئیدی ئەگەر کەسێك لە گشت ئەم زانستانە لێهاتوو نەبووایە، نەیدەتوانی شیکاری بابەتە فەلسەفی و میتافیزیکی و ئەخلاقی و ئەپستمۆلۆژییەکان بکات، دوا جار لە غیابی ئەم فەرهەنگی بوونەی کارەکتەرەکان، پێیان وا بوو قسەکردن لە پرسە فەلسەفی و لۆژیکییەکان دەستدرێژیکردنە بۆ سەر شکۆ و پێگەی فەلسەفە.

بەڵام ئەو سیما و دەرکەوتنەی کە بەشێکی زۆری بە ناو ڕۆشنگەراکانی ئەمڕۆ هەیانە، بریتییە لە خۆهەڵواسین بە فەلسەفە و ڕۆشنگەری، نەك هۆگربوون و ئالوودەبوونیان. کەسایەتیی بەشێك لە بە ناو بیرمەندەکان بە جۆرێکە، کە لە دیمەنی ئەو کەسە دەچن کە بینینی دیمەنی مەی خۆران سەرنجی ڕاکێشاوە و حەزی چووەتە مەی، بۆیە تەنها پێکێکی مەی خواردووەتەوە تا بزانێت مەسەلە چیە، بەڵام ئەو پێکە نە گەیاندوویەتی بە جیلوەی سەرخۆشی، نە عەقڵ و هۆش و بیری پێ هێشتووە، ئیدی مرۆڤێکی بێعەقڵی وای لێ دەرچووە کە تاکە شت بیزانێت ئەوەیە، بووەتە جێی گاڵتە و سووکایەتیپێکردنی خەڵکی.

لەم سەردەمەدا کەسانێکی زۆر بە ناوی بیرمەند و لۆژیکزان لەژێر پەردەی عیرفان و عەقڵانیەت دەربارەی ئایین و ڕەوتی عیرفان و تەسەوف و ڕۆشنگەری و پرسە میتافیزیکییەکان قسە دەکەن، کە جگە لە نوکتەی کۆمیدیا و ئەفسووس هیچ سیمایەکی عەقڵانیەتی پێوە دیار نییە و تەنها هەندێك هوتاف و وشەیان لەبەر کردووە کە لە خەڵکی گوێیان لێ بووە بەبێ ئەوەی بزانن مانایان چییە بەکاری دەهێنن و نازناوی بیرمەند و لۆژیکزانیشیان بە خۆوە لکاندووە و بوونەتە مەهزەلەی سەر سەکۆی ڕەوتی ڕۆشنگەری.

**٢- فەلسەفە و نەخوێندنەوە**

بەشێکی فەلسەفە لەسەر خوێندنەوە و بەشێکیشی لەسەر نووسین و بەرجەستەکردن بونیاد نراوە، بۆیە نەبوونی خوێندنەوە یان نەبوونی بەرهەم و نووسین لە ئاست و پێگەی فەیلەسووف و ڕەوتی فەلسەفەگەری کەم دەکاتەوە.

عەقڵانیەت و ڕۆشنگەری لە دەرئەنجامی خوێندنەوەی زۆر دروست دەبێت، دوا جار هەردووکیان نووسین و توێژینەوەی لۆژیکی بەرهەم دەهێنن، عەقڵانیەتێك کە لەسەر بنەمای خوێندنەوە و نووسین و ئەزموونی زۆر نەهاتبێتە بەرهەم، فۆڕمێکی

شەل و سەقەتی دەبێت، ئیدی خاوەنەکەی وەك دەوترێت، هەر تیرێك لە کەندالێك دەدات.

ئەوەی لە بەشێکی بیرمەندان بەدی دەکرێت، هۆگری خوێندنەوە و داهێنان نین، تا ئێستا جگە لە هەڵدانەوەی بابەتە کۆنەکان و جارێکی تر نوژەنکردنەوەیان، نەیانتوانیوە کەلتوور و ڕێچکەیەکی تایبەت بە خۆیان بونیاد بنێن.

ئێستا فەلسەفە و ڕەوتی عەقلانیەت لەبری ئەوەی پردی پەڕینەوەی کۆمەڵگە بن، لە ژینگەیەکی نەزان و کۆڵەوار بۆ ژینگەیەکی ڕۆشنگەر و مۆدێرن، بوونەتە زەمینەیەکی لەبار بۆ بونیادنانی کۆمەڵگەیەکی داڕزاو و دواکەوتوو. لەبری ئەوەی ئامرازی بڵاوکردنەوەی ئازادی و مەعریفە بن، بوونەتە کەرەستەیەك بۆ بەکۆیلەکردن و گەمژاندنی خەڵك و بەلاڕێدابردنیان، هەموو ئەمانەش لەپای ئاشنانەبوونیانە بە کرۆك و ئامانجەکانی عەقڵ و لۆژیك، کە ئەمەشیان دەگەڕێتەوە بۆ پشتکردنیان لە کتێب و خوێندنەوە.

بوون و مانەوەی فەلسەفە و تەوژمی عەقلانیەت، پەیوەستە بە ئاستی خزمەتکردنی ئەو کایە مەعریفییە، هەڵبەتە خزمەتێکی مەعنەوی کە خۆی لە پەرتووك و خوێندنەوەدا دەبینێتەوە. تا بیرمەندان نەگەنە ئاستی عاشقبوون، ناتوانرێت پرۆسەی بونیادنانی شارستانیەتێکی مۆدێرن و باڵا بگاتە ئامانج، هەڵبەتە دیسان عاشقبوونێکی مەعنەوی کە خۆی لە وشە و ئاخافتنەکانی نێو پەرتووك و خوێندنەوەدا بەرجەستە دەکات.

لە ڕاستیدا دۆخێکی مەترسیدار ڕووبەڕوو ڕەوتی عەقلانیەت و پرسی ڕۆشنگەری بووەتەوە بە هەردوو جەمسەرە ئایدۆلۆژی و هزرییەکەوە، کە پشتکردن لە خوێندنەوە و پەرتووك بووەتە دیاردە و نەریتێکی بەرچاو، کە بەردەوامبوونی ئەم دیاردەیە بووەتە مۆتەکەیەك لەبەردەم پێشکەوتن و داهێنان و گۆڕانکاریدا.

بیرمەندان و زانایانی پێشوو بە شێوەیەك هەڵوەدا و شەیدای پەرتووك و خوێندنەوە بوون، کە گەیشتبووە ئاستێك وەك پرۆسەیەکی هاوسەرگیری و خۆشەویستی سەیر بکرێت، ئەوان نەك نەیاندەتوانی هەجری پەرتووك و خوێندنەوە بکەن، بەڵکو ئەم کارەیان بە شووم و شەرمەزای پێناسە دەکرد، تەنانەت هەندێك یان بەم شێوەیە وەڵامی ئەو کەسانەیان داوەتەوە کە داوایان لێ کردوون بە شێوەی خواستن بۆ ماوەیەك پەرتووکەکانیان پێ بدەن:

**ألاَ يا مستعير الكتب دعني فـإنّ إعـارتي للكتب عـار**

**فمحبوبي مـن الدنيا كـتابي فهل أبصرت محبوباً يعار**

واتە:"ئەی ئەو کەسەی داوام لێ دەکەی بە شێوەی خواستن پەرتووکەکەمت بدەمێ، وازم لێ بێنە، چونکە بەڕاستی ئەگەر من بە شێوەی خواستن پەرتووکەکەی خۆمت بدەمێ، شووم و شەرمەزارییە، چونکە لە دونیادا پەرتووك خۆشەویستی منە، ئایا بینیوتە کەسێك خۆشەویستەکەی خۆی بە شێوەی خواستن بداتە کەسێکی تر؟"

ئەم حاڵەتەی عاشقبوونی پەرتووك و خوێندنەوە پێشینانی گەیاندە ترۆپکی زانست و عەقڵانیەت، هەر بۆیەش توانییان زۆرترین کاریگەری لەسەر ژینگەی خۆیان و نەوەکانی دوای خۆیان جێ بهێڵن و نووسراو و پەیڤەکانیشیان بوونەتە شاکارێکی مرۆڤایەتی کە تا ئێستا لێکدانەوە و ڕاڤەیان بۆ دەکرێت، ئەمە وێڕای ئەوەی پێگەی عەقڵ و مەعریفەیان بە شێوەیەك بەرز و باڵا کردبوو کە هەموو تاکێك خۆزگەی دەخواست بچێتە نێو جیهانی عەقڵ و فەلسەفەوە، جا ئەگەر نەوەی ئەمڕۆش بیەوێت ئەو مێژووەی ئەوان بنووسێتەوە، دەبێت جارێکی تر هەمان ئەو کارە دووبارە بکاتەوە کە ئەوان ئەنجامیان دەدا، کە بریتییە لە عاشقبوونی کتێب و خوێندنەوە.

### ٣- فەلسەفە و هەڵەشەیی

جەوهەری فەلسەفە لەسەر بنەمای عەقڵ و لۆژیك هاتووەتە کایەوە، بۆیە نالۆژیکیترین کار کە کارەکتەری عەقڵانی یان فەلسەفی ئەنجامی بدات، بریتییە لە قسەکردن لەسەر بابەتێك کە پسپۆڕیی ئەو نەبێت، یان زانیاری و مەعریفەیەکی تەواو و گونجاوی لەبارەوە نەبێت.

ئەمڕۆ نەریتێکی تری نالۆژیکی بەرۆکی ڕەوتی عەقڵانیەتی گرتووە، کە ئەویش هاوشانی نەخوێندنەوە بووەتە لەکەیەکی ناشیرین بە جەستەی عەقڵانیەتەوە، کە بریتییە لە (هەڵەشەیی)ی بیرمەند، کە خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کارەکتەرەکانی بواری عەقڵانیەت خۆیان دەخزێننە نێو هەموو پرس و بابەتە جیاوازەکان.

بێگومان لێکدانەوەی ناتەندروست بۆ چەمکی ڕۆشنگەری و عەقڵانیەت، بووەتە مایەی ئەم لەکە خراپە، چونکە ئەم چەمکانە بە شێوەیەك خراونەتە ڕوو کە گوایە دەبێ کارەکتەرەکانی بواری مۆدێرنێتە و عەقڵانیەت توانای ڕاڤەکردنی تەواوی لایەنەکانی ژیانیان هەبێت و هەموو پرسێك لەبار بێت بۆ کەسی عەقڵانی بۆ ئەوەی بۆچوونی خۆی تیادا بخاتە ڕوو.

بەدڵنیاییەوە ئەم جۆرە لێکدانەوەیە ئەو کاتە ڕاستە کە کارەکتەرەکانی بواری فەلسەفە کەسی بلیمەت و لێهاتوو بن، کە لە دەرئەنجامی ئاشنابوونیان بە پرس و بابەتەکان بتوانن قسەی خۆیان بخەنە ڕوو، بەڵام کاتێك کەسی مۆدێرنێتە و بابای فەلسەفەکار ناتوانێت کەسایەتییەکی فەرهەنگیی مەعریفی بۆ خۆی دروست بکات کە لە دەرئەنجامی خوێندنەوە و نووسیندا پەیدا دەبێت، بە هیچ شێوەیەك بۆی نییە ڕاڤەی ئەو ئاریشە و پرسانە بکات کە تیایاندا مەعریفەیەکی تەواوی بۆ دروست نەبووە، چونکە عەقڵ پێمان دەبێژێت تەنها لەسەر بنەمای مەعریفە و زانست مرۆڤ دەتوانێت ڕاوبۆچوونەکانی خۆی دەربڕێت.

کارەکتەری عەقڵانی مەرج نییە بتوانێت ڕاڤە و لێکدانەوەی هەموو پرسێك بکات بۆ ئەوەی نازناوی عەقڵانیبوونی پێ ببەخشرێت، بەڵام هەموو ئەو ڕاڤە و لێکدانەوانەی دەیانخاتە ڕوو، پێویستە لەسەر بنەمای مەعریفە و لۆژیك بێت، ئینجا بۆچوونەکانی وەك کەسێکی بیرمەند لێ وەردەگیرێن.

بەڵام کاتێك ئەم یاسایە پێچەوانە دەبێتەوە و توانای مرۆڤ بۆ قسەکردن لەسەر هەموو کایە جیاوازەکانی نێو کۆمەڵگە دەبێتە شووناسی کارەکتەری عەقڵانی و هەموو لێکدانەوە و شیکارییەکانیشی لەسەر بنەمای عەقڵ و مەعریفە نابنە مەرجی ڕاستەقینەی ڕۆشنگەربوونی، ئەوکات ڕەوشی ڕۆشنگەری دەبێتە مەهزەلەیەکی گشتیی مرۆڤایەتی و بەها و پێگەی عەقڵ و مەعریفە لەکەدار دەبێت و توانای کۆنترۆڵکردن و سەرکردایەتیکردنی کۆمەڵگە لەدەست دەدات.

گەورەزانای ئیسلام (ئەبو حامیدی غەزالی)، کاتێك دەیەوێت ڕەخنە و بۆچوونەکانی خۆی ڕووبەڕووی ڕەوتی فەلسەفە و کارەکتەرە فەلسەفییەکان بکاتەوە، درك بەوە دەکات کە پێویستە وەڵامدانەوەکانی لەسەر بنەمای مەعریفە و زانین بێت، ئینجا دەتوانێت بەرەیەکی دژەفەلسەفی بونیاد بنێت و ڕاوبۆچوونەکانی بەهەند وەربگیرێن.

بۆ ئەو مەبەستەش، سەرەتا خۆی ئاشنای زانستی فەلسەفە دەکات تا بتوانێت تێیدا کارامە بێت، ئینجا ڕەخنەی لێ بگرێت، ئەوەتا دەفەرموێت: "پاشان دوای فێربوونی زانستی کەلام، دەستم کرد بە فێربوونی فەلسەفە، بە دڵنیاییەوە زانیم کە مرۆڤ ناتوانێت ئاشنای خراپە و کەموکووڕیی زانستێك لە زانستەکان بێت، ئەگەر ئاشنای تەواو و ئەوپەڕی ئەو زانستە نەبێت و ئاستی وەك زاناترین کەسی خودی ئەو زانستەی لێ نەیێت، پاشان زیاتریشی نەکات لەسەری و پلەی لەو بەرزتر نەبێت و ئاشنای هەندێك شت نەبێت کە خاوەنی ئەو زانستە نەیزانیبێت و پەی پێ

نەبردبێت، ئەوكات دەكرێت ئەوەی كە بانگەشەی دەكات لە خراپە و كەموكوڕیی ئەو زانستە ڕاست و باوەڕپێكراو بێت[١]."

ئینجا دوای ئەمە، ڕاستەوخۆ هێرش ناكاتە سەر فەلسەفە و كارەكتەرەكانی، بەڵكو دێت مەبەست و ئامانجەكانی فەلسەفە و فەیلەسووفەكان ڕوون دەكاتەوە لە دووتوێی كتێبێكدا بە ناوی (مەبەستەكانی فەیلەسووفان/مقاصد الفلاسفة). ئەبو حامید لە دەستپێكی ئەو كتێبەیدا دەڵێت: "فإنّ الوقوف على فساد المذاهب قبل الإحاطة بمداركها محال، بل هو رمي في العماية والضلال[٢]." واتە: "زانینی هەڵە و ناڕەواییی هەر ڕێباز و ڕەوتێك بەر لە ئاشنابوون بە كرۆك و ناواخنەكەی مەحاڵە، بەڵكو تیر هاویشتنە بەكوێرانە و گوللە بە تاریكییەوە نانە."

ئینجا دوای پۆلێنكردنی بابەتەكانی فەلسەفە و ڕوونكردنەوەی خواست و ئامانجەكانیان، كتێبێك تایبەت دەكات بە ڕەخنەلێگرتنیان و بەهەڵەدانانی بۆچوونەكانیان بە ناونیشانی: (پووچەڵگەرییی فەیلەسوفان/ تهافت الفلاسفة).

بێگومان ئەم فۆڕمەی ڕەخنەگرتن و قسەكردنە لەسەر بابەتەكان كە ئەبو حامیدی غەزالی هێنایە كایەوە، پێویستە ببێتە فۆڕمی ڕاستەقینەی عەقڵانییەكان و ڕەوتی عەقڵانیەت، بە شێوەیەك دەستپێكی ڕەخنەگرتن و لێكدانەوەیان بۆ هەر بابەتێك لەسەر بنەمای ئاشنابوون و شارەزابوون بێت لەو بابەتە، بەڵام ئەوەی ئەمڕۆ هەستی پێ دەكرێت و دەبینرێت، تەواو پێچەوانەی ئەو فۆڕمەیە.

لە كۆمەڵگەی ئێمەدا دوو كایە هەن قسە تێدا كردن و شیكاری كردنیان كراوەتە مەرج بۆ ئەوەی كەسێك عەقڵانیبوونی خۆی بسەلمێنێت، ئەوانیش كایەی ئایین و كایەی ڕامیارین، كە لە ڕاستیدا بە هیچ شێوەیەك ئەم بەمەرجدانانە لۆژیكی نییە.

---

(١) المنقذ من الضلال: غەزالی: (٤١).

(٢) مقاصد الفلاسفة: غەزالی: (١٠).

کایەی سیاسەت بەر لە هەر شتێك پێویستی بە ئەزموونە، کایەی ئایینیش بەر لە هەر شتێك پێویستی بە هەبوونی پسپۆڕییە، پەیداکردنی ئەزموون و پسپۆڕییش دوو بنەمان کە تەنها دوای هەوڵدانێکی زۆر و زەمەنێکی درێژ ئینجا مرۆڤ دەتوانێت بەدەستیان بهێنێت، بەشێکی بەرچاوی کارەکتەرە عەقڵانی و ئایینیەکانیش خاوەنی ئەزموون و پسپۆڕی نین، بۆیە ڕاڤە و لێکدانەوە سیاسی و ئایینییەکانیان ڕێڕەوێکی هەڵەیان وەرگرتووە و دید و تێڕوانینێکی نەرێنیی لای تاکەکانی کۆمەڵگە دروست کردووە.

بۆ ئەوەی ئەم دید و تێڕوانینە نەرێنییەش بسڕینەوە، پێویستە ڕۆشنگەرەکان فێری ئەوە بکرێن و بزانن کە سیاسەت و ئایین پێویستیان بە ئەزموون و پسپۆڕی هەیە، ئینجا یان دەبێت خۆیان لەم دوو کایە بەدوور بگرن بۆ ئەوەی نەبنە مایەی ڕووشاندنی سیمای عەقڵ و فەلسەفە، یان دەبێ ڕاڤە و لێکدانەوەکانیان دوای گەیشتن بە پسپۆڕی و پەیداکردنی ئەزموونێکی باش بێت، بەپێچەوانەوە ڕاڤە و بۆچوونەکانیان دەبێتە هۆکاری هێنانەکایەی شتی سەیروسەمەرە کە نە ئایین نە عەقڵ پەسەندی ناکەن. ئیبنو حەجەری عەسقەلانیش جوانی فەرمووە: "إذا تكلم المرء في غير فنه أتى بالعجائب[1]." واتە: "ئەگەر مرۆڤ قسەی لە بابەتێکدا کرد کە هونەر و پسپۆڕیی خۆی نەبوو، شتی سەیروسەمەرە دێنێتە کایەوە."

### ٤- فەلسەفە و فرەیی

وەك چۆن نەبوونی پێوەرێکی دیاریکراو لە هزری ئایینیدا ڕەوتی ئایینی خستووەتە گێژەڵووکەیەکی مەترسیدار، بە هەمان شێوە فەلسەفە و عەقڵانیەت دووچاری ئەم دەردە کوشندەیە هاتوونە و خەریکە بە هۆیەوە تووشی لەناوچوون دەبنەوە.

---

(١) فتح الباري شرح صحيح البخاري: ابن حجر العسقلاني: (٣/٥٨٤).

دەردی عەقڵانیەت مەترسیدارترە بە بەراورد لەگەڵ دەردی ئایین، چونکە کارەکتەرە ئایینییەکان کەم تا زۆر هەستێکیان هەیە کە بەرامبەر خوای باڵادەست بەرپرسیارن، بۆیە تا ڕادەیەك لەهەمبەر هەندێك پرس و بابەتدا سنوورێك بۆ لێکدانەوە و ڕاوبۆچوونەکانیان دادەنێن و هەڵوەستەیەك دەکەن، یان لە ترسی وروژاندنی هەستوسۆزی بڕواداران ناتوانن هەموو شتێك بدرکێنن، بەڵام هەرچی کایەی عەقڵانیەتە ئەم دوو پاڵنەرەی تێدا نییە کە کارەکتەرەکانی بوەستێنێت، بە جۆرێك کارەکتەری مۆدێرنێتە هەست بە هیچ هێز و دەسەڵاتێك ناکات کە لەبەردەمیدا بەرپرسیار بێت و لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکات، تەنانەت بەپێچەوانەوە هەست بەوە دەکات کە ئەم هەڵەشەییەی لە بواری هزر و مەعریفەدا خواست و ئامانجەکەنی فەلسەفە و لۆژیك دێنێتە دی، بۆیە هەوڵ دەدات لێکدانەوەکانی خۆی لەهەمبەر هەموو بابەتێکدا بخاتە ڕوو، هەروەها ترسی وروژاندن و ڕووبەڕووبوونەوەی شەقامیشی نییە، چونکە هەموو بیرۆکەکانی وەك بیرۆکەی مرۆڤایەتیی تایبەت دەخاتە ڕوو.

ژمارەی کەسایەتییە بە ناو عەقڵانییەکان بە ڕێژەیەك زیادی کردووە، کە لەنێو ڕەوتی ڕۆشنگەریدا بۆتە جێگەی دەمەتەقێ و مژارێکی گەرم، تەنانەت بەشێکیان گلەییی ئەوە دەکەن کە ناونانی هەموو ئەوانە بە ڕۆشنبیر، تەوژم و کایەی ڕۆشنگەری و عەقڵانیەت دەخاتە ژێر گومان و دووچاری ڕەخنەی لۆژیکی و کەلتووری و مەعریفی بەهێزی دەکاتەوە.

ئەگەرچی سنوورەکانی عەقڵ و فەلسەفەی مرۆڤایەتی بێکۆتان و بوونی هەر جۆرە لەمپەرێك لەبەردەم لۆژیك و عەقڵی مرۆڤایەتیدا، بڕینی ئازادییەکانی مرۆڤە و بە خراپ بەسەر بونیادی کۆمەڵگەدا دەشکێتەوە، بەڵام پێویستە پێوەرێکی زانستی و یاسایی بدۆزرێتەوە بۆ ئەو کەسانەی کە بە ناوی ڕۆشنگەری دەدوێن و نازناوی عەقڵانیەت بە خۆیان و بۆچوونەکانیانەوە دەلکێنن.

بێگومان دانانی ئەم پێوەرەش بە مانای بەرتەسککردنەوەی مەودای عەقڵ و کاری فەلسەڤ و ڕۆشنگەری نایەت، بەڵکو هەوڵێکە بۆ پاراستنی شکۆی مەعریفە و کەمکردنەوە یان سنوردارکردنی ڕێژەی ئەو کەسانەی کە بەساختە و لەپێناو بەرژەوەندیی دارایی و کەسایەتیی خۆیان ئەم نازناوە بۆ خۆیان بەکار دێنن، هەڵبەتە دوا جار ئەم کارە لە قازانجی کۆی پرۆسەی مەعریفە و عەقڵانیەت دەبێت و سیمای ڕاستەقینەی لۆژیك و فەلسەفە جارێکی تر وەك خۆی نیشان دەدرێتەوە، ئەوکات لەبری دواکەوتن و ئاهی فەلسەفە، پێشکەوتن و بەختەوەری دەبێتە بەشی کۆمەڵگە و مرۆڤایەتی.

**٥- فەلسەفە و مکوڕبوون**

دوا شت کە لەم بەشەدا تیشکی بخەینە سەر، بریتییە لە دیاردەی مکوڕبوونی کارەکتەرە عەقڵانییەکان لەسەر بۆچوون و هزری خۆیان تەنانەت ئەگەر لەسەر هەڵەش بن.

بەشێك لە بە ناو ڕۆشنبیرەکانی ئەمڕۆ مرۆڤ زۆر زوو دەتوانێت بیانوەستێنێت و بەڵگەی جەرگبڕیان بۆ بهێنێتەوە، بەڵام کێشە ئەوەیە لە بۆچوون و هزری خۆیان پاشگەز نابنەوە و بە هیچ جۆرێك مرۆڤ ناتوانێت لەم لامليكردنەيان پاشگەزیان بکاتەوە، قسەیەکی جوانیش هەیە دەڵێت: "إثبات الحجّة على الجاهل سهل، ولكن إقراره بها صعب[1]." واتە: "هێنانەوە و سەلماندنی بەڵگە بۆ کەسی نەزان ئاسانە، بەڵام بڕواپێکردن و دانپیانانی قورسە."

هەڵبەتە ئەم خاڵە بۆ فاکتەرە مەعریفی و پاشخانە فیکرییەکەیان دەگەڕێتەوە، بە شێوەیەك دەبینین بەشێك لە بیرمەندەکانی ئێمە لە کاتی دیبەت و دەمەتەقێی نێوانیاندا دابەزین لە بۆچوونی خۆیان بۆ کەسی بەرامبەر بە لاوازی و شکست هەژمار دەکەن، هەم بۆ خۆیان و هەم بۆ ڕەوت و ڕێبازە فیکری و فەلسەفییەکەیان،

---

(١) البصائر والذخائر: أبو حيان: (٨/ ٢٣).

ئەمە لە کاتێکدا ئەو کارەی ئەوان تەواو پێچەوانەی سروشتی عەقڵ و لۆژیکە، چونکە:

**یەکەم:** لە عەقڵ و فەلسەفەدا شتێك نییە بە ناوی نەگۆڕ (ثابت)، بۆیە بەشێکی ئەو بۆچوون و تیۆرە فەلسەفییانەی کە ئێستا وەك هەقیقەت هەژمار دەکرێن، لە سەردەمێکدا بۆچوونی هەڵە و نالۆژیکی بوون، دواتر لە دەرئەنجامی پێشکەوتنی عەقڵی مرۆڤ و ئەرگۆمێنتە لۆژیکی و زانستییەکان بوون بە هەقیقەت، دەشکرێت لە داهاتوودا جارێکی تر بە هەڵە دابنرێن و تیۆری تر شوێنیان بگرێتەوە، بۆیە کاتێك کارەکتەری عەقڵانی لە بۆچوونی خۆی دانابەزێت و لەسەری سوور دەبێت، لە ڕاستیدا سروشتی عەقڵ دەشێوێنێت و کارێکی ناعەقڵانی ئەنجام دەدات.

**دووەم:** کاری عەقڵ و فەلسەفە گەیاندنی مرۆڤە بە هەقیقەت، بۆیە عەقڵ هەر کاتێك گەیشتە هەقیقەت و ڕاستی ئەوا ملکەچبوونی خۆی نیشان دەدات و ئەو کارەشی بە شکست و دۆڕان هەژمار ناکات، بەڵکو سەرکەوتنی ڕاستەقینە لەوەدا دەبینێتەوە کە هەقی دۆزیوەتەوە و دوای کەوتووە، وەك دەشگوترێت: "معرفة الحقيقة تساوي وجوب الالتزام بها، بل هي عين الوجوب[1]." واتە: "زانینی هەقیقەت یەکسانە بە پێویستبوونی پابەندبوون پێیەوە، بەڵکو هەر خۆی خودی پێویستییەکەیە."

بەڵام ئەو سیما ناشیرینەی کە بەشێك لە ڕۆشنگەراکان نیشانی دەدەن، بریتییە لەوەی کە هەریەکەیان لەسەر تەپۆڵکەیەك وەستاوە و ئامادە نییە بێتە خوارەوە، هەموویان خۆیان بە ڕاستەقینە و ڕەوا هەژمار دەکەن و تەنازولکردن بۆ ڕاوبۆچوونی بەرامبەر بە دۆڕان و شکست دادەنێن، ئەمەش وای کردووە تاکەکانی کۆمەڵگە تووشی سەراسیمەیی ببن و لەم ڕەوتە ڕۆشنگەرانە بپرسن: ئەرێ برادەرینە، کامەتان خاوەن عەقڵ و فەلسەفەی ڕاستەقینەن؟

---

(١) المعاد الجسماني إنسان ما بعد الموت: شفيق جرادي: (٥٠).

# بەشی یانزەم
# ئایین و جەهالەت

بڕواداران بە دوو شێوە بوونەتە مایەی ستەمکردن لە ئایین:

**یەکەم:** کاتێك جێبەجێکردنیان بۆ دەق و تێکست و بەها و پرەنسیپەکانی ئایین، جێبەجێکردنێکی هەڵەیە و بەو شێوازە نییە کە ئایین فەرمانیان پێ دەکات.

**دووەم:** کاتێك نەیانتوانیوە ئایینەکەیان لەسەر بنەمای ئەو میتۆد و پرەنسیپانە بڵاو بکەنەوە کە ئایین بۆی دەستنیشان کردوون.

ئەم دوو خاڵە فاکتەری ستەمکردنی موسڵمانەکانە لە ئایینی ئیسلام، چونکە خراپ مومارەسەکردنەکەیان ئایینی ڕووبەڕووی چەندین تۆمەت کردووەتەوە، بێتواناییشیان لە بەرامبەر بڵاوکردنەوەی ئایین، وای کردووە خەڵکێکی زۆر بەنەزانی بمێننەوە و هیچ دەربارەی ئایینی ئیسلام نەزانن[1].

هەم خراپ جێبەجێکردنی ئایین، هەم خراپ بانگەشەکردن بۆ ئایین، پەیوەندییان بە پاشخان و باگراوەندی مەعریفی و فەلسەفی و ڕۆشنگەریی تاکەکانەوە هەیە، جەهل و نەزانی وا لە مرۆڤ دەکەن کە مومارەسەکردنی بۆ پایە و بنەماکانی ئایین و بانگەشەکردنی بۆ ڕاستی و ڕەوایەتیی ئایینەکەی فۆڕم و ئاڕاستەیەکی هەڵە وەربگرن.

دواتر هەر جەهل و نەزانی پاساوێکن بۆ نەیارانی ئایین تا لە ڕێگەیەوە تانە و ڕەخنە ئاڕاستەی ئایین بکەن، لانی کەم جەهالەت و نەفامی فاکتەرێکی نێگەتیڤن بۆ گەشەسەندن و بڵاوبوونەوەی ئایین.

## میتۆدی ئایین

ئایین لە بنەڕەتدا میتۆدێکی مەعریفی و ئەپستمۆلۆژیی هەیە، لە ئاییندا پێگەی مەعریفە لەپێش پێگەی باوەڕو ئیمانە، لانی کەم پرۆسەی زانین پێش کردار کەوتووە، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە پێویستە بوونی مرۆڤ لەسەر بنەمای میتۆدێکی مەعریفی و زانستی ئینجا ئایینی و ئیمانی بونیاد بنرێت، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾[2].

واتە: "بزانە کە هیچ خودایەك نییە شایەنی پەرستش بێت، جگە لە الله."

---

(١) بڕوانە: المحاور الخمسة للقرآن الكريم: محمد غەزالی: (٥٨).

(٢) سوورەتی (محمد)، ئایەتی: (١٩).

ئەم میتۆدە مەعریفییەی ئایین دەشێت ئاماژەی ئەوە بێت کە هەر ئایدۆلۆژیا و بیروباوەڕێك لەسەر بنەمای عەقڵ و لۆژیك و زانست نەبێت، لەلای خوداوەندی گەورە بەها و ئەرزشی نەبێت، یان بنەمایەك بێت بۆ ئەوەی کە پێویستە قسەکردن دەربارەی ئایین و خودا و پرسە هزری و میتافیزیکییەکان لەژێر ڕۆشنایی عەقڵ و زانستدا بێت، دەشگونجێت مەبەست لێی فێرکاری و ڕێنموونیکردنی زانایانی ئایینی بێت بەتایبەت، تاکو بناغەی بڕوا و ئیمانی ئەوان لەسەر مەعریفە و زانست بەرپا بێت، بەپێچەوانەی بڕوای خەڵکی سادە و عەوام کە زیاتر بڕوا و ئیمانەکەیان عادەتی و تەقلیدییە.

ئایین فۆڕمێکی مەعریفیی بەردەوام و ڕەها و بێسنووری هەیە، بەو مانایەی کە پرۆسەی مەعریفە و عەقڵانیەت لە دیدی ئاییندا لە شوێنێکی دیاریکراودا ناوەستێت، بەڵکو بەردەوام لە گەشەسەندن و بەرزبوونەوەدایە، هەر بۆیە خوای باڵادەست فەرمان بە پەیامبەر ﷺ دەکات کە داوای زانستی زیاتری لێ بکات، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمٗا ﴾[1]. واتە :"بڵێ، ئەی پەروەردگارا، زانستم زێدەتر بکەی." هەروەها ئایین فۆڕمێکی مەعریفیی ڕێژەیی و نادیاریکراوی هەیە، بەو مانایەی کە لۆژیك و زانست و زانیاری لەسەر کەسێکی دیاریکراو یان لە جۆرێکی دیاریکراوی زانستدا چڕ ناکرێنەوە و قەتیس نابن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَفَوۡقَ كُلِّ ذِي عِلۡمٍ عَلِيمٞ ﴾[2]. واتە: "لەسەرووی هەموو خاوەن زانستێك، کەسێکی زاناتر هەیە."

ئەو میتۆدە مەعریفییەی کە ئایین بەرجەستەی کردووە، لە ڕاستیدا زێتر پەیوەندیی بە زانایان و میراتگرانی پێغەمبەرەوە ﷺ هەیە، ئەگینا پێغەمبەر ﷺ خۆی لەژێر سایەی وەحیدا گەورە بووە و هەنگاوەکانی ژیانی سەرتاپای لەژێر

(١) سوورەتی (طه)، ئایەتی: (١١٩).

(٢) سوورەتی (یوسف)، ئایەتی: (٧٦).

چاودێریی خودا و هەڵقوڵاوی مەعریفەی وەحی  خودایی بووە و زۆرینەی کردەوەکانی لە مەقامی نبوەتدا بەرجەستە کردوون، خۆ ئەگەر دەربارەی هەر شتێك زانیاری نەبووایە، ئەوا هەر زوو فریشتەکان زانیارییان بۆ دەهێنا و فێریان دەکرد.

بۆیە میتۆدی ئایین زێتر بۆ فێرکردن و ڕاهێنانی شوێنکەوتووەکانی بوو، میتۆدێك کە فێریان دەکات هەمیشە لەدوای زانستەوە بن، فێریان دەکات چۆن جەستە هەڵوەدای خۆراك و خواردنەوەیە، ڕۆح و دەروونیش شەیدای زانست و مەعریفەیە، فێریان دەکات ئەگەر جەستەتان بە خواردن گەورە دەکەن، ئەوا عەقڵتان بە مەعریفە گەشە پێ بدەن.

ئەم میتۆدە مەعریفییەی ئایینیش پاڵنەرێکی بەهێز بوو، تاکو دەق و تێکستەکانی قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەری ئیسلام (موحەممەد ﷺ) بنەمایەکی تر دابڕێژن، کە تیایدا بەرگی تەوازوع و سادەیی و بێفیزی بکەنە بەر گیانی ڕێبەران و پێشەوایانی ئوممەت. بنەمایەك کە فێریان بکات هەموو شتێك لەسەر بنەمای زانین و عەقڵ و فەلسەفە مومارەسە دەکرێت، ئایین، خودا، پەرستشەکان... هتد، هەموو ئەمانە پێویستە بزانرێن و بناسرێن، ئینجا ڕاڤە و دیالۆگیان لەهەمبەردا ئەنجام بدرێت.

خۆ ئەگەر ڕێبەران و زانایانی ئوممەت لە ئاست پرسێکدا بەچۆکدا هاتن و پەییان پێی نەبرد، ناشێ بۆیان بە بەرگی جەهالەت و نەزانیی خۆیانی تێ بخزێنن و قسەی تێدا بکەن. قورئانی پیرۆز دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ﴾[1].

واتە: "ئەی ئینسان، لە شتێك مەدوێ و شوێنی شتێك مەکەوە، کە زانست و زانیاریت دەربارەی نییە."

---

(١) سوورەتی (الإسراء)، ئایەتی: (٣٦).

که زانایانیش پاشخان و توراس و زانستی پێغەمبەران (درودی خوایان لەسەر بێت) میراتیانە، پێویست بوو پێغەمبەری ئیسلام ﷺ فەرمایشت و ڕێنماییی تایبەتی بۆ زانایان هەبێت، هەر بۆیە بە دەمی ئاڵی، ئاخافتنێکی زێڕینانە پێشکەش بە هۆگرانی خۆی دەکات و پێیان دەفەرموێت: نەکەن لە خۆتانەوە بە ناوی من و خوداوە بدوێن، نەکەن لە ئاییندا شتێك بورووژێنن بێ ئەوەی زانیاریتان هەبێت کە من چیم گوتووە، ئەگەر نا شوێنتان دۆزەخ دەبێت. ئەم زاتە فەرمووی: "من كذب علي متعمدا فليتبوَّ مقعده من النار[(١)]."

واتە: "هەر کەسێك بەئەنقەست درۆ بەسەر مندا هەڵبەستێت، با شوێنی خۆی لە دۆزەخدا ئامادە بکات."

خۆ ئەگەر زانایان و پێشڕەوانی ئایین بە ناوی خودا پێچەوانەی ئەو میتۆد و فۆڕمە مەعریفییە قسەیان کرد کە ئایین بۆی دیاری کردوون، ئەوا دوور نییە بکەونە بەر خەشم و قینی خودا، چونکە کارێك ئەنجام دەدەن کە پێچەوانەی یاسا و ڕێساکانی ئایینە، کارێك کە خوداوەند یاساغی کردووە مرۆڤە باوەڕدارەکان ئەنجامی بدەن. بەکورتی بونیادی تیۆری زانستخوازی و میتۆدی ڕۆشنگەریی ئایینی لە دیدی ئاییندا، بەم شێوەی خوارەوەیە:

١- پێویستە هەموو شتێك لەسەر بنەمای زانست و عەقڵ و مەعریفە بێت بە ئایینیشەوە.

٢- پێویستە هەمیشە مرۆڤی باوەڕدار هەڵوەدای زانست بێت و مەودای مەعریفە سنوردار نەکات.

٣- ناشێت تاکی ئاییندار لە کارێکدا بەشدار بێت، کە لەسەر بنەمای زانین و مەعریفەی ئایینی یان عەقڵانی مومارەسە نەکرێت.

---

(١) ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە, بە ژمارە: (١٢٩١).

٤- لەبارەی ئایینەوە ناشێت هیچ کات قسە و گفتوگۆ بکرێت، مەگەر بنەمای زانیاری و عەقڵ و فەلسەفە پێوەری دیبەت و دیالۆگەکان بێت.

٥- جووڵانەوە و هەڵسوکەوتکردن بەپێچەوانەی پرەنسیپەکانی ئەم میتۆدە، تاکی ئاییندار دووچاری ڕەخنەی ئایینی لە دونیا و سزای دۆزەخ لە دواڕۆژدا دەکاتەوە.

قسەکردن دەربارەی ئایین کە تەنها کاری زانایان و بانگخوازان و پسپۆڕانی ئەم بوارەیە، لە بنەڕەتدا خستنەڕووی بڕیاری پەروەردگارە بۆ مرۆڤایەتی نەك بڕیاردان لەجیاتی خوا، بۆیە خستنەڕووی بڕیاری پەروەردگار، کارێکی ئێجگار مەترسیدارە و ئاتاجی هەوڵ و کۆششێکی مەعریفی و لۆژیکیی گەورەیە.

ئایین کایەیەکی مەعریفی و زانستییە، ئەوانەشی کە دەچنە ناوی، پێویستە پابەندی ئەم کایە مەعریفیە بن، ئەگەر نا پیادەکردنی ئایین بەپێچەوانەی بونیادە مەعریفییەکانی خۆی لە ڕاستیدا کوشتنی ئایینە، قسەکردن لەبارەی جوانییەکانی ئایین بەبێ زانست لە بنەڕەتدا نیشاندانی ئایینە بە سیمایەکی خراپ، خستنەڕووی لێبوردەییی ئایین بێ عەقڵ و فەلسەفە و مەعریفە، سەر دەکێشێت بۆ دەمارگیری، هەر لێکدانەوەیەکی لۆژیکی و زانستی و فەلسەفی بۆ دەق و تێکستە ئایینییەکان بەبێ بوونی زانیاریی تەواو، لە ڕاستیدا ئایین وەك میسۆلۆژیا و جەهالەت نمایش دەکات، دوا جار ئەم هۆکارانە دەبنە مایەی پووکانەوەی ئایین، پووکانەوەی ئایینش ڕووخاندنی نیوەی قەوارە و بوونی مرۆڤە، چونکە بوونی مرۆڤ نیوەی لەژێر هەژموونی ئایین و نیوەکەی تری لەژێر هەژموونی عەقڵدا ئاڕاستە دەکرێت.

تەنانەت ئایینی ئیسلام لە ڕێگەی گرنگیدان بە عەقڵ و فەلسەفەوە، وای کردووە کە ئەم هاوکێشەیە بگۆڕدرێت و لە ئەگەری کپکردنی ئاییندا تەواوی وجودی مرۆڤ دەکەوێتە مەترسییەوە، بە چەشنێك کە مرۆڤایەتی لە پایەی مرۆڤبوون و قۆناغی جێنشینایەتی، بەرەو پایەی ئاژەڵبوون و قۆناغی کۆیلایەتی هەنگاو دەنێت.

ئەو میتۆدەی کە ئایین بۆ زانایانی ئایینی خستوویەتیە ڕوو، بە جۆرێکە بەرجەستەکردنی کاریگەریی ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر ڕێژەی بڵاوبوونەوەی ئایین و خواستی مرۆڤەکان بۆ قبوڵکردنی ئایین، لەبەرامبەردا پیادەنەکردنی ئەو میتۆدە مەترسییەکی کوشندەیە بۆ سەر خودی ئایینەکە و بۆ سەر ئاستی زیادبوونی ڕێژەی شوێنکەوتووانی ئایین.

## دووبارەبوونەوەی مێژوو

هیچ کات واعیزێکی جاهیل و نەزان نابێتە مایەی ڕازیکردنی نەیارانی ئایین تا ببنە کەسی بڕوادار، هەروەها هیچ کاتێکیش ناتوانێت تینوێتیی ڕۆحی ئەو کەسانە بشکێنێت کە هەمان ئایین و بیروباوەڕیان هەیە، بەپێچەوانەوە بەردەوام دەبێتە مایەی شەرمەزاری بۆ ئایین و دڵەڕاوکێ بۆ تاکە بڕوادارەکان.

بە درێژاییی مێژووی ئایینەکان بە ناو زانایانی ئایینی سەرسەختترین دوژمنی ئایین بوون، بەقەد ئەوەی ئەوان بوونەتە مایەی ڕووخاندنی ئایین و زێتر گومڕاکردن و سەرلێشێواندنی بڕواداران، هێندە نەیاران و دوژمنانی ئایین ئەو ڕۆڵەیان نەبووە.

هۆکاری ڕاستەقینەی ناشیرنکردنی ئایینی مەسیحی هەر ئەو ڕاهیب و قەشە جاهیلانە بوون کە لە ڕێگەی هەڵە ڕاڤەکردنی دەق و بڕگەکانی ئایین بوونە جێی گاڵتەوگەپی خەڵکی و توانج و ڕەخنەی نەیارەکانیان.

ئەوان لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی ئەفسانە و خورافیات ئایینیان کردە گاڵتەجاڕی عەقڵی مرۆڤە ئەنتی ئایینییەکان و بوونە هۆی سەرهەڵدانی تەوژمی سیکۆلاریزم و ڕەوتی ئیلحاد و بێباوەڕی لە ئەورووپادا. ئێستاش بەشێك لەوانەی خۆیان بە ئایینی ئیسلام هەڵپەساردووە و وەك زانا و شارەزای ئایینی خۆیان دەناسێنن، کە لە بنەڕەتدا ئەو میتۆدە مەعریفییەیان تیادا بەرجەستە نەبووە کە ئایین داوای دەکات، گەورەترین هەڕەشە و مەترسین بۆ سەر ئیسلام و موسڵمانان.

بێمەعریفەییی ئەم کاراکتەرانە بە جۆرێك کاریگەریی نەگەتیڤی هەیە کە نەك تەنها خۆیان، بەڵکو خەڵکی تریشیان تووشی گومڕایی و سەرلێشێواوی کردووە، ئەمانە هەمان ئەو گرووپ و تاقمەن کە پەیامبەری ئیسلام ﷺ ئاماژەی بۆ کردوون و بە مایەی بەدبەختیی زۆرێك لە خەڵکی هەژماری کردوون، وەك دەفەرموێت: "إن الله لا يقبض العلم انتزاعاً ينتزعه من صدور العباد، ولكن يقبض العلم بقبض العلماء، حتى إذا لم يُبق عالماً اتخذ الناس رؤساء جهالاً، فسئلوا، فأفتوا بغير علم، فضلوا وأضلوا[١]."

واتە: "خوای گەورە زانست هەڵناگرێت بە هێنانەدەرەوەی و هەڵکێشانی لە سنگ و دەروونی بەندەکانی، بەڵکو زانست ناهێڵێت بە کێشانی گیانی زاناکان، تا وای لێ دێت ئەگەر هیچ زانایەکی نەهێڵا خەڵکی سەرکردەی نەزان دەکەنە ڕێبەری خۆیان، ئەوکات پرسیاریان ئاڕاستە دەکرێت، ئەوانیش بەبێ زانست و زانیاری فەتوایان بۆ دەدەن و خۆیان و خەڵکەکەش تووشی گومڕایی دەکەن."

ئەم بە خراپ نیشاندانەی ئایین هەمان دەردی بە خراپ نیشاندانی عەقڵانیەت و لۆژیکی مرۆڤایەتییە، کە لە دەرئەنجامی کەڵەکەبوونی هەندێك دیاردەی نائاییینی و نالۆژیکی چەکەرەیان کردووە، لەوانە:

**١- پزیشك و بانگخواز**

بانگخوازەکان پزیشکی ڕۆحانیەتن و پزیشکەکانیش تیماری جەستەی مرۆڤایەتی دەکەن، دوو کاری جیاوازن لە ڕواڵەتدا و هاوتان لە ئامانجدا، تاکە جیاوازیی نێوان ئەم دوو کارەکتەرە ئەوەیە: **یەکەمیان** چارەی ڕۆحی مرۆڤی لایە، ئەوەی **دووەمیان** چارەی جەستەی مرۆڤی لایە، بۆیە هەردووکیان ئامانجیان کامڵکردنی مرۆڤە، هەرچەندە لە ڕووی ئایین و لۆژیکەوە، مرۆڤایەتی ڕۆحی زۆر

(١) ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە: (١٠٠). هەروەها ئیمامی موسلیم بە ژمارە: (٢٦٧٣).

بەنرخترە لە جەستە، بەڵام جەستەیەك بێ ڕۆح بێت، زوو بۆگەن دەبێت، ڕۆحێکیش بێ جەستە بێت، توانای خۆسەلماندن و بەرجەستەکردنی نییە.

بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە، ئەگەر مرۆڤێك بیەوێت ببێتە پزیشکی جەستە، پێویستە نزیکەی هەژدە ساڵ بخوێنێت، تا مۆڵەتی نزمترین ئاستی مومارەسەکردنی ئەو کارەی پێ بدرێت، کەچی بانگخواز و بە ناو پسپۆڕی ئایینیی وامان هەیە کە نەك هەژدە ساڵ، تەنانەت هەژدە ڕۆژیش نەیخوێندووە. ئەگەر بمانەوێت ڕەوشی ئایین و بانگخوازییش وەك پیشەیەکی پزیشکی ڕۆحانیەت سەیر بکرێت و پێگە و بەهای ڕاستەقینەی خۆی هەبێت، پێویستە ئەم کارانەی خوارەوە ئەنجام بدەین:

**یەکەم:** هیچ کەسێك بۆی نەبێت خۆی بە زانای ئایینی بناسێنێت، مەگەر دوای دەرچوونی لە پسپۆڕیی تایبەت بەم بوارە.

**دووەم:** هەموو ئەو کەسانە سزا بدرێن کە زۆر بەئاسانی و لەپێناو پارە و پۆستی دونیا، بە شێوەیەکی ساختە ئەو کارەیان کردووەتە پیشەی خۆیان.

**سێیەم:** پێویستە کۆلێژ و کۆڕبەندیی تایبەت بۆ کارەکتەرەکانی ئایین بکرێتەوە و لەلایەن کەسانی پسپۆڕ و شارەزا وانەیان پێشکەش بکرێت.

**چوارەم:** پێویستە بە شێوەیەك ژیانیان دابین بکرێت لەلایەن حکومەتەوە، کە چیتر نەبنە مایەی شەرمەزاری بۆ خۆیان و ئایینەکەیان، لە کاتێك کە ناچارن بە هۆی خراپیی گوزەرانی ژیانیان پەنا بۆ خەڵکی تر ببەن.

**پێنجەم:** وێڕای هەموو ئەمانە، پێویستە پێوەری زانست و لێهاتوویی بکرێتە یاسایەکی بنەڕەتی سەبارەت بە دامەزراندنیان لە پیشەی زانا و بانگخوازیدا.

بێگومان ئەم مەرجانە لێدان نییە لە شکۆ و پایەی ئەو مامۆستا و بانگخوازانەی کە جێگەی شانازیی ئێمەن و لەوپەڕی بەرزیی ئاستی زانستی و ئەخلاقی و مرۆڤایەتیدان، بەڵکو ئەم وتانەی ئێمە ئاڕاستەی ئەو جۆرە تاکانەیە کە بە هۆی نەزانی و لێنەهاتووییەوە بوونەتە خاڵی لاوازی ئایین و زانا ڕاستەقینەکان.

دوا جار پێمان وایە نەبوونی پرەنسیپ و پێوەرێکی دیاریکراو بۆ ئەو کەسانەی بە ناوی ئایین قسە دەکەن، ئایین و زانا ئایینییەکانی خستووەتە ژێر پرسیار، کە پێویستە بە زووترین کات پێوەری ئەکادیمی و مەعریفی دیاری بکرێن و ئایین و زانا ئایینییەکان بخرێنەوە سەر پێگە و ڕێڕەوی شایستەی خۆیان.

## ٢- کتێبکڕ و کتێبخوێن

جوانترین دیمەن کە بەشێك لە کارەکتەرە ئایینییەکانی کۆمەڵگەی ئێمە نیشانی دەدەن، تابلۆی کتێبخانەکانە، کە لەدوورەوە نیشان دەدات ئەوان چەندە ئاوێتەی کتێب و خوێندنەوەن، کەچی بە یەکەم دەربڕینیان بۆت دەردەکەوێت کە ئەم تابلۆیە ساختەیە و تەنها بۆ لەخشتەبردن و جوانکاریی دیمەنی دەرکەوتنی خۆیان دایانناوە. ئێمە لەم خاڵەدا، تەنها دەمانەوێت مەترسیی دیاردەی نەخوێندنەوە لای بەشێك لە کارەکتەرە ئایینییەکان بوروژێنین.

خۆشبەختانە کارەکتەرە ئایینییەکان زۆرترین توێژن کە کڕیاری کتێبن، بەڵام بەداخەوە کەمترین توێژن کە خوێنەری کتێب بن، بێگومان جیاوازیی ئەم دووانەش وەك جیاوازیی ئاسمان و ڕێسمانە. ئەم دیاردەیە بە جۆرێك دوای خستوون کە نەك گومان لە ڕۆشنبیری و عەقڵانیبوونیان دەکرێت، بەڵکو مرۆڤ گومانی لا دروست دەبێت سەبارەت بە خودی بڕوا و عەقیدەکەشیان.

هاوڕێیەکم چیرۆکێکی بۆ گێڕامەوە و گوتی: لە خوێندندا کەسێکم لەگەڵ بوو لە ژیانیدا دەستی بۆ کتێب نەدەبرد، لە بەدبەختیی خۆی ڕۆژێك لێی هەڵە دەبێت و دەست بۆ کتێبخانەی حوجرە درێژ دەکات و پەرتووکێك دەکەوێتە نێو دەستی بە ناوی **(ئایا ڕاستە عیسا عليه السلام کوڕی خوایە؟)**، ئەویش بێ دوودڵی دەیکاتەوە و دەست بە خوێندنەوەی دەکات، هەر زوو دەگاتە ئەو شوێنەی کە دەڵێت: **"**عیسا عليه السلام بێ باوك لەدایك بووە.**"**

کاتێك ئەو ڕستەیە دەخوێنێتەوە، جۆش دادەمێنێت، چونکە پێشتر گوێبیستی ئەو قسەیە نەبوویت! بۆیە خێرا بە هاوڕێکەمی گوتبوو: "فڵان، سەیرە لەم کتێبەدا نووسراوە عیسا ﷺ بێ باوك لەدایك بووە!" هاوڕێکەشم زۆر لێی پەست دەبێت و پێی دەڵێت: "نەوەڵا، ئەوە سەیرە تۆ دەڵێی تازە موسڵمان دەبیت، چۆن نازانی کە عیسا ﷺ بێ باوك لەدایك بووە!"

ئەم دیمەنە زۆر جار دووبارە دەبێتەوە کە زۆرێك لە بە ناو کارەکتەرە ئایینییەکان نەك پسپۆڕ و لێهاتوو نین، تەنانەت سادەترین زانیاریی ئایینیشیان نییە، کەچی جوانترین و نایابترین جلی بانگخوازی دەپۆشن و بەرزترین نازناوی زانستی و مەعریفی بۆ خۆیان دادەتاشن.

ئەم دیمەنە ڕێك ئەو ئاه و حەسرەتەیە کە شێخ عەبدوڵڵای بێتوشی وێنای کردووە، کاتێك دەفەرموێت:

**كفى حزناً أني أموت ببلدة فواضل أهل العلم فيها جواهل**

**جاهلها من كثرة المال فاضل فاضلها من قلة المال جاهل**

**فوا أسفاً إن المدارس قد عطلت لقد هبط الأعلى وقام الأسافل**

واتە: "هێندە دڵتەنگی بەسە کە لە وڵاتێکدا دەمرم، گەورەپیاوانی زانست تیایدا جاهیل و نەزانن، نەزانەکەی لەبەر زۆری پارە و سامان بەڕێز و گەورەیە، بەڕێز و گەورەکەشی لەبەر بێ پارەیی و ماڵ و سامان نەزانە، بە داخ و پەژارەوە قوتابخانەکان لەکار کەوتن، ئەوانەی بەرزن دابەزین و نزمەکانیش سەر کەوتن."

### ٣- ئایین و فەتوا

فەتوا و بڕیاردان بە ناوی ئایینەوە، بۆتە دەردێکی کوشندەی نێو کۆمەڵگە ئیسلامییەکان، بە شێوەیەك فەتوادان بووەتە گاڵتەجاڕی بەشێك لە بە ناو زانایانی ئایینی، کە نەك سەریان لە خۆیان، بەڵکو سەریان لە خەڵکیش شێواندووە.

هەر میدیا و کەناڵێك دەبینی، کەسێکیان هێناوەتە سەر شاشە و بە ناوی شارەزا و پسپۆڕی ئایینی هەرچی پرسیاری مرۆڤایەتی هەیە بەرەوڕووی دەکەنەوە، کاکی موفتیش وەك ئەوەی لەلایەن خوداوە ئیلهامی بۆ هاتبێت، بەبێ ڕاوەستان وەڵامی هەموو پرسیارەکان دەداتەوە، بەبێدوودڵی وشەی نازانم بۆ هیچ پرسیارێك بەکار ناهێنێت.

سەیرە ئەگەر ئێمە ئەم هەموو مرۆڤە لێهاتووانەمان هەن، کە ئامادەیی و توانای وەڵامدانەوەی هەموو پرسیارێکیان هەیە، بۆچی بەم جۆرە دوا کەوتووین؟ ئەگەر ئێمە ئەم هەموو بلیمەت و موفتییە ناودارانەمان هەن، بۆچی تا ئێتستا چوار کەڵەنووسەریان تێدا هەڵنەکەوتوون، کە جێگەی شانازی بن و پەنجەی گەورەییان بۆ درێژ بکەین؟ ئەگەر ئەم هەموو زانا و موفتی و بانگخوازانەمان هەن، وەڵامی ئەو هەموو پرسیارە جیاوازانەیان پێیە، بۆچی تا دێت تەوژمی بێباوەڕی و دژەئایینی لەناو کۆمەڵگەکەماندا لە برەودایە؟

نەبوونی وەڵامێکی لۆژیکی و واقعییانە بۆ ئەم پرسیارانە، ئەوەمان پێ دەڵێت کە زۆرینەی ئەو کارەکتەرانە نەك هەر زانا نین و ئامرازێك نین بۆ وشیارکردنەوەی خەڵکی لە ڕووی ئایینییەوە، بەڵکو هێندە نەزان و هەرزەکارن، کە هەم خۆیان هەم خەڵکیشیان تووشی سەرلێشێواوی کردووە.

نیگەرانیی ئێمە لەوە سەرچاوەی گرتووە کە ئەمانە سنوورێك بۆ وەڵامەکانیان نییە، وەك دەوترێت وشەی (نازانم) لە فەرهەنگی ئەواندا بوونی نییە، لە چرکەیەکدا و بەچاوتروکانێك وەڵامی هەندێك پرسیار دەدەنەوە، کە ئەگەر گرووپێك مامۆستای پسپۆڕ و لێهاتوو بۆ ماوەی یەك ڕۆژی تەواو کاری لەسەر بکەن، ئینجا دەتوانن بگەنە بڕیارێکی یەکلاکەرەوە. ئیمامی (شەعبی) دەربارەی ئەو گرووپانە

لە سەردەمی خۆیدا دەیفەرموو: "إن أحدكم ليفتي في المسألة لو وردت على عمر بن الخطاب رضي الله عنه لجمع لها أهل بدر[1]."

واتە: "یەکێك لە ئێوە فەتوا دەربارەی مەسەلە و بابەتێك دەدات، کە ئەگەر ئاڕاستەی عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ کرابایە، ئەوا هەموو ئەهلی بەدری بۆ –وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەتان– کۆ دەکردەوە."

بەدڵنیاییەوە هەموو ئەم دیاردانە بە جۆرێك مەترسیدارن، کە ئایین و مامۆستایانی ئایینی ڕاستەقینەیان خستووەتە ژێر هەڕەشەی لەناوچوون و لەکەدارکردن، ئەمەش پێویست دەکات کە بە زووترین کات دەنگە ڕەسەن و ڕاستەقینەکان خۆیان بەدەر بخەن و ڕووبەڕوویان بوەستنەوە و گۆڕەپانەکە جێ نەهێڵن بۆ نەزان و فاڵچییەکان کە بە ئارەزووی خۆیان تەراتێن بکەن و بازرگانی بە ئایین و زانا و بانگخوازییەوە بکەن.

---

(١) المجموع شرح المهذب: النووي: (٧٣/١).

# بەشی دوانزەم
# فەلسەفە و ستەم

بەشێکی بیرمەند و ڕۆشنگەراکان، زۆرترین سوودیان لە بەکارهێنانی هزر و فەلسەفە بینیوە بە هۆی بەکارهێنانی لە بەرژەوەندیی دەسەڵاتە ستەمکارەکاندا، کە ئەم کارەشیان زۆرترین لەمپەری خستووەتە بەردەم گەشەسەندنی ڕەوتی عەقڵانیەت و بەپیرەوەنەهاتنی خەڵکی بۆ بانگەوازی بیرمەندان. هزر و فەلسەفەی مرۆڤایەتیی ڕاستەقینە، هەمان ڕێچکە و میتۆدی ئایینی ئیسلامی گرتۆتە بەر –کە لە بەشی داهاتوودا باسی دەکەین– سەبارەت بە ستەم و ستەمکاری، هەمیشە هزری ڕاستەقینە دژی ستەم و لادانی ستەمکاری خەباتی کردووە، تەنانەت هزری مرۆڤایەتی هەوڵی داوە ئەو ستەمەش لا بەرێت کە بەشێك لە پیاوانی ئایینی– بەتایبەت زانایانی ئایینی مەسیحی و پیاوانی کڵێسا– بە هۆی خراپ سوودبینینیان لە ئایین، دژی خەڵکی بەکاریان هێناوە.

ڕاستییەکی مێژویی هەیە پێویستە ئاماژەی پێ بدەین، ئەویش ئەوەیە دیارترین پاڵنەری ئایینی و هزری بۆ بەکارهێنانی ئایین و عەقڵ دژ بە سروشت و بنەما و پرەنسیپەکانی خۆیان، دەگەڕێتەوە بۆ ڕەهەندی ئابووری و پڕکردنی ورگ و باخەڵی ڕۆشنگەرە عەقڵانی و ئایینییەکان لەلایەن دەسەڵاتە جۆراوجۆرەکانەوە.

ئەو واعیز و ڕۆشنگەرانەی دژی گەل دەوەستنەوە و پاڵپشتی لە دەسەڵاتدارە ستەمکارەکان دەکەن، بەردەوام لە ڕێگەی گیرفان پڕکردنیانەوە پەنا بۆ ئەو کارە دەبەن، بینینی دراوێکی زۆر بەبێ ڕشتنی هیچ ئارەقەیەك و بێ ماندووبوونێکی جەستەیی کوێری کردوون، لەپێناو دراوێکی کەمدا لە ئاست ئەو ستەمە خۆیان گێژ دەکەن، کە دەسەڵات ئەنجامی دەدات.

هەمیشە عەقڵ و هزری پاراوی مرۆڤە بیرمەند و ڕۆشنگەرەکان بووەتە هۆی لادانی بەشمەینەتی و ستەمی سەر تاکەکانی کۆمەڵگا. ڕۆشنبیرەکان عەقڵی خۆیان خستووەتە کار دژ بە بەرژەوەندییەکانی چینی دەسەڵاتدار و لادانی قورسایی لەسەر شانی هەژارەکان.

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا کە ئایین –ئایینی مەسیحی– لەلایەن پیاوانی کڵێسا پیادە دەکرا و تەواوی جومگەکانی دەسەڵاتیان لەدەست دابوو، زۆرترین یاسا و پرەنسیپی ئایینییان داهێنابوو دژ بە بەرژەوەندییەکانی گەل و خەڵکی هەژار و مۆرکێکی ئایینییان بە کارەکانی کڵێساوە دەلکاند، تا کار گەیشتە ئاستی بەخشینەوەی پسووڵەی لێخۆشبوون (صکوك الغفران)، کە گوزارشت بوو لەوەی بڕوادارانی ئایینی مەسیحی لەبەرامبەر ئەنجامدانی تاوانەکانیان لەبەردەم پیاوان و ڕێبەرانی کڵێسادا دانیان بە تاوانەکانیاندا دەنا و بڕێك پارەیان دەخستە دەستی ئەوان، لەبەرامبەردا پیاوانی ئایینیش لێخۆشبوونیان دەبەخشیە تاوانبارەکان، ئیدی ئەو کارەی ئەوان کە مۆرکێکی ئایینی پێوە لکێنرابوو، ببووە مایەی دەوڵەمەندبوونی کڵێسا و ڕێبەرانی ئایین و دۆشینی هەژاران. بە ڕادەیەك ئەو کارەی

ئەوان پەرەی سەند، تا گەیشتە ئەوەی لەپێناو پارەدا زەویی بەهەشت بفرۆشنە بڕواداران، وایان بە خەڵکی ڕاگەیاندبوو کە هەر کەسێك بڕێك پارە بخاتە سندووقی کڵێساوە، ئەوا پارچەیەك زەوی پێ دەبەخشرێت لە بەهەشتدا و ناچێتە نێو ئاگری دۆزەخ، ئەو کارە بەردەوام بوو تا ئەوەی کەسێکی بیرمەند عەقڵی خۆی بەکار هێنا دژ بەو کارەی پیاوانی کڵێسا و خەڵکی لە زەرەرکردنی پارەکانیان و چیتر لەدەستدانی سەروەت و سامانیان دوور خستەوە، کاتێك چوو بۆ لای پیاوانی ئایینیی کڵێسا و پێی ڕاگەیاندن کە ئەو دەیەوێت لەبری بەهەشت تەواوی دۆزەخ بکڕێت، ئەوانیش لایان سەیر بوو چۆن کەسێك هێندە نەزان دەبێت و پارە بە دۆزەخ دەدات، ئەوە بوو لەبەرامبەر پارەیەکی خەیاڵیدا دۆزەخیان بەو کابرایە فرۆشت، ئینجا ئەو کەسە خەڵکی کۆ کردەوە و پێی گوتن: "ئاگادار بن! من هەموو دۆزەخم کڕیوە و دەرگاکەیم داخستووە و لێناگەڕێم هیچ کەسێك بچێتە ناویەوە، بۆیە پێویست ناکات ئێوە چیتر پارەکانتان لە کڕینی زەویی بەهەشتدا بەفیڕۆ بدەن." ئەو کارەی بووە هۆی ئەوەی کڵێسا زۆرترین زەرەری بەر بکەوێت و خەڵکیش هەشیار ببنەوە و چیتر لەخشتە نەبرێن.

زۆرینەی ئەو بیرمەند و ڕۆشنگەرانەی کە بیرمەندانی کۆمەڵگەی ئێمە شانازییان پێوە دەکەن دژی دەسەڵاتی ستەمکار وەستاونەتەوە، هەرگیز عەقڵ و هزری خۆیان لەپێناو بەرژەوەندیی ستەمکاران وەگەڕ نەخستووە و نەیانهێشتووە هەژارەکان ببنە قوربانیی بڕیارەکانی ئەوان، کۆی نووسین و گوتارەکانیان بۆ ئاسوودەییی هەژاران و ڕامالینی حوکمی ستەمکاران بووە.

کارڵ مارکس[1] کە کاریگەرییەکی زۆری لەسەر چەپەکان هەیە، بەشێکی نووسین و بەرهەمەکانی دژ بە دەوڵەتی بڕووسیا و چینە سەرمایەدار و کاربەدەستەکانی کۆمەڵگە بووە، کە زۆرترین ستەمیان دژ بە هاونیشتیمانیان و هەژاران ئەنجام دەدا.

بە هەمان شێوە، مارتن لۆسەری[2] ئەڵمانی کە کاریگەریی زۆری لەسەر بزوتنەوە عەقڵانییەکانی نێو ئایینی مەسیحی هەیە، ئەویش زۆرترین هەوڵی دژ بە ستەمەکانی پیاوانی کەنیسە بووە، کە لە ڕێگەی بڕیار و یاساکانیان بە جۆرەها شێوە خەڵکیان دەچەوساندەوە، بە ڕادەیەك کە سەرەتاکانی شۆڕشی نوێگەری و ڕێنسانسی هزری بۆ ئەو تەوژم و بزوتنەوە عەقڵانییە دەگەڕێتەوە، کە دژ بە کڵێسا و ستەمی پیاوانی ئایینی مەسیحی بەرپای کرد.

فەیلەسووفە ناودارەکانی جیهان کە پێشڕەویی ڕەوتی فەلسەفە و ڕۆشنگەری دەکەن، بەردەوام عەقڵ و هزر و فەلسەفەیان دژ بە ستەم و ستەمکاری بەکار هێناوە، چونکە درکیان بەوە کرد بوو کە هزر و فەلسەفە سروشتێکی دژەستەمیان هەیە، بۆیە نەبیستراوە ڕۆژێك فەلسەفە و عەقڵیان بخەنە خزمەت دەسەڵات و ستەمکارەکانی سەردەمی خۆیان.

---

(١) کارڵ مارکس Karl Marx: فەیلەسووفێکی ئەڵمانی و بیرمەندێکی سیاسییە، بەڕەچەڵەك یەهودییە، ساڵی (١٨١٨ز.) لەدایك بووە و ساڵی (١٨٨٣ز.) لە لەندەن کۆچی دوایی کردووە. خاوەن میتۆدێکی فەلسەفیی ماتریاڵییە، بڕوای وایە هەموو گۆڕانکارییەکانی مێژووی مرۆڤایەتی هۆکارەکەی ماددە و ئابوورییە، ئایینی وەك بێهۆشکەری گەلان پێناسە کردووە. دکتۆرای لە فەلسەفەی سروشتدا بەدەست هێناوە. بەرهەمی زۆری هەیە، لەوانە: (رأس المال، نقد الاقتصاد السياسي، بؤس الفلسفة، البيان الشيوعي، الأيديولوجيا الألمانية). بڕوانە: مشاهير الفلاسفة من طاليس إلى ديكارت: ديوجين لايرتيوس: (٢٥١). معجم الفلاسفة: جۆرج طرابيشي: (٦١٨).

(٢) مارتن لۆسەر Martin Luther: چاکساز و ڕێبەرێکی ئایینی ئەڵمانییە و دامەزرێنەری ڕێبازی (پرۆتستانتە) لە ئایینی مەسیحیدا، ساڵی (١٤٨٣ز.) لەدایك بووە و ساڵی (١٥٤٦ز.) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانامەی دکتۆرای لە کتێبی پیرۆز (تەورات و ئینجل)دا بەدەست هێناوە، ساڵی (١٥١١ز.) بزوتنەوەی چاکسازیی ئایینیی دامەزراند. بڕوانە: معجم الفلاسفة: جۆرج طرابيشي: (٥٨٧).

بەشێکی زۆری ئەو پێشکەوتنە بێوێنەیەی کە وڵاتانی ڕۆژئاوا پێی گەیشتوون، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ڕۆشنگەر و هزردۆستەکانیان هەرگیز سڵیان لە ڕووبەڕووبوونەوەی ستەمکاران نەکردووەتەوە، هیچ کات پارە و دارایی وای لێ نەکردوون چاویان لەبەرامبەر کەموکورییەکانی بەرپرسان کوێر بکەن، چونکە دەزانن ئەگەر عەقڵ و هزریان لە بەرژەوەندیی کۆمەڵگەدا خستە کار، هەم خۆیان دەوڵەمەند دەبن، هەم ناخیان ئاسوودە دەبن و هەم وڵات و نیشتیمانیان پێش دەکەوێت. بەپێچەوانەوە، درکیان بەوە کردووە کە ئەگەر ڕەوتی ڕۆشنگەری لە خزمەت دەسەڵاتی ستەمکاردا بوو، ئەوکات هەم بەرژەوەندییەکانی ئەوان سنووردار دەبێت، هەم سانسۆر دەخرێتە سەر ئازادییەکانیان، هەم وڵات و کۆمەڵگەش تووشی داڕووخان و دواکەوتن دەبێت.

بە پێچەوانەی وڵاتانی ڕۆژهەڵات کە نەیانتوانیوە ئاستی کۆمەڵگاکانی خۆیان بەرەوپێش ببەن، ئەمەش بە هۆی ئەوەی بەشێك لە چینە ڕۆشنگەرەکە کە ئەرکی بەرەو پێشبردنی وڵاتیان لە ئەستۆدایە، بەردەوام عەقڵ و هزری خۆیان بە خراپ بەکار هێناوە، هەمیشە ئەرکیان شەرعیەتدان بووە بە ستەمی دەسەڵاتدارەکان.

دکتاتۆرەکانی وڵاتانی ئیسلامی بۆ خۆیان هێندە بەرگرییان لە ڕژێمەکانی خۆیان نەکردووە، هێندەی بەشێك لە بە ناو ڕۆشنبیر و زانا ئایینییەکان پاراستوویانن. ڕۆشنگەراکان وەك ئەوەی ئەرکیان پاراستنی ڕژێم و ڕەوایەتیدان بێت بە خراپەکاریی دەسەڵاتداران، لەبری بڵاوکردنەوەی هۆشیاری و ڕەخنەگرتن لە کۆی سیستمی سیاسی و حوکمڕانیی وڵات بە ئامانجی باشترکردنی، دێن دەبنە پارێزەری دەسەڵاتە ملهوڕەکان و بەرژەوەندییەکانیان.

ئەوەی سەیرە، لە کۆمەڵگەی کوردیدا بەشێك لە ڕۆشنبیرەکان بەردەوام بانگەشەی دادگەری و لادانی ستەم دەکەن، بەردەوام هێرش دەکەنە سەر دەق و تێکستەکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بە بیانووی ئەوەی دژ بە ئازادی و خواستەکانی

مرۆڤن و ستەم لە مرۆڤایەتی دەکەن و بڕوایان وایە ئایین دەروازەی دروستکردنی دکتاتۆر و ستەمکارانە، کەچی خۆیان لە بەرژەوەندیی پارت و لایەنێك کار دەکەن کە ئەگەر خودی پڕەنسیپ و بەهاکانی عەقڵ و هزر و فەلسەفە بکەینە پێوەر، ئەو پارت و لایەنانە خۆیان ستەمکارن، کە پێویستە بەرپەرچ بدرێنەوە و ڕێگری لە ستەمەکەیان بکرێت.

ئەم دووفاقیەی ڕۆشنگەراکانیش جۆرێك لە دژایەتی و ڕقوکینەی لە ناخی هاولاتیان بەرامبەر بە خودی عەقڵ و هزر و فەلسەفە چاندووە و گریمانەی ئەوەی لا دروست کردوون کە هەرچی هزر و فەلسەفەیە بەردەوام لە بەرژەوەندیی ستەمکار و دەسەلاتە دکتاتۆرەکاندایە.

لە ولاتێکدا کایە مەعریفی و پەروەردەییەکان لە بەرژەوەندیی دەسەلاتی ستەمکار بخرێنە کار، هیچ ئاسۆیەکی ڕووناك نابێت تا بەرەو پێشکەوتن و بەختەوەری هەنگاو بنێت، هەر هەنگاوێکی ئەو کۆمەلگایەش لەم پێناوەدا، لەسەر بنەمای ڕشتنی خوێن و تێکچوونی ئاسایشی کۆمەلگە دەبێت.

بەپێچەوانەوە، هەر کاتێك عەقڵ و مەعریفە و ڕۆشنگەراکان هاوشانی ئایین و زانایانی ئایینی دژی ستەم و ستەمکاران وەستانەوە، ئەوا بەبێ ڕشتنی خوێن و تێکدانی ئارامیی ولات ستەمکاران بەرەو ئاوابوون هەنگاو دەنێن و هەلاتنی خۆری سەرکەوتن و ئاسوودەییی کۆمەلگە نزیکتر دەبێتەوە.

وەستانەوەی ڕۆشنبیرەکان دژ بە خواست و ئامانجی ڕژێمە دکتاتۆرەکان، واتا نەمانی پلان و هزری بەڕێوەبردنی ولات. وەستانەوەی پیاوانی ئایینیش بەرامبەریان، واتا لەدەستدانی شەرعیەتی بڕیارەکانیان و کالبوونەوەی ڕێژەی جەماوەریان. سەرئەنجام، هەردوو لایان دەبنە فاکتەرێکی بەهێزی لەناوچوونی ستەم و ستەمکاران.

# بەشی سیانزەم

# ئایین و ستەم

ئایین لە خودی خۆیدا سروشتێکی دژەستەمکاریی هەیە، دەق و تێکستەکانی مرۆڤ بەرەو دادگەری و دوورکەوتنەوە لە ئازاردانی کەسانی تر ئاڕاستە دەکەن، گەورەترین نەیارانی ئایین ستەمکارانن، بۆیە بەردەوام ئایین هەوڵی داوە ڕیشاڵەکانی ستەم لە کۆمەڵگەدا ڕیشەکێش بکات و دادگەری لە جێگەیدا بونیاد بنێت. ئیبراهیم ﷺ دژی نەمروود و موسا ﷺ دژی فیرعەون و موحەممەد ﷺ دژی تەواوی قوڕەیش و پێغەمبەرانی تر (دروودی خوایان لەسەر بێت)، دژی نەتەوەکانی خۆیان وەستاونەتەوە بە مەبەستی لادانی هەموو ئەو ستەم و نادادپەروەرییەی لە کۆمەڵگەدا ئەنجامیان دەدا.

ئەو کۆدەنگییەی ئایینەکان و پێغەمبەرانیش (سڵاوی خوایان لیٚ بێت)، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە تەواوی ئایینەکان خاوەنی یەك میتۆدن و هەموو پێغەمبەرانیش (سڵاوی خوایان لیٚ بێت) هەڵگری یەك پەیام و بانگەوازن، کە میتۆد و پەیامی دژە ستەمکارییە.

قورئانی پیرۆز کە دوایەمین دەستووری پەروەردگارە بۆ مرۆڤایەتی، چەندەها چیرۆك و داستانی تۆمار کردووە سەبارەت بە بەرەنگاربوونەوەی ستەمکاران و لەناوبردنیان، وەك چیرۆکی: (فیرعەون و هامان و قارِوون و نەمروود... هتد)، هەموو ئەو داستان و چیرۆکانەی کە تۆمار کراون، گەواهی ئەوە دەدەن کە ئایین بۆ پاڵپشتیی ستەملێکراوان دەجەنگێت و دژ بە ستەمکاران خەبات دەکات.

دوژمنایەتیی ئایین بۆ ستەم و ستەمکاران وانەیەکە بۆ تەواوی بڕواداران بەگشتی، بەڵام دوژمنایەتیکردنی خودی پێغەمبەرەکانی خوا (سڵاوی خوایان لیٚ بێت) بۆ تەوژمی ستەم و سەرانی ستەمکاری، ئاماژەیەکی تایبەتە بە میراتگرانی پێغەمبەر ﷺ کە زانا و بانگخواز و کارەکتەرە ئایینییەکانن، تاکو شوێنپێی پێغەمبەران (سڵاوی خوایان لیٚ بێت) هەڵبگرن و وەك ئەوان دژایەتی و بەرهەڵستی ستەم و ستەمکاران بکەن .

ئەگەر ستەم (دڕك) بێت و دادگەری (گوڵ) بێت، ئەوا لە دیدگا و لۆژیکی مرۆڤایەتیدا تاك یان دەبیٚ گوڵ بێت یان لانی کەم پێویستە دڕك نەبێت (ئەگەر گوڵ نیت، دڕکیش مەبە). بەڵام لە فەرهەنگ و دەستووری ئایین و پەیامبەرانی خوادا (سڵاوی خوایان لی ٚبێت)، مرۆڤ جگە لە گوڵبوون، هیچ بژاردەیەکی تری نییە، چونکە مرۆڤ یان دەبێت بە خواییشت و ویستی خۆی ببێتە گوڵ، یان بڕواداران لە ڕێگەی هێزەوە بەناچاری دەیکەن بە گوڵ. ئەوەتا فرستادەی کۆتا زەمان فەخری عالەم (موحەممەد ﷺ)، جوانترین پەیڤی کردووەتە دیاریی مرۆڤایەتی بەگشتی و موسڵمانان بەتایبەت، کاتێك سەبارەت بەم بابەتە فەرموویەتی: (انْصُرْ أَخَاكَ ظَالِمًا

أَوْ مَظْلُومًا فَقَالَ رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللهِ أَنْصُرُهُ إِذَا كَانَ مَظْلُومًا أَفَرَأَيْتَ إِذَا كَانَ ظَالِمًا كَيْفَ أَنْصُرُهُ قَالَ تَحْجُزُهُ ، أَوْ تَمْنَعُهُ مِنَ الظُّلْمِ فَإِنَّ ذَلِكَ نَصْرُهُ)(١).

واتە: "براكەت سەر بخە، چ ستەمكار بوو چ ستەملێكراو، پیاوێك گوتی: ئەی پەیامبەری خواﷺ، ئەگەر ستەملێكراو بوو یارمەتیی دەدەم، بەڵام ئەگەر ستەمكار بوو چۆن یارمەتیی بدەم و سەری بخەم؟ پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: بیگێڕیتەوە یان ڕێگریی لێ بكەیت ستەمەكە بكات، ئەمە یارمەتیدانیەتی."

كەواتە ئایین هیچ بژاردەیەكی بۆ ستەمكاری پێشنیاز نەكردووە، ئەگەر مرۆڤ ستەمكار بوو، دژی دەوەستێتەوە تا ئەو كاتەی دەیخاتە سەر ڕێگەی دادگەری، ئەگەر ستەملێكراویش بوو، بەرگریی لێ دەكات تا ئەو كاتەی ستەمەكەی لەسەر لا دەبات.

دەشێ بوترێت لە فەرهەنگی ئاییندا مرۆڤ و ستەم هەرگیز بەیەكەوە بەردەوامبوونیان نییە، هەر بەردەوامبوونێكیش پێچەوانەی سروشت و دەق و تێكستەكانی ئایینە. نەك هەر ئەمە، بەڵكو ئایین بە جۆرێك سنووری بۆ ستەم داناوە، كە بڕواداران بۆیان نییە بە هیچ شێوەیەك مەیل و ڕوویان بۆ ستەمكاران هەبێت، ئەگینا هەمان چارەنووسی ڕەشی ئەوانیان دەبێت. ئەوەتا خوای باڵادەست لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَرْكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴾(٢). واتە: "نەكەن مەیلی دڵتان لەگەڵ ئەوانەدا بێت كە ستەمیان كردووە و لە خودا یاخی بوون، چونكە ئەو كاتە ئاگر دەتانسووتێنێت، كەسیش جگە لە خودا، پشتیوانتان نابێت، لەوەودوایش یارمەتی نادرێن."

(١) بوخاری ڕیوایەتی كردووە, بە ژمارە: (٦٩٥٢).

(٢) سوورەتی (هود)، ئایەتی: (١١٣).

ئێمە لێرەدا مەبەستمان نییە چەمکی ستەم و ستەمکاری لە ڕوانگەی ئایینەوە شی بکەینەوە، چونکە ئەم بابەتە بە دەیان پەرتووك و توێژینەوەی لەسەر ئەنجام دراوە، بەڵکو ئێمە تەنها دەمانەوێت بڵێین ئایین خاوەن میتۆدێکی مرۆڤایەتییە و کرۆك و ناواخنی ئەم مرۆڤایەتیبوونەی لەوەدا سەرچاوەی گرتووە کە دژی ستەم و ستەمکارانە، بەڵام بەداخەوە بە شێك لە زانا و کەسایەتییە ئایینییەکان پێچەوانەی ئەم میتۆدە هەڵسوکەوت دەکەن.

ئەو کارەکتەرە ئایینی و سیاسی و عەقڵانییانەی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا نەمرییان بۆ خۆیان تۆمار کردووە، بەشێکی زۆری بۆ ئەو ڕۆحە دژە ستەمکارییە دەگەڕێتەوە کە لە پەیام و نووسین و لێکۆڵینەوەکانیاندا دژ بە کارەکتەرە ستەمکارەکان دەیاننواند. بە هەمان شێوە، ئەو کارەکتەرانەی نەفرینی مرۆڤایەتییان بۆ دەچێت و وەك نموونەی دڕندەیی و نامرۆڤبوون نیشان دەدەرێن، بێگومان زۆرترین ڕێژەی بۆ ئەو هزر و بۆچوونە ستەمکارییەیان دەگەڕێتەوە کە لە مێژووی ژیانیاندا تۆماریان کردووە.

پێغەمبەری ئیسلام (موحەممەدﷺ) لەپێش هەمووان و پاشان هەندێ کەسایەتیی مێژوویی وەکو: غاندی[1] و چێ گیڤارا[2] و عومەر موختار[3] و... هتد،

---

(١) غاندی Gandhi: سەرکردەیەکی نەتەوەییی هیندییە، ساڵی (١٨٦٩ز.) لەدایك بووە و ساڵی (١٩٤٨ز.) کۆچی دوایی کردووە. نازناوی (مهاتمای) پێ بەخشراوە, بە واتای ڕۆحە گەورەکە. زۆرترین کۆششی کردووە دژی توندوتیژی و ڕەگەزپەرستی و بەکۆیلەکردنی خەڵك و جیاوازیی چینایەتی، هەوڵی داوە بۆ سەربەخۆییی هیندییەکان لەژێر دەسەڵاتی بەریتانیا. بڕوانە: معجم أعلام المورد: منير البعلبكي: (٢٩٥).

(٢) چێ گیڤارا Che Guevara: شۆڕشگێڕ و سەرکردەیەکی سیاسیی کوبییە، ساڵی (١٩٢٧ز) لەدایك بووە، ساڵی (١٩٦٧ز.) کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: معجم أعلام المورد: منير البعلبكي: (٣٠٩).

(٣) عومەر موختار: تێکۆشەرێکی لیبییە، ساڵی (١٨٥٨ز.) لەدایك بووە و ساڵی (١٩٣١ز.) کۆچی دوایی کردووە، تێکۆشاوە لەپێناو سەربەخۆیی دژ بە داگیرکاریی ئیتاڵیا، دواتر ئیتاڵییەکان گرتیان و لەسێدارەیان دا. بڕوانە: معجم أعلام المورد: منير البعلبكي: (٢٨٩).

گەورەترین شانۆی مرۆڤایەتییان پێشکەشی جیهان کردووە و ناوی خۆیان لە لیستی زێڕینی مرۆڤە زیندووەکاندا نووسییەوە، بێگومان فاکتەرەکەی ئەو ڕەوت و ڕێبازە دژەستەمکارییە بوو کە لە پڕۆگرام و ئایدۆلۆژیای خۆیاندا بەرجەستەیان کرد. لەبەرامبەردا، هەندێ سەرکردە و کەسایەتیی جیهانی وەکو: هیتلەر[1] و مۆسۆلینی[2] و سەدام حوسەین، لە مێژوودا وەك ئەژدیها و ئەنتی مرۆڤ سەیر دەکرێن، بە هۆی ئەو ستەم و ئازارانەی بە گەلەکانیان چەشتیان و بوونە مایەی لەناوچوونی دەیان هەزار مرۆڤ.

دوا جار کارەکتەرە دژەستەمکارەکان توانیان بۆ خۆیان قوتابخانە و ڕێبازێك بونیاد بنێن، کە لەدوای خۆیان بە دەیان و بە ملیۆنان کەس تێیدا پەروەردە بن و ڕەنگدانەوەیەکی باشی لەنێو تەواوی مرۆڤایەتیدا هەبێت و بەردەوام وەك نموونەیەکی باش پیشان بدرێن. لەبەرامبەردا، کارەکتەرە ستەمکارەکان جگە لەوەی بوونە مایەی لەناوچوونی خۆیان و لەناوبردنی دەیان هەزار مرۆڤی بێتاوان، هاوکات قوتابخانە و ڕێبازە نەتەوەیی و ئایدۆلۆژی و ناسیۆنالیستەکانیشیان بوونە جێی گاڵتەی مرۆڤایەتی و خرانە زبڵدانی مێژووەوە.

ئاستی گەشەسەندن و بڵاوبوونەوەی ئایین و ئایدۆلۆژیا و ڕێباز و تیۆرە هزری و فەلسەفییەکان بەندە بە ڕێژەی مرۆڤبوونی کارەکتەرەکانیان، خاوەن ئایین و تیۆرا

---

(١) ئەدۆلف هیتلەر Adolf Hitler: سەرکردەیەکی نازی ئەڵمانییە، ساڵی (١٨٨٩ز.) لەدایك بووە و ساڵی (١٩٤٥ز.) کۆچی دوایی کردووە. ساڵی (١٩٣٩ز.) بووە هۆکاری سەرهەڵدانی جەنگی جیهانیی دووەم، زۆربەی وڵاتانی جیهانی داگیر کرد، بەڵام دواتر ساڵی (١٩٤٣ز.) لەبەرامبەر ئیتیحادی سۆڤیەتی شکستی هێنا، ساڵی (١٩٤٥ز.) خۆی کوشت. بڕوانە: معجم أعلام المورد: منير البعلبكي: (٤٧١).

(٢) مۆسۆلینی Mussolini: سەرکردەیەکی فاشیزمی ئیتالییە، ساڵی (١٨٨٣ز.) لەدایك بووە و (١٩٤٥ز.) کۆچی دوایی کردووە. ساڵی (١٩١٩ز.) لە شاری میلانۆ حزبی فاشیزمی دامەزراند، هۆکاری هەڵگیرساندنی چەندین جەنگی خوێناوی بووە لەگەڵ هیتلەردا، دوا جار لەلایەن ڕکابەرەکانی کوژرا. بڕوانە: معجم أعلام المورد: منير البعلبكي: (٤٤٠).

مرۆڤایەتییەکان لە ئەگەری ڕەخساندنی کەشێکی گونجاو بۆ مرۆڤەکان سیفەتی نەمری و سەرمەدی بوون دەبەخشنە پەیام و ئایدۆلۆژیاکانیان. لەبەرامبەردا دژبوونیان بە خواست و ئامانجی مرۆڤ، ڕێباز و ڕەوتەکانیان لە ڕەگوڕیشەوە هەڵدەکێشێت، هەڵبەتە دەشێ تا ئەو ساتە بوونیان هەبێ کە دەسەڵات و پارەیان دەبێت، بەڵام لەگەڵ لەرزینی تەختیان و نەمانی دراویان، خۆیان و هزر و ڕێبازەکانیشیان بوونیان نامێنێت و دەبنە مێژوویەکی لەبیرکراو.

ستەم خۆی سیمایەکی ناشیرینی هەیە و قێزەونە، کاتێك کارەکتەرێکی ئاینییش ئەنجامی دەدات، زیاتر شێوەکەی دەشێوێت و وەك دێوەزمە و ئەهریمەنێکی ترسناك دێتە بەرچاو، ئەوەی جێی مەترسییە ئەوکات نەك هەر خۆی ناشیرین دەکات، بەڵکو ئاینەکەشی لەکەدار دەکات.

یەکێك لە دیاردە هەرە دزێوەکانی نێو جیهانی ئیسلامی کە کاریگەریی خراپ و نەرێنیی لەسەر هزر و بۆچوونی خەڵکی دروست کردووە، بینینی کارەکتەرە ئاینییەکانە لەبەردەم خوانی ستەمکاران.

لە ڕاستیدا ڕژێمە دکتاتۆر و ستەمکارەکان سێ هێز دەیانپارێزن:

**١- هێزی سامان و دارایی**

کە لە ڕێگەی دابینکردنی بژێویی ژیان و ڕشتنی پارە بەسەریاندا دڵسۆز و دۆستیان بۆ فەراهەم دەکات.

**٢- هێزی چەکدار**

کە لە ڕێگەی توندوتیژی و ئازاردان، نەیاران و بەرامبەرەکانیان سەرکوت دەکات و ئازادی و مرۆڤبوونیان لێ زەوت دەکات.

**٣- هێزی ئایینی**

کەپیاوانی ئایینی و دەزگا ئایینییەکان لە ڕێگەی ئامۆژگاری و گوتارەکانیانەوە شەرعیەت و ڕەوایەتی بە دەسەڵات و کردەوە ناشەرعی و نایاساییەکانیان دەدەن.

بێگومان کاتێك تاکەکان زانایان دەبینین لە ڕێگەی دەق و تێکستە ئایینییەکان پاڵپشتی خۆیان بۆ ستەمکار دەردەبڕن و لەبەرامبەردا خۆیان لە ترۆپکی ڕەفاهیەت و خۆشگوزەرانیدا ژیان بەسەر دەبەن و داوای بەردەوامی بۆ دەسەڵات و بێدەنگی و دڵسۆزبوونیش لە هاوڵاتیان دەکەن، ئەوکات تاکەکان بۆچوونێکی دژەئایینییان لەلا دروست دەبێت، چونکە مرۆڤ نەریتی وایە ئایین و ئایدۆلۆژیاکان لە چاوی پەیڕەوکارانیان دەخوێننەوە، بۆیە دەبینین کاتێك تاکێکی باش دەبینن، ڕاستەوخۆ بۆچوونێکی باشیان بەرامبەر بە ئایین لەلا دروست دەبێت، بەپێچەوانەشەوە، کاتێك کارەکتەرێکی خراپ دەبینن، هزری دژەئایینی و گومان بەرامبەر بە ئایین لە دڵ و دەروونیاندا چەکەرە دەکات.

ئێستا بەشێك لە زانایان و بانگخوازانی ئایینی بەرجەستەیەکی خراپی ئایین دەکەن لەم بوارەدا، تەنانەت ئەو بانگخوازانەی لە کۆمەڵگەدا جێی متمانەی هاوڵاتیانن، ئێجگار کەمن، ئەمەش بە بۆچوونی هاوڵاتیان بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

١- پاڵپشتیکردنیان لە چینی ستەمکار و شەرعیەتدان بە کارەکانیان.

٢- بێدەنگبوونیان لە ئاست ئەو هەموو ستەم و ئەشکەنجە و ناڕەحەتییانەی ڕووبەڕووی هاوڵاتیان دەکرێتەوە.

٣- سوودمەندبوونیان لە پرۆژەکانی دەسەڵات، کە لەسەر حسابی بەرژەوەندییەکانی گەل ئەنجام دەدرێن.

٤- دژایەتیکردنی ئەو ڕەوت و پارت و گرووپانەی کە دژی ستەمکاران دەوەستنەوە.

ئەو زانا ئایینییانەی کە بە پێنووس و گوتارەکانیان پاڵپشتی دەسەڵاتە ستەمکارەکان دەکەن هەمان ئەو کارە دەکەن کە ستەمکارەکان ئەنجامی دەدەن، بەڵام ستەمی ستەمکاران فۆڕمێکی ماددیی هەیە، هەرچی واعیزەکانن بە فۆڕمێکی مەعنەوی ستەمەکانیان ئەنجام دەدەن.

دکتۆر عەلی وەردی[1] لە پەرتووکی (واعیزەکانی سوڵتان) ئاماژە بەو دیاردەیە دەکات و دەڵێت: "الواقع أنّ الوعاظ والطغاة من نوع واحد، هؤلاء يظلمون الناس بأعمالهم، وأولئك يظلمونهم بأقوالهم، فلو أنّ الواعظين كرّسوا خطبهم الرنانة على توالي العصور في مكافحة الطغاة وإظهار عيوبهم لصار البشر على غير ما هم عليه الآن[2]." واتە: "لە ڕاستیدا واعیزەکان و ستەمکارەکان یەك جۆرن، ستەمکاران بە کردەوەکانیان ستەم لە خەڵکی دەکەن، واعیزەکانیش بە قسەکانیان. بە درێژاییی مێژوو ئەگەر واعیزەکان گوتارە بریقەدارەکانیان بۆ دژایەتیکردن و بەرەنگاربوونەوەی ستەمکاران و دەرخستنی کەموکورتییەکانیان تەرخان کردبا، ئێستا مرۆڤایەتی لە بارودۆخێکی جیا لەو بارودۆخە دەبوون کە ئێستا لە سەرینی."

ئەم پاڵپشتیکردنەی بەشێك لە زانایان لە دەسەڵاتی ستەمکاران، فاکتەرێکی هەرە دیاری لاوازکردنی ڕۆحی ئایینە لە کۆمەڵگەدا. عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك دەفەرموێت:

وَهَلْ أَفْسَدَ الدِّينَ إِلَّا الْمُلُوكُ    وَأَحْبَارُ سُوْءٍ وَرُهْبَانُهَا

واتە: "مەگەر ئایینی تێك داوە جگە لە پادشا و دەسەڵاتداران و پێشەوا و زانایانی خراپ و ڕاهیب و قەشەکانیان."

---

(١) عەلی وەردی: زانایەکی کۆمەڵناسی عێراقییە، ساڵی (١٩١٣ز.) لەدایك بووە و ساڵی (١٩٩٦ز.) کۆچی دوایی کردووە. لە زانکۆی تەکساس بڕوانامەی دکتۆرای لە زانستی کۆمەڵناسیدا بەدەست هێناوە. هەندێك لە بەرهەمەکانی: (خوارق اللاشعور، وعاظ السلاطين، مهزلة العقل البشري، في الطبيعة البشرية). بڕوانە: معجم الأدباء من العصر الجاهلي حتى سنة (٢٠٠٢): كامل سلمان الجبوري: (٣٤٧/٤).

(٢) وعاظ السلاطين: دکتۆر عەلی وەردی: (٤٨).

بێگومان ئەم خراپ بەکارهێنانەی ئایینیش بۆ پاڵپشتیکردنی ستەمکاران، کاریگەریی نێگەتیڤی هەیە لەسەر دۆخی ئایین، چونکە ئەم جۆرە پێشکەشکردنەی ئایین وێڕای ئەوەی پێچەوانەی خواست و دروشمەکانی خودی ئایینە، هۆکاری چەکەرەکردن و سەرهەڵدانی بزوتنەوە و تەوژمە ئیلحادی و دژەئایینەکانیشە، دیارە لەو حاڵەتەشدا هەم ئایین هەم ئاییندارەکان زەرەرمەندی یەکەم دەبن.

هەڵبەتە ئێستا بەشێك لە بە ناو ئەکادیمستە ئایینییەکان، زۆرترین ڕۆڵی نەگەتیف بەرجەستە دەکەن لەم بوارەدا، بە جۆرێك ئەو کارەکتەرە ئایینییانەی لە ئەکادیمیا و کۆڕبەندە ئایینییەکان بەرجەستەی پسپۆڕی و کەسایەتیی ئایینی دەکەن، لەبەرامبەر هەندێك پۆست و داهاتی کەم، بوونەتە داینەمۆی پاڵپشتیکردن لە ستەمکاران، تەنانەت لەپاڵ بێدەنگبوونیان لە ستەم و نادادپەروەریی دەسەڵاتداران، زۆرترین هەوڵ و کۆششیان لەپێناو ڕەوایەتیدان و بەرگریکردنە لە سەرانی ستەم، ئیدی هاوشان لەگەڵ بەشێك لە بانگخوازە ئایینییەکانی نێو مزگەوت، دووانەیەکی ترسناکیان دروست کردووە و بوونەتە سەرچەشمەی لەکەداربوونی شکۆی ئایین و پێگە و بەهای کەسایەتی و ئەکادیمستە ڕاستەقینەکان.

# کۆتایی

لە کۆتاییی ئەم بەرهەمە سادەیەدا، گرنگترین دەرئەنجامەکان دەخەینە ڕوو، کە بریتین لەمانەی خوارەوە:

١- فەلسەفە ڕەهەندێکی گشتیی هەیە و بەتەواوی ئەو پرۆسە عەقڵی و ئەپستمۆلۆژی و لۆژیکییە دەگوترێت، کە مەعریفەیەکی تازە دەبەخشێتە خاوەنەکەی.

٢- ئایین بە شێوەیەکی گشتی، کۆی ئەو پەرستش و بەها و ڕێسا خودایی یان مرۆییانە دەگرێتەوە کە مرۆڤەکان تەواوی ژیانیان لەژێر ڕۆشناییی دەق و تێکستەکانیدا دەبەنە سەر.

٣- ئایین و فەلسەفە کۆمەڵێك خاڵی هاوبەش و خاڵی جیاوازیان هەیە، بەڵام نە خاڵە هاوبەشەکان ئەوە دەگەیەنن کە یەك شت بن، نە خاڵە جیاوازەکان بەو واتایە دێن کە نەیار و دوژمنی یەکتر بن.

٤- ئایین و فەلسەفە هەم لەلایەن هەوادارانیان، هەم لەلایەن نەیارەکانیان دووچاری ئەزیەت و ئازار دەبنەوە، بەڵام زۆرترین جار دەبنە قوربانیی دەستی شوێنکەوتووەکانیان.

٥- فەلسەفە و لۆژیکی ڕاستەقینە بە هیچ جۆرێك نەیار و دوژمنی ئایینی ڕاستەقینە نین، بەڵکو دژی ئەفسانە و میسۆلۆژیای نێو بەشێك لە ئایینەکانن.

٦- ئایین بە هیچ جۆرێك دژی فەلسەفەی حەق نییە، چونکە ئایین خۆی لە بەشێك لە دەق و تێکست و پرسەکانیدا تەبەنی عەقڵانیەت و یاسا لۆژیکییەکانی کردووە.

٧- لە بنەڕەتدا فەلسەفە و ئایین دوو کایەن کە هیچ کات لەپێناو پارە و دراودا تێکست و بەهاکانی خۆیان ناخەنە گرەو، بەڵام بەشێك لە کارەکتەرەکانی ئایین و فەلسەفە ئەم دووانەیان پێچەوانەی ئەم فۆڕمە بەکار هێناوە، بەمەش بوونەتە

مایەی زیانگەیاندن بە کەسایەتییە ڕاستەقینەکان و پێگە و ناوبانگی خودی ئەم دوو کایەیە.

٨- ئایین و فەلسەفە دەق و تێکست و پرەنسیپەکانیان فاکتەری بەهێزی تێرکردنی مەعنەویەت و غەریزەی مەعریفە و زانینی مرۆڤن، بەڵام بەداخەوە بەشێك لە ڕێبەرانی ئەم دووانە بە جۆرێك نامەعریفی و نالۆژیکین کە کۆی پرۆسەی عەقڵانیەت و بزوتنەوەی ئایینییان خستۆتە ژێر مەترسیی لەناوچوون و لەکەداربوون.

٩- کۆی دەق و تێکستەکانی ئایین و فەلسەفەی ڕاستەقینە، پاڵپشتی چینی هەژاران و ستەملێکراوان دەکەن و کارەکتەرەکانی خۆیان بە شێوەیەك ڕێنمایی دەکەن کە بە هیچ جۆرێك پشتی دەسەڵاتی ستەمکار نەگرن، بەڵام بەشێکی زۆری سیستمە دکتاتۆرەکانی ئەمڕۆی جیهان بەگشتی و جیهانی ئیسلامی بەتایبەت لە دەرئەنجامی پاڵپشتی کارەکتەرەکانی ئەم دووانە، خەریکی بەردوامیدانن بە دەسەڵات و ستەمی خۆیان.

لە کۆتاییدا هیوادارم ئەم بەرهەمە جێی ڕەزامەندی خودا و خوێنەران بێت و لە هەر کەموکورتی و هەڵەیەك تیایدا داوای لێخۆشبوون لە خودا و چاو پۆشیکردن و ڕاستکردنەوە لە خوێنەران دەکەم.

وصلى الله وسلم وبارك على سيدنا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين

ئاوارە عەلی

(٢٠١٧/٦/٢١) ز. (٢٦/رەمەزان/١٤٣٩) ك.

# سەرچاوەکان


دوای قورئانی پیرۆز:

١- آراء نقدية في مشكلات الدين والفلسفة والمنطق: دكتور مهدي فضل الله، دار الأندلس، بيروت- لبنان، الطبعة الأولى، ١٤٠١هـ- ١٩٨١م.

٢- الآراء والمعتقدات: جوستاف لوبون، ترجمة: عادل زعيتر، كلمات عربية للترجمة والنشر، القاهرة- جمهورية مصر العربية، ٢٠١٢، بدون رقم الطبعة.

٣- أساس البلاغة: أبو القاسم جار الله محمود بن عمرو بن أحمد الزمخشري، المتوفى (٥٣٨هـ)، تحقيق: محمد باسل عيون السود، دار الكتب العلمية، بيروت-لبنان، الطبعة الأولى، ١٤١٩هـ- ١٩٩٨م.

٤- أسس الفلسفة: دكتور توفيق طويل، مكتبة النهضة العربية، القاهرة- جمهورية مصر العربية، الطبعة الثالثة، ١٩٥٨م.

٥- أسس الفلسفة: راكيتوف، ترجمة: موفق الدليمي، دار التقدم، موسكو- الاتحاد السوفيتي، ١٩٨٩م، بدون رقم الطبعة.

٦- البصائر والذخائر: أبو حيان التوحيدي، تحقيق: الدكتور وداد القاضي، دار صادر، بيروت- لبنان، الطبعة: الأولى، ١٤٠٨ هـ- ١٩٨٨م.

٧- تاريخ الأديان: الدكتور عبدالقادر بخوش، الطبعة الأولى، دار الضياء، الكويت، ١٤٣٥هـ- ٢٠١٤م.

٨- تاريخ الفلسفة الإسلامية في المشرق: الدكتور محمد إبراهيم الفيومي، دار الجيل، بيروت- لبنان، الطبعة الثانية، ١٤١٩هـ-١٩٩٩م.

٩- تاريخ الفلسفة الحديثة: وليم كلي رايت، ترجمة: محمود سيد أحمد، دار التنوير، بيروت- لبنان، الطبعة الأولى، ٢٠١٠م.

١٠- التعريفات: علي بن محمد بن علي الزين الشريف الجرجاني، المتوفى (٨١٦هـ)، تحقيق: جماعة من العلماء، دار الكتب العلمية، بيروت- لبنان، الطبعة الأولى، ١٤٠٣هـ- ١٩٨٣م

١١- تمهيد لتاريخ الفلسفة الإسلامية: الدكتور مصطفى عبدالرازق، دار الكتاب اللبناني، بيروت- لبنان، دار الكتاب المصري، القاهرة- مصر، الطبعة الأولى، ١٤٣٢هـ- ٢٠١١م.

١٢- تمهيد للفلسفة: الدكتور محمود حمدي زقزوق، دار المعارف القاهرة- مصر، الطبعة الخامسة، ١٩٩٤م.

١٣- الجمع بين رأيي الحكيمين: أبو نصر محمد بن محمد بن طرخان الفارابي، المتوفى (٣٣٩هـ)، شرح وتبويب: الدكتور علي بو ملحم، دار ومكتبة الهلال، بيروت- لبنان، الطبعة الأولى، ١٩٩٦م.

١٤- جمهرة اللغة: أبو بكر محمد بن الحسن بن دريد الأزدي، المتوفى (٣٢١هـ)، تحقيق: رمزي منير بعلبكي، دار العلم للملايين، بيروت- لبنان، الطبعة الأولى، ١٩٨٧م.

١٥- الجمهورية المدينة الفاضلة: أفلاتون، ترجمة: عيسى الحسن، الأهلية للنشر والتوزيع، عمان الاردن، الطبعة الأولى، ٢٠٠٩م.

١٦- دلائل النبوة ومعرفة أحوال صاحب الشريعة: أبو بكر البيهقي أحمد بن الحسين بن علي بن موسى، المتوفى (٤٥٨هـ)، دار الكتب العلمية، بيروت- لبنان، الطبعة: الأولى، ١٤٠٥ هـ.

١٧- الدين بحوث ممهدة لدراسة تاريخ الأديان: الدكتور محمد عبدالله دراز، دار ابن الجوزي، القاهرة- مصر، الطبعة الأولى، ٢٠١٣م.

١٨- دين ضد الدين: الدكتور علي شريعتي، ترجمة: حيدر مجيد، دار الأمير للثقافة والعلوم، بيروت- لبنان، الطبعة الثانية، ١٤٢٨هـ- ٢٠٠٧م.

١٩- الدين في التصورات الإسلامية المسيحية: مجموعة من الباحثين، دار المعارف الحكمية، بدون مكان النشر، الطبعة الأولى، ١٤٣١هـ- ٢٠١٠م.

٢٠- الدين في حدود مجرد العقل: إيمانويل كانط، ترجمة: فتحي المسكيني، دار جداول، بيروت- لبنان، الطبعة الأولى، ٢٠١٢م.

٢١- سنن أبي داود: أبو داود سليمان بن الأشعث بن إسحاق بن بشير بن شداد بن عمرو الأزدي السِّجِسْتاني، المتوفى (٢٧٥هـ)، تحقيق: شعَيب الأرناؤوط، و محمد كامل قره بللي، دار الرسالة العالمية، الطبعة الأولى، ١٤٣٠هـ- ٢٠٠٩م.

٢٢- السيرة النبوية: ابن هشام، تحقيق خيري ساعد، دار التوفيقية للتراث، القاهرة- مصر، بدون رقم وسنة الطبعة.

٢٣- سيكولوجية الجماهير: گوستاڤ لوبون، ترجمة وتقديم: هاشم صالح، دار الساقي، بيروت- لبان، الطبعة الأولى، ١٩٩١.

٢٤- شموخ الفلسفة وتهافت الفلاسفة: الدكتور راشد المبارك، دار روافد للنشر والتوزيع، القاهرة- مصر، الطبعة الأولى، ٢٠١٠م.

٢٥- الصحاح تاج اللغة وصحاح العربية: أبو نصر إسماعيل بن حماد الجوهري الفارابي، المتوفى(٣٩٣هـ)، تحقيق: أحمد عبد الغفور عطار، دار العلم للملايين، بيروت- لبنان، الطبعة الرابعة، ١٤٠٧ هـ- ١٩٨٧م.

٢٦- صحيح البخاري المسمى بالجامع المسند الصحيح المختصر من أمور رسول الله وسننه وأيامه: أبو عبدالله محمد بن إسماعيل البخاري الجعفي، المتوفى (٢٥٦هـ)، تحقيق: محمد زهير بن ناصر الناصر، دار طوق النجاة، الطبعة الأولى، ١٤٢٢هـ.

٢٧- صحيح مسلم المسمى بالمسند الصحيح المختصر من السنن بنقل العدل عن العدل إلى رسول الله: الإمام الحافظ أبي الحسين مسلم بن الحجاج القشيري النيسابوري، المتوفى (٢٦١هـ)، تحقيق: أبو قتيبة نظر محمد الفاريابي،دار طيبة، الرياض- المملكة العربية السعودية، الطبعة الأولى، ١٤٢٧هـ-٢٠٠٦م.

٢٨- العلم والدين في الفلسفة المعاصرة: إميل بوترو، ترجمة: الدكتور أحمد فؤاد الأهواني، الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة- مصر، ١٩٧٣م، بدون رقم الطبعة.

٢٩- عون المعبود شرح سنن أبي داود، ومعه حاشية ابن القيم: تهذيب سنن أبي داود وإيضاح علله ومشكلاته: أبو عبد الرحمن شرف الحق محمد أشرف بن أمير بن علي بن حيدر الصديقي العظيم آبادي، المتوفى (١٣٢٩هـ)، دار الكتب العلمية، بيروت- لبنان، الطبعة الثانية، ١٤١٥هـ.

٣٠- فتاوى ومسائل ابن الصلاح ومعه أدب المفتي والمستفتي: تحقيق عبدالمعطي قلعجي، دار المعرفة، بيروت- لبنان، الطبعة الأولى، ١٤٠٦هـ-١٩٨٦م.

٣١- فتح الباري شرح صحيح البخاري: الإمام الحافظ أحمد بن علي بن حجر العسقلاني، المتوفى (٨٥٢هـ)، دار المعرفة، بيروت- لبنان، ١٣٧٩هـ، بدون رقم الطبعة.

٣٢- فتح القدير: محمد بن علي بن محمد بن عبد الله الشوكاني اليمني، المتوفى (١٢٥٠هـ)، ابن كثير، دمشق- سوريا، دار الكلم الطيب، بيروت- لبنان، الطبعة الأولى، دار ١٤١٤هـ.

٣٣- الفصل في الملل والأهواء والنحل: أبو محمد علي بن أحمد بن سعيد بن حزم الأندلسي القرطبي الظاهري، المتوفى (٤٥٦هـ)، تحقيق: الدكتور محمد إبراهيم نصر، و الدكتور عبدالرحمن عميرة، دار الجيل، بيروت-لبنان، الطبعة الثانية، ١٤١٦هـ-١٩٩٦م.

٣٤- فلسفة الدين في الفكر الغربي: الدكتور إحسان علي الحيدري، دار الرافدين، بيروت- لبنان، الطبعة الأولى، ١٤٣٤هـ- ٢٠١٣م.

٣٥- فلسفة الدين: جون هيك، ترجمة: طارق عسيلي، دار المعارف الحكمية، الطبعة الأولى، ١٤٣١هـ-٢٠١٠م.

٣٦- فلسفة الدين: هيجل، ترجمة مجاهد عبدالمنعم مجاهد، دار الكلمة، القاهرة- مصر، الطبعة الأولى، ٢٠٠٢م.

٣٧- الفلسفة القديمة: الدكتور حربي عباس عطيتو، دار المعرفة الجامعية، الأسكندرية- مصر، بدون رقم وسنة الطبعة.

٣٨- الفلسفة أنواعها ومشكلاتها: هنتر ميد، ترجمة: الدكتور فؤاد زكريا، دار نهضة مصر للطبع والنشر، القاهرة- مصر، بالاشتراك مع مؤسسة فرانكلين، نيويورك- أمريكا، الطبعة الثانية، ١٩٧٥م.

٣٩- الفلسفة لمن يريد: الدكتور نبيل عبدالحميد عبدالجبار، مطبعة الحاج هـاشم، أربيل-كوردستان، الطبعة الأولى، ٢٠٠٤م.

٤٠- في دلالة الفلسفة وسؤال النشأة نقد التمركز الأوروبي: الدكتور الطيب بوعزة، مركز نماء للبحوث والدراسات، بيروت- لبنان، الطبعة الأولى، ٢٠١٢م.

٤١– فينومينولوجيا الروح: هيجل، ترجمة: الدكتور ناجي العونلي، الطبعة الأولى، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت– لبنان، ٢٠٠٦م.

٤٢– القاموس المحيط: أبو طاهر مجد الدين محمد بن يعقوب الفيروز آبادي، المتوفى (٨١٧هـ)، تحقيق: مكتب تحقيق التراث في مؤسسة الرسالة بإشراف: محمد نعيم العرقسُوسي، مؤسسة الرسالة، بيروت– لبنان، الطبعة الثامنة، ١٤٢٦هـ– ٢٠٠٥م.

٤٣– قصة الفلسفة: ول ديورانت، المتوفى (١٩٨١م)، ترجمة: الدكتور فتح الله محمد المشعشع، مكتبة المعارف، بيروت–لبنان، الطبعة الأولى، ١٤٢٤هـ–٢٠٠٤م.

٤٤– كتاب الشفاء، المنطق: أبو علي الحسين بن عبدالله بن الحسن بن علي بن سينا، المتوفى (٤٢٨هـ)، تحقيق: الأب قنواتي، و محمود الخضيري، و فؤاد الإهواني، وزارة المعارف العمومية الإدارة العامة للثقافة، المطبعة الأميرية، القاهرة– مصر، ١٣٧١هـ– ١٩٥٢م، بدون رقم الطبعة.

٤٥– الكليات معجم في المصطلحات والفروق اللغوية: أبو البقاء أيوب بن موسى الحسيني الكفوي، المتوفى (١٠٩٤هـ)، تحقيق: عدنان درويش، و محمد المصري، مؤسسة الرسالة، بيروت– لبنان، الطبعة الثانية، ١٤١٩هـ–١٩٩٨م.

٤٦– لسان العرب: ابن منظور محمد بن مكرم بن علي بن أحمد الأنصاري المتوفى(٧١١هـ)، مؤسسة التاريخ العربي، دار إحياء التراث العربي، بيروت– لبنان، الطبعة الثالثة، ١٤١٩هـ– ١٩٩٩م.

٤٧– مبادئ الفلسفة: أ.س.رابوبرت، ترجمة الدكتور أحمد أمين، الطبعة الأولى، دار الكتاب العربي، بيروت– لبنان، بدون سنة الطبعة.

٤٨– مجمل اللغة: أبو الحسين أحمد بن فارس بن زكريا القزويني الرازي، المتوفى(٣٩٥هـ)، دراسة وتحقيق: زهير عبد المحسن سلطان، مؤسسة الرسالة، بيروت– لبنان، الطبعة الثانية، ١٤٠٦هـ–١٩٨٦م.

٤٩– المجموع شرح المهذب: أبو زكريا محيي الدين يحيى بن شرف النووي، المتوفى (٦٧٦هـ)، تحقيق: محمد نجيب المطيعي، مكتبة الإرشاد، الجدة– المملكة العربية السعودية، بدون رقم وسنة الطبعة.

٥٠- محاضرات في تاريخ الفلسفة: هيجل، ترجمة: الدكتور خليل أحمد خليل، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، بيروت- لبنان، الطبعة الأولى، ١٤٠٦هـ-١٩٨٦م.

٥١- المحاور الخمسة للقران الكريم: محمد الغزالي، دار الشروق، ١٤٠٩هـ، بدون رقم الطبع.

٥٢- مدخل إلى الفلسفة: الدكتور محمد محمد قاسم، دار النهضة العربية، بيروت- لبنان، الطبعة الأولى، ١٤٢١هـ-٢٠٠١م.

٥٣- المدخل إلى معاني الفلسفة: الدكتور عرفان عبدالحميد فتاح، دار الجيل بيروت- لبنان، دار عمار، عمان- الأردن، الطبعة الأولى، ١٤٠٩هـ-١٩٨٩م.

٥٤- المستدرك على الصحيحين: أبو عبد الله الحاكم محمد بن عبد الله بن محمد بن حمدويه بن نُعيم النيسابوري، المتوفى (٤٠٥هـ)، تحقيق: مصطفى عبد القادر عطا، دار الكتب العلمية، بيروت- لبنان، الطبعة الأولى، ١٤١١هـ-١٩٩٠م.

٥٥- المستصفى في علم الأصول: أبو حامد محمد بن محمد بن محمد الغزالي الطوسي، المتوفى (٥٠٥هـ)، تحقيق: محمد بن سليمان الأشقر، مؤسسة الرسالة، بيروت- لبنان، الطبعة الأولى، ١٤١٧هـ-١٩٩٧م.

٥٦- مسند الإمام أحمد بن حنبل: أبو عبد الله أحمد بن محمد بن حنبل بن هلال بن أسد الشيباني، المتوفى (٢٤١هـ)، تحقيق: شعيب الأرناؤوط، وعادل مرشد، وآخرون، مؤسسة الرسالة، بيروت- لبنان، الطبعة الأولى، ١٤٢١هـ-٢٠٠١م.

٥٧- مسند الإمام أحمد بن حنبل: أبو عبدالله أحمد بن محمد بن حنبل بن هلال بن أسد الشيباني، المتوفى (٢٤١هـ) ، تحقيق: أحمد محمد شاكر، دار الحديث، القاهرة- مصر، الطبعة الأولى، ١٤١٦هـ- ١٩٩٥م.

٥٨- مشكلة الفلسفة: الدكتور زكريا إبراهيم، دار مصر، الفجالة-مصر، ١٩٧١م، بدون رقم الطبعة.

٥٩- المعاد الجسماني إنسان ما بعد الموت: شفيق جرادي، دار المعارف الحكمية، بيروت- لبنان، الطبعة الأولى، ١٤٣٦هـ-٢٠١٥م.

٦٠- المعجم الفلسفي: الدكتور إبراهيم مدكور، مجمع اللغة العربية، الهيئة العامة لشؤون المطابع الأميرية، القاهرة-مصر، ١٤٠٣هـ- ١٩٨٣م. بدون رقم الطبعة.

٦١- المعجم الفلسفي: الدكتور جميل صليبيا، الشركة العالمية للكتاب، بيروت- لبنان، ١٤١٤هـ- ١٩٩٤م، بدون رقم الطبعة.

٦٢- المعجم الفلسفي: الدكتور مصطفى حسيبة، دار أسامة، عمان- الأردن، الطبعة الأولى، ٢٠٠٩م.

٦٣- المعجم الفلسفي: مراد وهبة، دار قباء الحديثة، القاهرة- مصر، الطبعة الخامسة، ٢٠٠٧م.

٦٤- المعجم الوسيط: مجمع اللغة العربية بالقاهرة، إبراهيم مصطفى، و أحمد الزيات، و حامد عبد القادر، و محمد النجار، دار الدعوة، الإسكندرية- مصر، بدون رقم وسنة الطبع.

٦٥- مقاصد الفلاسفة: أبو حامد محمد بن محمد بن محمد الغزالي الطوسي، المتوفى (٥٠٥هـ) ، تحقيق: محمود بيجو، مطبعة الصباح، دمشق- سوريا، الطبعة الأولى، ١٤٢٠هـ- ٢٠٠٠م.

٦٦-منبعا الأخلاق والدين: هنري برغسون، ترجمة الدكتور سامي الدروبي، و الدكتور عبدالله عبدالدائم، الهيئة المصرية العامة للتأليف والنشر، القاهرة-مصر، ١٩٧١م، بدون رقم الطبعة.

٦٧-المنقذ من الضلال: أبو حامد محمد بن محمد بن محمد الغزالي الطوسي، المتوفى (٥٠٥)هـ، تحقيق: محمد بيجو، مراجعة: الدكتور سعيد رمضان البوطي، و الشيخ عبدالقادر الأرناؤوط، دار التقوى، دمشق- سوريا، دار الفتح، عمان- الأردن، الطبعة الثانية، ١٩٩٢م.

٦٨-موسوعة كشاف اصطلاحات الفنون والعلوم: محمد بن علي التهانوي، تحقيق: الدكتور علي دحروج، نقل النص الفارسي إلى العربية: الدكتور عبدالله الخالدي، الترجمة الأجنبية: الدكتور جورج زيناني، مكتبة لبنان ناشرون، بيروت- لبنان، الطبعة الأولى، ١٩٩٦م.

٦٩- موسوعة لا لاند الفلسفية: أندريه لا لاند، ترجمة: الدكتور خليل أحمد خليل، منشورات عويدات، بيروت- لبنان، الطبعة الثانية، ٢٠٠١م.

٧٠- نشأة الدين النظريات التطورية والمؤلهة: الدكتور علي سامي النشار، مركز الإنماء الحضاري، حلب-سوريا، دار المحبة، دمشق-سوريا، ١٤٢٩هـ- ٢٠٠٩م، بدون رقم الطبعة.

٧١- نقد العقل المحض: إيمانويل كانط، ترجمة: موسى وهبة، مركز الإنماء القومي، بيروت- لبنان، بدون رقم وسنة الطبعة.

٧٢- وعاظ السلاطين: الدكتور علي وردي، دار ومكتبة دجلة والفرات، بيروت-لبنان، الطبعة الثانية، ١٤٣١هـ، ٢٠١٠م.

73- How To Sell Yourself: Arch lustberg، Book mart press، U.S.A، 2002.

٧٤- آداب البحث والمناظرة: محمد الأمين بن مختار الشنقيطي، المتوفى (١٢٩٣هـ)، تحقيق: سعود بن عبدالعزيز العريفي، دار عالم الفوائد للنشر والتوزيع، مكة المكرمة- المملكة العربية السعودية، الطبعة الأولى، ١٤٢٦هـ.

٧٥- أعلام الفلاسفة كيف نفهم: الدكتور هنري توماس، ترجمة: متري أمين، مراجعة وتقديم: الدكتور زكي نجيب محمود، دار النهضة العربية، القاهرة- مصر، ١٩٦٤م، بدون رقم الطبعة.

٧٦-الأعلام: خير الدين بن محمود بن محمد بن علي بن فارس الزركلي الدمشقي، المتوفى (١٣٩٦هـ) ، دار العلم للملايين مؤسسة ثقافية للترجمة والتأليف والنشر، بيروت- لبنان، الطبعة الخامسة عشر، ٢٠٠٢م.

٧٧-سير أعلام النبلاء: شمس الدين محمد بن أحمد بن عثمان الذهبي، المتوفى (٧٤٨)هـ، أشرف على تحقيقه وتخريج أحاديثه: شعيب الأرناؤوط، مؤسسة الرسالة، بيروت-لبنان، الطبعة الثالثة، ١٤٠٥هـ- ١٩٨٥م.

٧٨-شعب الإيمان: أبو بكر أحمد بن الحسين بن علي بن موسى الخراساني البيهقي، المتوفى (٤٥٨)هـ، تحقيق وتخريج: الدكتور عبد العلي عبد الحميد حامد، مكتبة الرشد للنشر والتوزيع بالرياض بالتعاون مع الدار السلفية ببومباي بالهند، الطبعة: الأولى، ١٤٢٣هـ- ٢٠٠٣م.

٧٩- طبقات الشافعية الكبرى: تاج الدين عبد الوهاب بن تقي الدين السبكي، المتوفى (٧٧١)هـ، تحقيق: الدكتور محمود محمد الطناحي، والدكتور عبد الفتاح محمد الحلو، دار هجر، الطبعة الثانية، ١٤١٣هـ، بدون مكان النشر.

٨٠- مشاهير الفلاسفة من طاليس إلى ديكارت: ديوجين لايرتيوس، ترجمة: عبدالله حسين، الدار العالمية للكتب والنشر، الجيزة- مصر، دار طيبة، الجيزة- مصر، الطبعة الأولى، ٢٠١١م.

٨١- معجم أعلام المورد تراجم لأشهر الأعلام العرب والأجانب القدامى والمحدثين، مسقاة من موسوعة المورد: منير البعلبكي، دار العلم للملايين، بيروت- لبنان، الطبعة الأولى، ١٩٩٢م.

٨٢- معجم الأدباء من العصر الجاهلي حتى سنة (٢٠٠٢): كامل سلمان الجبوري، دار الكتب العلمية، بيروت- لبنان، الطبعة الأولى، ١٤٢٤هـ- ٢٠٠٣م.

٨٣- معجم الفلاسفة: جورج طرابيشي، دار الطليعة، بيروت- لبنان، الطبعة الثالثة، ٢٠٠٦م.

٨٤- هكذا تكلم علي شريعتي: فاضل رسول، دار الكلمة، بيروت- لبنان، الطبعة الثالثة، ١٩٨٧م.

٨٥- الموقع الإلكتروني: ويكيبيديا الموسوعة الحرة: Wikipedia.org.